


# ١٠٠ ساڵ لەگەڵ عەلی وەردی


محەمەد عیسا خاقانی

و: فەیسەڵ خەلیل

# 100 ساڵ لەگەڵ عەلی وەردی

نووسین
محەمەد عیسا خاقانی

وەرگێڕانی
فەیسەڵ خەلیل

# 100 ساڵ لەگەڵ عەلی وەردی

نووسین: محەمەد عیسا خاقانی
وەرگێڕانی: فەیسەڵ خەلیل
بابەت : بیرەوەری
هەڵەچن : سەروەر جەبار
دیزاین :خلیل هیدایەت مام شێخ
نرخ : (٨٠٠٠) دینار
تیراژ : (١٠٠٠) دانه

زنجیرەی کتێب :
ژمارە (٤) لەبڵاوکراوەکانی دەزگای مەحمود زامدار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/
هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (٣٢٦) ی ساڵی (٢٠١٧) ی پێدراوە

## گرنگی ئەم کتێبە:

ئـەوەی جێگـای داخـە، زانـای کۆمەڵناسـی عێراقـی عـەلی وەردی نـەیتوانیوە ژیـانی خـۆی بنووسـێتەوە! کـە لێـرەدا نیشانەی سەرسوڕمانمان دانا، بـۆ ئـەو مەبەسـتە بـوو، وەك لەم کتێبە باس دەکرێـت، وەردی چـەندین جـار لـە ژیانیـدا باسـی ئـەوەی کـردووە، کـە یاداشـتەکانی خـۆی بـەناوی (سـینەمای بەغـدا) نووسـیوەتەوە و دوای مردنـی بڵاودەبێتەوە، بەڵام هەتا ئێستا کە بیست ساڵ زیاتر بەسەر مردنی ئەو تێپەڕیوە، هیچ شوێنەوارێکی ئەم ناونیشانە دیار نییە. ئەمە بابەتێکە خوێنەر لە دووتوێی ئەم کتێبە هەندێك شت لەسەر ئەم بابەتە دەخوێنێتەوە. ئـەوەی مەبەستمانە ئەوەیـە کاتێـك یاداشـتەکانی وەردی لەبەردەسـتدا نییـە کۆمەڵێك نووسەر لـە هاوڕێیـانی و لـە کەسـانی دیکـە ژیـانی وەردییـان نووسـیوەتەوە. بۆیـە لـە کتێبخانـەی عێراقـی و عەرەبی گەلێك ناونیشانی لـەم جـۆرە دەدۆزرێتـەوە، بـەڵام ئـەوەی ئـەم کتێبـە (سـەد سـاڵ لەگـەڵ عـەلی وەردی) لـە کتێبـەکانی دیکـە جیـا دەکاتـەوە، ئەوەیـە نووسـەری ئـەم کتێبـە (مامۆسـتا محەمـەد عیسـای خاقـانی) نزیکـەی دە

ســاڵێك هەمیشــە لەگــەڵ وەردی بــووە. لــە كۆڕەكــانی مەجلیسی خاقانی سەرپەرشتی كۆڕەكانی كردووە، ئەمە ئەو مەجلیسەیە لە كۆتایی هەشتاكان لەسەر پێشنیاری وەردی دانــراوە، نووســەری ئــەم كتێبــە سەرپەرشــتی مەجلیسەكەی كردووە. جیا لەمەش لە كۆڕەكانی دەرەوەی مەجلیسی خاقــانیش هــەر نووســەری ئــەم كتێبــە یــاوەری وەردی بووە، تەنانەت لە حاڵەتە كۆمەلایەتی و سیاسی و زۆربەی وردەكاریی ژیانی ڕۆژانەی وەردی نووسەر ئاگادار بووە. ئەمەش وا دەكات هەر زانیارییەك لەم كتێبە هاتبێت سەنگی خۆی لە ڕاستگۆیی هەبێت. چەندین سەرچاوەی دیكەش باسیان لەوە كردووە، كە محەمەد عیسا خاقانی یەكێك بووە لە موریدەكانی وەردی!

بــەلام موریــدبوونی نووســەری ئــەم كتێبــە بــۆ وەردی كاریگــەری بەســەر نــاوەڕۆكی ئــەم كتێبــەدا نــەبووە، بۆیــە خوێنەر تێبینی دەكات، نووسەر بە بێلایەنانە باس لە ژیانی وەردی دەكات و ئەوەش ناشارێتەوە، كە لەگەڵ سەرجەم بیروڕاكانی وەردی نەبووە، بەلام بۆ مێژوو هەموو هەڵوێست و بۆچوونەكانی وەردی دەخاتەڕوو.

ئەم كتێبە لە چوار بەشی سەرەكی پێكهاتووە. لە بەشی یەكەمــدا پۆرتــرێتی وەردی دەكێشــن، بــاس لــە هــەموو

زانیارییەك دەكات لەبارەی لەدایكبوونی وەردی و ژیانی كۆمەڵایەتی و خوێندن و ژنهێنانی وەردی و ژیانی مامۆستایەتی، هەر زانیارییەكی دیكە كە پەیوەندی بە ژیانی ئەو كەسایەتییەوە هەبێت. لە بەشی دووەم باس لەو دە ساڵە دەكات كە وەردی تێدا ناسیوە، هەر لە كۆتایی هەشتاكان تا مردنی وەردی و تەنانەت ناشتنی تەرمەكەی، بۆیە نووسەر ناونیشانی (وەردی وەك ئەوەی ناسیومە) بۆ بەشەكە دادەنێت. بەشی سێیەم باس لە هزری وەردی دەكات، هزری وەردی چۆن دروست بووە، بەر لە خوێندنی كۆمەڵناسی بە كێ كاریگەر بووە، دواتر كە كۆمەڵناسی دەخوێنێ بە كامە زانای كۆمەڵناسی كاریگەر دەبێت، هەروەها نووسەر هەوڵی ناساندنی سەرجەم كتێبەكانی وەردی دەدات، جیا لەمەش باس لە هەموو ئەو زانایانە دەكات كە لە ڕێبازی توێژینەوەدا وەردی پشتی پێ بەستوون.

بەشی چوارەم ناونیشانەكەی وەردی و سیاسەتە. باس لە بۆچوونی وەردی دەكات لەسەر فەرمانڕەواكانی عێراق، دواتر باس لە هەڵوێستی سەدام دەكات لەبارەی وەردییەوە. دیارە وەردی تووشی چەندین ڕووداو دێت بەهۆی هەڵوێستە سیاسییەكانیەوە، جا نووسەر چەندین نهێنی ئاشكرا دەكات كە خۆی و كەسانی دیكە شاهێدحاڵی

ڕووداوەکان بوون، ناوی کەسەکانیش دەهێنێ.

لەنێو خوێنەرانی کورد، تا ئێستاش کتێبەکانی وەردی پڕ خوێنەرن، هەر ئەمەش هۆکارێک بووە بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە کە نووسەرەکەشی ڕەزامەندی وەرگێڕانەکەی داوە و پێشەکیشی بۆ نووسیوە.

**وەرگێڕ**

٢٠١٧/٦/١٣

**پێشەکیی نووسەر بۆ کتێبی " سەد ساڵ لەگەڵ وەردی" چاپی کوردی**

بۆ ئەو کەوانەیە....
کە بە چاوی خۆر دەچێ...
ئەگەر بە هەزاران شەو بشکێ...
سەرلەنوێ دەدرەوشێتەوە...
بەر لەوەی کاروانەکەی بگۆڕێن ...
دووبارە ڕاست دەبێتەوە....
هەرچەندە بیخەنە سەر زەوی و هەوڵ بدەن لە باڵاکەی کورت بکەنەوە...
تەنانەت ئەگەر زەویشی پێ بسڕنەوە...
دووبارە هەڵدەستێتەوە..
دووبارە تیرە پەرۆشەکەی بە دەست دەگرێتەوە...
بۆئەوەی جارێکی دیکە بگەڕێتەوە باوەشی ئاسمان..

## پێشکەشە بە خوشک و برایانی کورد

شانازی بەوە دەکەم ئەم کتێبەم دەخرێتە سەر زمانی کوردی و دەکەوێتە دەستی ئەو گەلە دێرینەی کە شوێنەواری قووڵی خۆی لە مێژووی شارستانیەتدا هەیە. کە لە ڕۆژئاوای ئاسیا بەدرێژایی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس و تۆرۆس بەرەو قوڵایی میزۆپۆتامیا درێژدەبنەوە. ئەو نەتەوەیەی هەر لە سەردەمی ئەفسانەکانەوە خاوەن کولتوور و ئەدەبی خۆیەتی تا سەردەمی نووسینەوەیان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەم.

مەجلیسی ڕۆشنبیریی خاقانی کە من سەرپەرشتی کارگێڕییەکەم

دەکرد هەر لە ساڵی ١٩٨٩ تا کۆتایی ٢٠٠٤، ناوەندێکی ڕۆشنبیریی بوو. ڕۆشنبیران لە سەرتاسەری عێراق ڕوویان تێدەکرد. ئەدیبانی کورد ڕۆڵێکی تایبەتیان لە مەجلیسەکە هەبوو. مەجلیسەکە بەدرێژایی ساڵەکانی تەمەنی خۆی ڕێزی لە گەورە ئەدیبانی کورد ناوە. بۆ من شەرەفێك بوو کە لەسەر دەستی پرۆفیسۆر دکتۆر ئەمین موتابچی خوێندنی زانکۆم تەواو کردووە خودا تەمەنی درێژ بکات کە سەرۆکی بەشی فارسی کۆلیژی زمان بوو لە زانکۆی بەغدا. هەروەها شانازی بەوە دەکەم سەرۆکی تاوتوێکردنی نامەی ماستەرەکەم دکتۆرە نەسرین محەمەد فەخری بوو. کە ئەم دوو بەڕێزە کورد بوون.

من ئەمڕۆ دڵخۆشم کتێبەکەم، بە زمانە شیرینەکەیان بکەوێتە دەست برایانی کوردی خۆشەویست. بۆئەوەی وێنەیەکی بچووکیان لەبارەی کەسایەتییێکی مەزنی زانستی پێشکەش بکەم، کە پسپۆڕیی لە کۆمەڵناسی هەبوو، ئەویش دکتۆر عەلی وەردییە. کە لە میانەی گەشتێکی بەچێژ بە سەربووردەی ژیانی ئەو، بۆچوونە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو دەزانین و ئەو بۆچوونانەی لەسەر ئاستی هزری لە عێراق و دەرەوەدا لە شێوەی بوومەلەرزەیەك بوو.

هیوام وایە بەدڵتان بێت. هەروەها هیواخوازم ئەمە یەکەم کارم نەبێت کە بکرێتە سەر ئەو زمانەی کە لە دڵ خۆشەویستە. ئەم کارەم پێشکەش دەکەم بە هاوڕێیە کوردەکانم کە ناتوانم لەبەر زۆری ناویان بژمێرم.

بۆ ئێوە و ئەوان خۆشەویستییەکی ڕاستگۆیانەم هەیە.

**محەمەد عیسا خاقانی**

٢٠١٧/٦/٩

## بەشی یەکەم

### پۆرتەرێتی عەلی وەردی

پێم وایە زۆر بە سادە و سانایی پۆرتەرێتێك لەبارەی وەردی دەکێشم. ئەو هێلکارییەی وێنەی وەردی بە چیرۆکە بەناوبانگەکەی دەست پێدەکات کە سەد ساڵ بەر لەدایکبوونی ڕووی داوە، بە ناونیشانی (ئەگەر دزەکە نەدەمرد). دواتر دەچمە سەر ناوە تەواوەکەی، چونکە بینیومە هەندێك لە سەرچاوەکان ناوەکەی بە هەڵە دەهێنن لەگەڵ چەندین کەسایەتیی بەناوبانگ لە بنەماڵەی وەردی، وەك خوالێخۆشبوو عەلی حوسێن وەردی کەسایەتیی سیاسی کە سەر بە حزبی شیوعی عێراقی بوو، یان لەگەڵ شاعیری گەورە، خوالێخۆشبوو عەلی جەلیل وەردی، ناوی دەهێنن کە ئەوەیان خاوەنی دیوانی (شۆڕشی سوور) ە. دوای ئەم ڕاستکردنەوە، ڕەچەڵەکە هاشمییە ڕەسەنەکەی دەستنیشان دەکەم، لەگەڵ جێگیرکردنی ڕۆژی لەدایکبوونی، بە مانگ وساڵیشەوە، بە کۆچی و زایینییەوە. هەر لەو کاتەی منداڵێکی بچووك بووە، لە کۆڵانەکانی کازمیە لەگەڵی دەڕۆم، کە کڵاوی بەسەرەوە بووە، تا دەچێتە قوتابخانە، لەگەڵ باسکردنی کاریگەری ئەو ژینگەیەی تێیدا ژیاوە، دواتر شوێنەواری لەسەر پێکهاتەی هزری ئەو هەبووە، بە شێوەیەك وای دادەنێم، ئەم ژینگەیە وایکردووە وەردی لە کۆمەڵناسی بەتوانا بێت. دواتر دێمە سەر قۆناغی منداڵی و گەنجێتی و قۆناغی خوێندن، چۆن ئەو زانایە بە کۆششی تایبەت، خۆی دروستکردووە. تا ئەو کاتەی دەبێتە مامۆستایەکی گوێزراوە لە شەتڕەو دواتریش لە بەغدا، دواجار چۆن بە

چارەنووسی خۆی دەگات لە کۆمەڵناسی و چۆنیش نارەزایی لە بەرامبەر ئەم زانستە دەردەبڕێ!.

لە قۆناغی خوێندنی بەکالۆریۆس لە بەیرووت بەدوای دەڕۆم، چۆن سەفەر دەکات، بە دیداری کێ دەگات، چۆن بەیرووت دەبینی کاتێك بەرەنگاری داگیرکەری فەرەنسی دەبێتەوە. لە زانکۆی ئەمریکی لە بەیرووت هاوپۆلی کێ دەبێت. لەگەڵ گەڕانەوەی بۆ عێراق، سەپاندنی هاوسەرگیری لەلایەن باوکییەوە، دواتر ناردنی بۆ خوێندن لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا. خوێندنی ماستەر و دکتۆراکەی لە زانکۆی تۆستن لە تێکساسی ئەمریکی، مامۆستاکانی کێ بوون، لەوێ چۆن پشووی هاوینی بەسەربردووە و لەکوێ؟ ... کۆپییەکی بڕوانامە زانکۆییەکەم داناوە، بە هەموو وردەکارییەکانیەوە: مێژووەکەی، بابەتەکەی، ئەو مامۆستایانەی گفتۆگۆیان کردووە. دواجاریش گەڕانەوەی بۆ عێراق، چۆن بەشی کۆمەڵناسی لەنێو کۆلیژی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا داناوە، ڕاپۆرتەکەی پێشکەش بە کێ کردووە، ئەو بیرۆکەیە چی بووە کە لە دووتوێی ڕاپۆرتەکەی بوو. ئەو پلە زانستییانەی بەدەستی هێناوە، لەگەڵ هەموو ئەو پۆستانەی لە بەشەکە و کۆلیژەکە وەری گرتووە، دواتریش خانەنشینبوون و وەرگرتنی ناونیشانی (پرۆفیسۆری فەخری). دواتریش وەرگرتنەوەی ئەم نازناوە، بە دانیشتنی وەردیش لە ماڵەوە، نایابترین قۆناغی خوێندن لە زانکۆکانی عێراق کۆتایی دێت!!

بەڵام وەردی نەوەستا، بەڵکو دوای خانەنشینی لەسەر چالاکییە زانستییەکانی بەردەوام بوو، بووە مامۆستایەکی میوان لە زانکۆی وارشۆ لە پۆڵەندا، لە چەندین کۆنگرەی جیهانی بەشدار بوو، تا ئەو

کاتەی دەسەڵاتی عێراقی ڕێگری لە سەفەری ئەو کرد. ئەم کاتەش لە ماڵەوە دانەنیشت بەڵکو مەجلیسە ئەدەبییەکانی بەغدای کردە شوێنێك بۆ بڵاوکردنەوەی هزری خۆی، تا ئەو کاتەی خودا ویستی لەسەر بوو، من بە دیداری گەیشتم، دیداری قوتابی بە مامۆستا، لەسەر دەستی ئەو فێر بووم. پێشنیاری دامەزراندنی مەجلیسی خاقانی کرد، ڕاوێژکردن بە عەلامە مەحفووز ئەرك بوو، هەروەها ڕەزامەندی شێخ عیسای خاقانیی باوك پێویست بوو بۆ دانانی کۆڕبەندێك لەم قۆناغە هەستیارەی مێژووی عێراقدا. دواجار ڕەزامەندی درا و مەجلیسی ڕۆشنبیریی خاقانی لە کازمیەی بەغدا دانرا، عەلی وەردیش یەکێك بوو لە کۆڵەگەی مەجلیسەکە و بەردەوام موحازەرەی تێدا دەدا. تا ئەو کاتەی، دوا نەخۆشی تووش بوو لە ماڵەکەی خۆی دانیشت. بەڵام من هێشتا پەیوەندییم لەگەڵی هەبوو لە هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی لە ئەردەن، ئەمەش لەسەر حسێبی شا حوسێن کوڕی تەلاڵ بوو کە نامەیەکم بۆ بەڕێزیان نووسی بوو، دواتر کاتێك وەڵام درایەوە شێرپەنجەی زراو هەموو جەستەی وەردی تەنیبۆوە. بۆ چارەسەری سەردانی ئەردەنی کرد، بەشەکەتی و ماندوویی گەڕایەوە. بەڕێز موئەیەد عەبدولقادر لەبری یەکێتیی نووسەران کۆڕێکی ڕێزلێنانی بۆ عەلی وەردی ئەنجام دا، کەچی خۆی ئامادە نەبوو، لەبری ئەو دکتۆر حەسانی کوڕە گەورەکەی ئامادە بوو. من یەکێك بووم لەو کەسانەی لە ڕێزلێنانەکە قسەم کرد. دواتر پێشنیاریان کرد لە ماڵەکەی سەردانی وەردی بکەین. لە پێشوازیدا بەڕێز بوو، زەردەخەنەی ماڵئاوایی بە ڕووخسارییەوە دیار بوو. بە دەنگێکی بەرز پێم گوت" دکتۆر، لەگەڵ برایان لە یەکێتیی

نووسەرانی عێراق، کۆڕێکی ڕێزلێنانمان بۆ تۆ هەبوو، ڕێزلێنانی یەکێتییان بۆ تۆ هێناوە". بە دەنگێکی نزم وتی:

**أنت و حياض الموت بيني و بينها.... و جادت بوصل حيث لا ينفع الوصل**

"واتە: کاتێك دێت خوێنی مردن لەنێوانمان دایە.. بۆ بەیەکگەیشتن نزیك دەبێتەوە، کە بەیەکگەیشتن سوودی نەماوە".

دکتۆر عەلی وەردی لە ڕۆژی ١٣ی تەمموزی ساڵی ١٩٩٥ی زایینی کۆچی دوایی کرد. هەوڵمان دا مردنی ئەو بکەین بە خۆپیشاندانێکی جەماوەریی گەورە، لە گۆڕستانی قورەیش نێژرا. مەجلیسی خاقانی ساڵیادێکی زانستی بۆ ئەنجام دا، کە چەندین زانا قسەیان تێدا کرد، باسیان لە هەموو ئەو لایەنە زانستییانە کرد کە وەردی لە ژیانی خۆیان لێی نزیك بۆتەوە، ئەمە پۆرتەرێتی وەردییە تکام وایە جێگەی ڕەزامەندی خوێنەران بێت:

## ئەگەر دزەکە نەدەمرد

دکتۆر عەلی وەردی (قەدەری) بوو، واتە بڕوای بەوە هەبوو ڕێکەوت ئاڕاستەی ژیانی بگۆڕێت. دەشیگوت ژیانی ئەو لەگەڵ ڕێکەوت دروستی ئەو باوەڕەی سەلماندووە، بە شێوەیەك قەدەر وێنەی ژیانی وەردی کێشاوە، خۆی پێشبینیی نەکردووە، پلانی بۆ دانەڕشتووە، تەنانەت لە چوارچێوەی گشتی ئەو ژیانە نەبووە، کە تێیدا ژیاوە. وەردی چیرۆکێکی بۆ لەدایکبوونە قەدەرییەکەی خۆی هەیە، کە بۆ سەد ساڵ بەر لەدایکبوونی ئەو دەگەڕێتەوە، وەك هەمیشە دووبارەی دەکردەوە ئەم چیرۆکە هۆکارێك بووە، بۆ لەدایکبوونی ئەو، پوختەی چیرۆکەکەش ئەمەی خوارەوەیە:

لە سەردەمی عوسمانییەکان، تاعوونێك لە بەغدا بڵاو دەبێتەوە، بەدیارکراوی لە ساڵی ١٨٣١ بووە. ئەو کاتە بووە کە سەید هاشم ئەبو وەرد، کە دەکاتە باپیرە هەرە گەورەی عەلی وەردی (لە باوکییەوە) ژیاوە. تاعوون قڕان دەخاتە شارەکەوە و دواجار دەگاتە کازمیە، کە بنەماڵەی وەردی تێیدا نیشتەجێین. خەڵك بەپێی ئاکار و پەروەردەکەی کاردانەوەیان لەگەڵ ئەم ڕووداوە هەبووە. زۆرینەی خەڵك شان بەشانی یەك وەستابوون بۆ هەڵگرتنەوەی لاشەی مردووان و شووشتن و کفنکردن و ناشتنیان، لەگەڵ پاراستنی ئەو کەسانەی بە زیندوویی ماونەتەوە و لە ژیانی پڕ سەختیدا هاوکاریی یەکتریان کردووە. لە لایەکی دیکەوە کەسانی نەفسنزم، هەلی پەتای مردنیان بۆ خێرا دەوڵەمەندبوون قۆستۆتەوە. دزەکانیش دەکەونە جموجۆڵەوە، هێندەی دەستیان پێڕا دەگات، ماڵە نەگبەتەکان دەدزن، بازرگانیی کفن فرۆشتنیش برەوی دەبێت.

دکتۆر عەلی وەردی دەیگێڕێتەوە: باپیرەی گەورە (هاشم ئەبو وەرد) ئەو کاتە خەونێکی ڕوون و ئاشکرا دەبینێ، خەونەکە زیاتر بە پێشبینی دەچێ. لە خەوەکەیدا یەکێك لە شێوەی فریشتەی گیانکێشان ( عزرایل) لەو گەڕەکە دەخولێتەوە کە ئەو تێیدا نیشتەجێ بوو، ژمارە لەسەر ماڵەکان تۆمار دەکات. هاشم دیقەت لەو ژمارانە دەدات، دەبینێ عزرایلەکە ژمارە دەی لە سەر یەکێك لە خزمەکانی نووسیوە کە دەکەوێتە سەری کۆڵانەکە، دواتر ژمارە هەشت لەسەر دراوسێیەکیان تۆمار دەکات و ژمارە سێزدەش لەسەر ماڵەکەی ئەوان.... لە خەو بێدار دەبێتەوە!

لەگەڵ بانگی بەرەبەیان دەنگی زریکە و گریان لەو ماڵەی خزمیان

بەرز دەبێتەوە کە لە سەری گەڕەکە، هاشم ئەبو وەرد ناوی خوا دەهێنێ و جلی دەپۆشێ لەگەڵ خەڵکی گەڕەك بە ئاڕاستەی دەنگەکە دەڕوات. لەوەتەی تاعوون ڕووی تێکردوون لەمە ڕاهاتووە، لەگەڵ کەسانی بەتوانای گەڕەك دەچێت ئەرکی شووشتن و کفنکردن و ناشتنی مردووەکان لە ئەستۆ دەگرێت. گەیشتە سەری گەڕەك، سەرەخۆشیی خەڵکەکەی قبوڵ کرد و بە دەنگێکی ئاشکرا گوێی لە دەمەتەقێی هەندێکیان بوو دەیانگوت: بەستەزمانانە هەر دەیان مردوون! مەبەست ئەوە بوو ماڵەکە (دە) کەس بوون هەموویان مردوون. هاشم ئەبو وەرد و خەڵکی گەڕەك بە ئەرکی خۆیان هەڵدەستن و دواتر دەگەڕێنەوە ماڵەکانیان چاوەڕێی هەواڵێکی دیکە و ڕۆژێکی دیکە دەکەن. بەڵام هاشم ئەم شەوە بە سەرسامی دەگەڕێتەوە چونکە ژمارەی مردووەکان لەگەڵ ئەو ژمارەیە یەك دەگرێتەوە کە عزرایل لە خەونەکەدا لەسەر ماڵەکەی نووسیوە. ئەوەشی بیرهاتەوە کە ژمارەی ماڵەکەی ئەوان لە خەونەکەدا سێزدە بووە، بۆیە ژمارەی ئەندامانی خێزانەکەی دەژمێرێت، بۆ ئەوەی بە ژمارەی خەونەکەی بەراورد بکات، دەلەرزێ و لیکی دەمی بە تاڵی قووت دەداتەوە، کاتێك دەبینێ ژمارەکان وەك یەکن. ئەزموونێکی زیندووشی لەلایە، کەمێك پێشتر بینی (دە) کەس لە خزمەکانی مردن. جا سەرەڕای ترس و نیگەرانییەکەی ناوی خودا دەهێنێ و شەیتان بەنەفرەت دەکات و لە ژیانی ئاسایی خۆی بەردەوام دەبێت.

دوای دوو ڕۆژ جارێکی دیکە گەڕەکەکە لەگەڵ زریکە و فیغان بێدار دەبنەوە، بەڵام ئەمجارەیان دەنگەکە لە ماڵ و منداڵەکەی خۆی بوو. بەرەو دەنگەکە ڕادەکات و هاوار دەکات چی بووە؟ پێی دەڵێن

تاعوون لە ماڵەکەی دراوسێیانی داوە، هەموویان مردوون. ماوەیەکی دووروودرێژ هاشم ئەبو وەرد دۆش دادەمێنێ و دواتر ناوی خودا دەهێنێ و شەیتان بەنەفرەت دەکات و پێیەکانی ئەو بەرەو خەڵکی گەڕەك دەبات، بۆئەوەی ئەم هەواڵە دڵتەزێنەیان پێ ڕابگەیێنێ. خەڵکی گەڕەك هەموویان دەچنە ماڵی دراوسێیەکەیان بۆ ئەوەی ئەرکی پێویست ئەنجام بدەن. ئەو کاتە خەمی هاشم ئەبو وەرد هەژمارکردنی مردووەکان دەبێت، چەند جارێك هەژمارکردنەکە دووبارە دەکاتەوە بۆ ئەوەی دڵنیا بێتەوە کە ژمارەی مردووەکان هەشت کەس بووە، ئەمەش ئەو ژمارەیەیە کە عزرایل بەر لە چەند ڕۆژێك لە خەونەکەی هاشم ئەبو وەرد لەسەر ماڵەکەی نووسیوە!

هاشم دوای ناشتنی تەرمی دراوسێیەکانی لە گۆڕستان دەگەڕێتەوە و موکڕ دەبێت ئەو خەونە بۆ خێزانەکەی بگێڕێتەوە کە بینیویەتی. لە کاتی گەڕانەوە خێزانەکە بەدەوری گەورە و بەخێوکەرەکەیان کۆدەبنەوە، هاشم ئەبو وەردیش ئەم کۆبوونەوە خێزانییە بە منداڵ و زاواکانییەوە دەقۆزێتەوە بۆ ئەوەی جڵەوی زمانی شل بکات و لغاوی نیگەرانییەکەی بکاتەوە، خەونەکەیان پێڕادەگەیێنێ، لە ژمارەکانیش ئاگاداریان دەکاتەوە، کە چۆن ئەوەی لە واقیع بینیویەتی لەگەڵ ژمارەی خزمەکەیان و دراوسێیەکەیان یەکی گرتۆتەوە. هەموو ئەو ڕووداوانە و ئەوەی ئەندامانی خێزانەکە هەستی پێ دەکات بەتایبەتی دوای مردنی دراوسێیەکەیان، بەڵگەن بۆ ڕووداوە پێشبینی کراوەکە. ئەندامانی خێزانەکە هەواڵەکە بە دڵتەنگی وەردەگرن و لەگەڵ ئەوەش لاریان لەسەر ویستی خودا نییە. لێرەدا هاشم پێشنیار بۆ ئەندامانی خێزانەکەی دەکات، کە بەر لەوەی بخەون، هەموویان خۆیان بشۆن و

کفن بپۆشن، بۆئەوەی لە کاتی مردن خەڵك بە شووشتن و کفنکردنەوە ئەزیەت نەدەن. تەنها ناشتنەکە دەمێنێتەوە، هەموو ئەندامەکان بە پێشنیارەکە ڕازی دەبن و لە شەوی داهاتوودا بڕیارەکە جێبەجێ دەکەن.

بەیانی هاشم ئەبو وەرد دەچێتە بازاڕ، کفنەکان دەکڕێ و بەپێی هەر تاکێك ئامادەیان دەکات، دواتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ماڵەکەی ئامادە بکات، ئەوەی هەیەتی بەسەر کەسە نزیکەکان و خزم و هەندێك هاوڕێیانی دابەش بکات. ئێوارە هەموو ئەندامانی خێزانەکە خۆیان دەشۆن و کفنەکان دەپۆشن چاوەڕێی فریشتەی مەرگ دەبن کە زۆر دواناکەوێ.... هاشم کاتێك لەناو کفنەکەی خۆی دەبێت، گوێی لە ناڵەی ئەندامانی خێزانەکەی دەبێت، کە یەك لەدوای یەك ژیان جێدەهێڵن، تا بانگی بەرەبەیان دەدات چاوەڕوانی نۆرەی خۆی دەبێت و مردووەکانی دەژمێرێ. ژمارەکە دەگات بە دوانزە، ئەو بە زێدە متمانە و باوەڕێکی تەواوە چاوەڕوانی نۆرەی خۆی دەبێت بۆ ڕۆیشتن بەرەو دونیایەکی دیکە، خەو دەیباتەوە.

لە پڕێکا هاشم ئەبو وەرد هەست دەکات قورساییەك دەکەوێتە نێوان سك و سنگییەوە بەهێزەوە پاڵەپەستۆی دەخاتە سەر و بەرەو شانی نزیك دەبێتەوە. ئەوکاتە درك بەوە دەکات کە هیچ گومانی تێدا نییە کاتی مردنی هاتووە، بۆیە شەهادەت دەخوێنێ و خۆی بۆ مردن ئامادە دەکات. بەڵام فریشتەی مەرگ وای پێ باشترە سیمای هاشم ببینێ بەر لەوەی گیانی بکێشێ، بۆیە بەلای ڕووخساری هاشم، کفنەکە دەکاتەوە، ئەمەش مایەی سەرسامی هاشم دەبێت، هەوڵ دەدات دیقەتی کاری ئەم عزرایلە سەیرە بدات، هەرکە دەموچاوی

هاشم دەکاتەوە دەبینێ مرۆڤێکی ئاسایی لەبەردەمە. هاشم لە ترسی ئەم عزرایلەی شێوەی مرۆڤی وەرگرتووە، هاوار دەکات. کەچی عزرایلە مرۆڤەکەش کاتێك سیمای هاشم دەبینێ و سەیری چاوەکانی دەکات ئەویش هاوار دەکات، ئەمەش وا دەکات عزرایل ڕەق ببێتەوە و بێ جووڵە بکەوێتە سەر جەستەی هاشم!

بۆ چەند چرکەیەك، هاشم ئەبو وەرد لە ڕووداوەکە ناگات، بەڵام هەرکە بەهۆش خۆی دێتەوە و هەوڵ دەدات خۆی و کفنەکەی لەو عزرایلە دەرباز بکات کە بێ جووڵە و ڕەقهەڵاتوو کەوتۆتە سەر سنگییەوە. بە هەموو هەوڵێکییەوە ئەم جەستە قورس و بێ جووڵەیە لەسەر سنگی خۆی لادەبات. دواتریش هەڵدەستێتەوە ئەو کفنە لەخۆی دەکاتەوە کە ڕێگربوو لە جووڵەکردن، بۆیە دەبینێ عزرایلی مرۆیی ئەوەی ویستی گیانی بکێشێ، خۆی مردووە، هێشتا عەقڵی ناتوانێ لەم ڕووداوە بگات!

هاشم ئەو عزرایلە گریمانکراوە وەردەگێڕێ، دەبینێ تەنها کفن دزێکە، بە ڕۆژ چاودێریی هاشمی کردووە کاتێك کفنی کڕیوە و ئامادەی کردووە. دواتریش لەبەر دەرگا چاوەڕوانی ماڵی هاشم دەبێت، تا دوایین ناڵەی مردووەکان دەبیستێ، ئەو کاتە دەچێتە ماڵەکە بۆ ئەوەی کفنە نوێیەکان بدزێ و دواتریش بیانفرۆشێتەوە. بەڵام ئاگایی هاشم دزەکە تووشی حەپەسان دەکات و دڵی دەوەستێ، بەمردوویی بەسەر ئەو مردووە مەزندەکراوە دەکەوێت کە هاشمە. بەمەش دزەکە ژمارە سێزدە تەواو دەکات کە لە خەونەکەدا عزرایل لەسەر ماڵی هاشم ئەبو وەردی باپیرە گەورەی عەلی وەردی نووسیوە.

دوای ئەوەی هاشم تەواوی ئەندامانی ماڵەکەی دەنێژێ بە کفن دزەکەشەوە، کە لەبری هاشم ژمارەی خەونەکەی تەواوکردووە. دواتریش هاشم لە ناشتنی زۆرێك لە خێزانە بەغدایییەکان بەشدار دەبێت، ئینجا تاعوونەکە دەڕەوێتەوە، شارە کۆستکەوتووەکە وەك هەمیشە لە مێژووە ئەبەدییەکەی خۆیدا، زامەکەی سارێژ دەکات، بەرە بەرە ژیانی ئاسایی دەگەڕێتەوە بەغدا. هاشم ئەبو وەردی سائیغ جارێکی دیکە خێزان دروست دەکاتەوە، خودا کوڕێکی پێ دەدات بەناوی موحسین، ئەویش ژن دەهێنێ و کوڕێکی دەبێت کە بە کارکردنی ڕشت ناسراوە ئەویش حوسێن وەردییە، ئەویش چوار کوڕی دەبێت ئەمانیش بە نەخۆشی جیاجیا کە لە بەغدا بڵاو دەبێتەوە دەمرن، تەنها یەکێکیان لە ژیان دەمێنێتەوە، ئەمیش ئەو کەسەیە کە ئەم کتێبەی لەسەر نووسراوە: دکتۆر عەلی کوڕی حوسێن کوڕی موحسین کوڕی هاشم ئەبو وەردە. کە دواتر دەبێتە بەناوبانگترین کەسایەتیی زانست لە عێراق، یەکێك دەبێت لە پڕبەرهەمترین نووسەر و ناویشی وەك دامەزرێنەری کۆمەڵناسی لە عێراق تۆمار دەکرێت.

دکتۆر عەلی وەردی دەڵێ: ئەگەر دزەکە نەدەمرد و هاشمی باپیرم دەمرد، ئەوا خۆی ژمارەکەی تەواو دەکرد کە عزرایل لەسەر دەرگای ماڵەکەی نووسیبوو، منیش ئەو کاتە لەنێو ئێوە نەدەبووم، چونکە باوکم لە وەچەی ئەو باپیرەمە کە لەدوای تاعوون لەدایك بووە، کەواتە ئەمە ڕێکەوت و قەدەرە منی هێناوەتە ئەو ژیانەی ئێوە.

باوەڕبوون بەم قەدەرە لەم کتێبەدا یاوەرمان دەبێت، یەکەم بەردی بناغەش دەبێت بۆ باوەڕبوونی وەردی بە ڕێکەوت. هەرچەندە چیرۆکی ئەم دزە بە شارەزایی دکتۆر عەلی وەردی دروستکراوە، بەڵام

به شێوەیەكی گشتی باوەڕی ئەو دەردەخات بە قەدەر!

ناوی عەلی كوڕی حوسێنی كوڕی موحسین كوڕی هاشم (ئەبو وەرد) كوڕی جەوادی بەغدادییە. بە ڕەچەڵەك دەگەڕێتەوە سەر ئیمام حوسێن كوڕی عەلی كوڕی ئەبوتالب. لە ١٩١٣/١٠/٢٣ لەدایك بووە، لە ١٩٩٥/٧/١٣ ی زایینی كۆچی دوایی كردووە، كە لە بەرامبەردا لە ڕێكەوتی ١٣٣١/١٢/١٠ كۆچی لەدایك بووە، لە ١٤١٦/٢/١٦ ی كۆچیدا مردووە. باوكی ڕۆژی لەدایكبوونەكەی عەلی وەردی لە لاپەڕەی یەكەمی قورئانێك نووسیوە، ناویشی ناوە عەلی چونكە ڕۆژی قوربان لەدایك بووە. خوالێخۆشبوو ٨٢ ساڵی زایینی ژیاوە و نزیكەی ٨٦ ساڵی كۆچی ژیاوە، ئەمەش بەپێی لێكدانەوەی خۆی بووە بە لەبەرچاوگرتنی جیاوازییەكانی مانگەكانی كۆچی و زایینی.

دایكیشی هەر لە بنەماڵەی (وەرد) بووە، ئامۆزای مێردەكەی بووە. عەلی چوارەم كوڕ و تاكە منداڵی دایك و باوكی دەبێت، هەموو براكانی مردوون. خێزانەكە نازناوی وەردیان بۆیە بەكارهێناوە، چونكە پیشەی هاشم و هەندێك لە كوڕەكانی، گوشین و دڵۆپاندنی گوڵ بووە، وەك دكتۆر حوسێن عەلی مەحفووز باسی كردووە. بەڵام سەبارەت بە نازناوی وەردی وەك دكتۆر عەبدولئەمیر وەرد پێی ڕاگەیاندم لەوە هاتووە خودی دكتۆر عەلی وەردی یەكەم كەس بووە پاشگری یای بۆ نازناوەكەی زیادكردووە، دكتۆر عەبدولئەمیر مەزندەی ئەوە دەكات كە عەلی وەردی ئەمەی لە مستەفا جەوادی مامۆستای زمانەوانی وەرگرتبێ.

ئەوەی لە ژیانی منداڵێتی عەلی وەردی زۆر جێگای سەرنج بێت، کەسایەتیی باوکیەتی. کەسایەتییەکی توندی هەبووە کە هەر زوو کەوتۆتە نێو ئەزموونی ژیانەوە، قەدەر و نەخۆشی هەموو جگەرگۆشەکانی لەم پیاوە سەندۆتەوە. لەم دونیایەدا لەنێو کوڕەکانیدا تەنها یەکی ماوە ئەویش عەلی بووە. سەید حوسێن چاوەڕوانی ئەوەی لە کوڕەکەی دەکات لە ناخۆشی لەگەڵی بوەستێ و پارێزگاری لە تاکە سامانەکەیان بکات، کە دوکانی عەتاری بووە، لە دوای خۆشی بۆ عەلی بێت. بۆیە پێشبینی ئەوەی دەکرد شوێنی ئەو بگرێتەوە و لە ژیانی سەختدا هاوکاریی بکات، کەچی عەلی بچووک هەر لە منداڵییەوە هەست بەوە دەکات، بۆ ئەوەی خەڵق نەکراوە تا دوکانی عەتاری بەڕێوە ببات، بۆیە لاسارییەکی زۆر لەگەڵ باوکی دەکات. ئەو باوکێتییە سەرسەختەش تەنگەژەیەکی دەروونی بۆ عەلی وەردی منداڵ دروست دەکات. کوڕەکە بە پێچەوانەی منداڵەکانی دیکەی مردوو، کەسێکی یاخی دەبێت، تا پلەی دکتۆراش وەردەگرێت، ئەم حاڵەتی یاخیبوونەی لەلا دەمێنێتەوە.

سەرەتای قۆناغی منداڵی عەلی وەردی هەروەك هاوزاکانی خۆی دەبێت، دەخرێتە بەر حوجرە، بۆ ئەزبەرکردنی قورئان و خوێندنەوە و نووسین. ئەو کاتە تەمەنی پێنج ساڵ دەبێت. لە مزگەوتێکی نزیك ماڵەکەیان دەبێت بۆ ئەوەی باوکەکە لە ڕۆیشتن و گەڕانەوە ئاگاداری کوڕەکەی بێت. لەبەرئەوەی خێزانی وەردی بە ڕەچەڵەك دەچنەوە سەر پێغەمبەر محەمەد درووودی خودای لەسەر بێت، بۆیە عەلی کوڕیان ناچار دەکەن عەمامەی کەسك لەسەر بکات.

## قەدەری وەردی کۆمەڵناسی بوو:

کۆمەڵناسی قەدەری وەردی بووە. بە شێوەیەك ئەو پیاوە ڕێکەوتی چەندین جیاوازی و ڕووداوی دژبەیەکی کردووە، لەوەتەی چاوی بە دونیا هەڵهێناوە. خودای گەورە ویستی لەسەر بوو وەردی دوای خوشك و براکانی بە تەنیا بمێنێتەوە، کە ئەوان یەکە یەکەیان بە مردن ڕۆیشتن. وەك ئەوەی قەدەر بیەوێ عەلی بەرپرسیارێتی هەموویان هەڵگرێت، لەگەڵ باوکێك کە لە پەروەردەکردندا ڕەق و سەرسەختە، وەك هەموو باوکەکانی دیکەی ئەو سەردەمە، کە پێیان وابوو هەڵسوکەوتی توند لەگەڵ منداڵەکانیان مایەی پەروەردەکردنی ئاکاری ئەوانە. بۆیە وەك عەلی وەردی دەڵێ باوکی هەموو توندییەکەی خستۆتە سەر کوڕە تاقانەکەی ئەمەش لەبەر نەبوونی کەسێکی دیکە تا باری ژیانی لەگەڵ سووك بکات.

لەبەر ئەوەی قەدەرەکەی دەیویست وەردی ببێتە زانایەکی کۆمەڵناسی، لەدایکبوونی ئەو لە ماڵێك دەبێت کە لە هەر لایەکەیەوە بەسەر شێوازێکی ژیان و بژێوی دەڕوانێ. دەرگای ماڵەکە لەلای گەڕەکی (شیوخ) دەکرایەوە، پەنجەرەکانیشی بەسەر گەڕەکی ئەنبارییەکانی دەڕوانی. واتە وەردی لە ماڵێك دەژیا لە سنووری دوو جیهانەوە بوو، گەڕەکی ئەنبارییەکان ناوەکەی لەوە هاتبوو، ئەو هۆزانەی تێدا دەژیا کە لە شاری ئەنباری ڕۆژئاوای عێراقەوە کۆچیان کردبوو، کە ناوچەکانیان ڕووبەڕووی تاعوون ببۆوە، هاتبوونە بەغدا و لە بەرەی حلله، لە کازمیە نیشتەجێ ببوون. گەڕەکێکیان دروست کردبوو، بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە گەڕەکەکانی دیکە کراوەتر بوو. هەرچەندە سڵکردنەوە لە بەرامبەریان هەبوو، کەچی هەر زوو ئەوان

تێکەڵ بە کۆمەڵگای شارەکە بوون. وەك ئەوەی وەردی ناوی نابوو (سروشتی شتەکان بەسەریان جێبەجێ دەبێت) دەبووایە ئەوانیش بە دیداری دراوسێکانیان بگەن و لەیەکتر نزیك ببنەوە و لەوانەیە یەکتریان خۆشبوێ و لەگەڵ یەکتر تێکەڵ بن، ئەم دیدار و یەکتر قبووڵکردنەش بەردەوامی بە ژیان دەدات.

کەچی گەڕەکەکەی دیکە، کە ناوی شیوخ بوو، گێڕانەوە مێژووییەکان دەڵێن ئەو ناوە لەوە هاتووە، شێخەکانی هۆزی (تەی) عەرەبی لە سەردەمی عوسمانییەکان کە هاتوونەتە کازمیە لەو گەڕەکە نیشتەجێ بوون، دەسەڵاتی شارۆچکەکەیان لە نیوەی دووەمی سەدەی شانزە بەدەستەوە گرتووە. ئەم گەڕەکە بەوە جیادەکرایەوە زۆرێك لە پیاوانی ئایینی تێدا نیشتەجێ بووە، دەرکەوتنی ژنان لەم گەڕەکە لەو سەردەمەی عەلی وەردی تێیدا ژیاوەکە دەگمەن بووە. بە شێوەیەك کچان شانازییان بەوە کردووە، ئەوان لە ماڵی باوانیان لەدایك دەبن و دواتر دەچنە ماڵی مێردیان، لەوێشەوە بەرەو گۆڕستان. ئەمەش بەڵگەی بەرزی ئاکاریان بووە.

عەلی وەردی لەگەڵ منداڵانی ئەم دوو گەڕەکە گەورە بووە. بە منداڵی لەنێو دوو داب و نەریتی جیاواز لەیەکتر ژیاوە. وەردی لەم بارەیەوە دەڵێ ژنانی گەڕەکی شیوخ زیاتر لە عەبایەکیان دەپۆشی، جگە لە ڕووبەند، ڕێگەی بازاڕکردنیان پێ نەدەدرا، ئەمەش ئەو نەریتانە بوو کە شارۆچکەیەکی ئایینی پێیەوە پابەند بوو. بەڵام گەڕەکی ئەنبارییەکان هێندە توند نەبوو، هەندێك لە ژنان ڕووخساریان دەردەکەوت و بۆ بازاڕ دەچوون. هەروەها لەوانەبوو هەندێك کار پیاوانی ئەم گەڕەکە ئەنجامیان دەدا، لەگەڵ گەڕەکەکەی

دیکە نەدەگونجا، بە پێچەوانەشەوە دروست بوو.

## قۆناغی منداڵی و گەنجێتی

دوای ئەوەی بەتەنیا بووە، بێ ئەو برا و خوشکانەی ژیانیان جێهێشتووە، بەرگەی ئەستەمی بژێوی گرتووە لەگەڵ باوکێکی سەرسەخت. شوێنی ماڵەکە دێت بۆئەوەی وەردی وێنەی دوو کۆمەڵگاکە ببینێت. هەر زوو شێوەی وێنەکە تەواو دەبێت کاتێك ئەوەی بەسەر دەسەپێنرێ عەمامەی سەوز لەسەر بکات کە هێشتا تەمەنی پێنج ساڵ بووە لەبەر ئەوەی سەید بووە. هەرکە واز لە حوجرەش دەهێنێ و دەچێتە قوتابخانە ڕێکەوتی کێشەیەکی سەخت دەکات، کۆمەڵگا هێشتا بە تێڕوانینێکی عوسمانی سەیری شارستانیەتی نوێ دەکات، بە چاوی گومانەوە سەیری قوتابی قوتابخانەکان دەکەن، کە ئەوکاتیش لە زمانی عەرەبی بە (مەکتەب) ناودەبرا. جا کۆمەڵگا دژی ئەو کەسانە بوو کە دەچنە مەکتەب و ئەزبەرکردنی قورئان لە مزگەوتەکان جێدەهێڵن.

وەردی دەچێتە قوتابخانەی حکومی کە دوای هاتنی دەسەڵاتی نیشتیمانی لە عێراقدا لە ساڵی ١٩٢١ دەکرێتەوە، بەڵام ناتوانێ لە خوێندنی حکومی بەردەوام بێت، ئەمەش بەهۆی خراپی باری ئابووری کە جیهان و عێراقیشی گرتبۆوە. بۆیە وەردی لە ساڵی ١٩٢٧ واز لە مەکتەب دەهێنێ کە دوایین ساڵیشی بووە. وەك خۆی بۆ مامۆستا حەمید مەتبەعی باسکردووە، لە کتێبی (وانەکانی ژیانم) وەردی خۆی وتوویەتی خراوەتە دوکانی یەکێك لە خزمەکانی بۆئەوەی فێری هونەری عەتاری بێت لە کڕین و فرۆشتندا، ئەمەش لە بەرامبەر مانگانەیەك کە تەنها پێنج ڕوپیە بووە.

فشاری بەردەوامی سەید حوسێن وەرد، بۆ سەر کوڕە بچووکەکەی وا دەکات، کوڕەکە ناچار بێت لە دوکانی عەتاری یەکێك لە خزمەکانی کار بکات. باوکی داوا لە خزمەکەیان دەکات بنەمای پیشەکەی فێر بکات، کە چۆن کڕیار ڕابکێشێت. ئەمەش یەکەم کاری زۆرەملێ دەبێت کە وەردی لەژێر فشاری باوکی ئەنجامی دەدات. بەڵام ژیانی لەگەڵ باوکی فێری ئەوەی کردبوو، کاتێك ڕووبەڕووی هەر کێشەیەك دەبێتەوە بۆ ئەوەی ئەگەری شوێنگرەوە دابنێت. بۆ ئەم عەتارییەش وەك منداڵەکە ناوی دەبات (چارەسەرێکی سیحری) هەبوو. ئەوەبوو هەر زوو عەلی وەردی کتێب لەگەڵ خۆی دەباتە دوکانی عەتاری، لەوێ دوور لە چاوی دوکاندارەکەی، هۆگری کتێب دەبێت، بەڵام خاوەن دوکانەکە تاوانە بێزراوەکەی وەردی ئاشکرا دەکات کە کتێب خوێندنەوەیە لەبری کارکردن، بۆیە ڕێگری لێ دەکات کتێب و گۆڤار بباتە دوکانەکەی و سەرزەنشتیشی دەکات، لە هەمان کاتیشدا لە کەمتەرخەمیەکەی ئاگاداری دەکاتەوە گوایە خوێندنەوە نانی نادات و تێری ناکات. پێشی دەڵێ ئەگەر لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بێت ئەوا دەری دەکات... خاوەن دوکانەکە دان بەخۆدەگرێت چونکە عەلی کوڕی مامی باوکی بووە، لەگەڵ ئەوەشدا بە وێنەی گلەیی بابەتەکە بە سەید حوسێنی باوکی عەلی وەردی دەگەیێنێ، ئەمیش سەرزەنشتی کوڕەکەی دەکات و داوای لێ دەکات بایەخ بە بنەماکانی پیشەکە بدات، کە لە داهاتوودا سوودی بۆ ئەو دەبێت.

وەردی بۆی گێڕامەوە کە لە دوایین ڕۆژەکانی لە دوکانەکەدا دەگاتە ئەو ئاستەی ئامۆژگاری کڕیارەکان دەکات شت لە دوکانەکە نەکڕن، گوایە شتەکانی فرت و فێڵی تێدا کراوە. هەروەها وەردی لەبارەی

خۆی دەڵێ هەرکاتێك لەگەڵ خوێندنەوە ئاوێتە بووە، کڕیار هاتووە. بە کڕیارەکەی وتووە هیچ شتێکمان بۆ فرۆشتن نییە!.. هەڵبەتە حاڵەتەکە ئەوها ماوەیەکی زۆر بەردەوام نابێت، خەریك بوو خاوەن دوکانەکە هەست بە قورسی وەردی دەکات لە دوکانەکەی، لەگەڵ پاشەکشەی کڕیاران لە دوکانەکە بەهۆی دەنگۆی خراپی کەلوپەلەکانی. گلەیی کڕیاران لە وەردی زیاد دەبێت، تا خاوەن دوکان ڕقی لە وەردی هەڵدەستێ و دەستبەرداری دەبێت، لەوکاتەشدا عەلی وەردی هەناسەی ئاسوودەیی هەڵدەمژێ بۆ ئازادییەك کە نزیکەی پێنج ساڵ چاوەڕوانی بوو.

وەردی ماوەی کارکردنی لەم دوکانەدا بە تاڵترین قۆناغەکانی ژیانی ناودەبات. بەتایبەتی ئەو ماوەیە جوانترین ڕۆژەکانی هەرزەکاری و گەنجێتی بردووە، لە دیدارێکی ڕۆژنامەوانی لەبارەی ئەو ماوەیەدا عەلی وەردی دەڵێ" نزیکەی پێنج ساڵم بە کاری عەتاری بەسەربرد. ئەمە درێوترین قۆناغەکانی ژیانم بوو... لەو ماوەیەدا قۆناغی هەرزەکاری و باڵغبوونم دەبڕی، ئەمەش قۆناغێکی گرنگە بۆ گەشەکردنی کەسێتیی مرۆڤ. لەوانەیە زێدەڕۆیی نەبێت ئەگەر بڵێم کەسێتیی من لەسەر بنەمای تاڵییەك دروست بووە کە سنووری نەبووە". وەردی زیاتر لە جارێك ئەوەی دووبارە کردۆتەوە، هەرکە پیشەی عەتاری جێهێشتووە، هەرگیز بۆی نەگەڕاوەتەوە.

عەلی وەردی دەزانێ قوتابخانەیەکی سەرەتایی ئێواران لە کازمیە کراوەتەوە، بێ ئیزن وەرگرتن لە باوکی دەچێ ناوی خۆی تۆمار دەکات، ئەمە ئەو کاتەی باوکی ناڕەزایی لە قوتابخانە دەردەبڕێت بە پاساوی خراپی بارودۆخی ئابووری، کەچی وەردی بە باوکی

ڕادەگەینێ خۆی لە کاری عەتاری بەشێك لە پارەی کۆکردۆتەوە، ئەو پارەیەی لە خوێندنەکەی خەرج دەکات. ئەم کاتەش بە کامەرانترین کاتی ژیانی دەژمێرێت، کە لە ساڵی ١٩٣١ بوو وازی لە پیشەی عەتاری هێنا و گەڕایەوە قوتابخانە. وەردی لە دوایین ڕۆژەکانی ژیانی پێی وابوو ڕۆیشتنی بۆ قوتابخانەی ئێواران بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندن، یەکێك لە خاڵە گرنگەکانی وەرچەرخانی ژیانی بوو. هەمیشە باسی ئەو شتانەی دەکرد کە بە ڕێکەوتی سەیر ناوی دەبردن، بەدوای یەکەوە دەهاتن بۆ ئەوەی وەردی لە قوتابخانە سەرکەوتوو بێت تا لە سەرەتایی کازمیەی ئێوارانەوە بچێتە ناوەندی کەرخ.

عەلی وەردی قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی بە (قۆناغی ئاڵەنگاری– التحدی –) ناودەبات. لەلایەك ئاڵەنگاریی باوکی دەکرد، کە خۆی دانووساندبوو پێشبینی و خوازیاری نوشستی کوڕەکەی بوو لە خوێندن، بۆئەوەی تەواو خۆی بە کارێکی سوودبەخش تەرخان بکات، پارەی دەسکەوێ و پارێزگاری لە پێگەی کۆمەڵایەتی خێزانەکەی بکات. لەلایەکی دیکەشەوە لە بەرامبەر خودی خۆی، خوێندنەکەی ئاڵەنگاری بوو، چونکە لاوازیی لە بینین هەبوو، بە شێوەیەکی ڕێژەییش یەکێك لە چاوەکانی لەناوچووبوو.

قۆناغی خوێندنی ناوەندی و گواستنەوەی بۆ کەرخ، گۆڕانکارییەکی گەورە بوو بۆ عەلی وەردی کاریگەریی بەسەر پێکهاتەی کەسایەتیی ئەو هەبوو. کە تەنها ئەوە نەبوو جلی مەلا دابکەنێ و وەك ئەفەندییەك چاکەت و پانتۆڵ بپۆشێ. بەڵکو گواستنەوەیەك بوو لە دوو توێیدا زیاتر لە واتایەکی هەبوو، تەنها گۆڕینی جلوبەرگ نەبوو وەك خۆی باسی دەکرد، بەڵکو گۆڕانی تێڕوانین و بیرکردنەوەی بوو، کە بەر

واقعێکی دواکەوتوو دەکەوت، کە ئەو واقیعە دەستگرتن بوو بەهەر شتێك کۆن و نەریتخواز بێت، لەگەڵ ڕەتکردنەوەی هەر ڕوواڵەتێك لە ڕوواڵەتەکانی گۆڕان و نوێبوونەوە.... بۆیە بەلامانەوە سەیر نییە، وەردی کاتێك هاتوچۆی قوتابخانە دەکات، کۆڵان و ڕێگە تەنگەبەرەکانی کازمیە دەگرێتەبەر، ئەمەش بۆ خۆدوورگرتن بوو لە چاوی خەڵکی عەوام و نیگای ڕقبوونەوە و سووکایەتی، چونکە جلوبەرگێکی پۆشیبوو، دەوروبەرەکەی قبوڵی نەبوو. تەنانەت هەندێکیان پۆشینی ئەو جلوبەرگەیان بە" فرۆشتنی دین بۆ دونیا" دەزانی، و بە تێکدەری ڕەفتاری دروست، دوورکەوتنەوەیان دەزانی لە ئاکاری بەرز.

هەموو ئەم کۆسپانە لە بەرامبەر ئاڵەنگارییەکەی وەردی خۆیان نەگرت، بەڵکو وەردی لەسەر ئامانجەکانی خۆی مکوڕتر دەبوو. بۆیە لە کۆتایی هەر ساڵێکدا ناوی وەردی پلەی یەکەمی لەنێو هاوڕێیەکانی بەدەست دەهێنا. تا کەشتییەکەی وەردی گەیشتە کەناری تاقیکردنەوەی (بەکالۆریا) ئەمەش ئەو ناوەیە لە عێراق بە کۆتایی قۆناغی ناوەندی دەگوترێت. لەم تاقیکردنەوەیەدا وەردی پلەی یەکەم بەدەست دەهێنێ، نەوەك تەنها لەسەر ئاستی قوتابخانەکەی و شاری بەغدا، بەڵکو لەسەر ئاستی تەواوی شانشینی عێراق. واتە لە هاوینی ساڵی ١٩٣٥ عەلی وەردی لەسەر ئاستی تەواوی عێراق یەکەم دەبێت.

بەڕێوەبەری ناوەندی کەرخ، کە دەبینی بە هێنانی پلەی یەکەم لەلایەن وەردییەوە، قوتابخانەکەی لەسەر ئاستی شانشینی عێراق یەکەم دەبێت، ڕاسپاردەیەك بە وەزارەتی مەعاریفی ئەوکات دەدات بۆ پێدانی بەخشینێکی مانگانە بۆ ئەوەی هاوکاری عەلی وەردی بێت

بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی. وەزارەت ڕەزامەندی دەنوێنێ، مانگانە دینار و نیوێك بە قوتابی عەلی وەردی دەدات، ئەم برە پارەیەش ئەوکات باش بوو بۆ ئەوەی فشاری سەر باوکی کەم بکاتەوە، و پاڵپشتی بێت لە تەواوکردنی خوێندنەکەی.

عەلی وەردی لە سەربووردەی ژیانی خۆی لەبارەی ئەم برە کۆمەکییە دەڵێ هەر زوو بڕا و بەگوێرەی مەحسوبیەت و خزمایەتی بە قوتابییەکی دیکە درا. پێی ڕاگەیاندم کە خۆی چاودێری ئەو قوتابییە سوودمەندەی کردووە بۆئەوەی بزانێ بەو پارەیەی وەری دەگرێت دەگاتە کوێ. عەلی وەردی بەدڵنیاییەوە دەڵێ ئەو گەنجە خوێندنی تەواو نەکرد، بەڵکو بۆ ئەو کارانە ڕۆیشت کە خێزانەکەی ئەنجامیان دەدا، بەمەش کۆمەکییەکە لەکیس چوو!

وەردی ساڵەکانی خوێندنی ناوەندی دەبڕێت، تا لە ساڵی ١٩٣٧ تەواوی دەکات. شایەنی باسکردنە وەردی تەنها بە خوێندنی قوتابخانە خەریك نەبووە، بەڵکو پەیوەست بووە بە ڕۆشنبیریی گشتی، ئەمەش لە میانەی خوێندنەوە، بەدواداچوون و ئەو گفتوگۆیانەی کە ئەوکات لە عێراق هەبوو. بۆیە خەریك بوو شێوەی زانستی کەسێتیی وەردی لەنێو چینی ڕۆشنبیری شارەکەی دەردەکەوت. لەوانە بە قەسیدەیەك لە کازمیە بەشداری کردووە بە بۆنەی لەدایکبوونی ئیمام موسای جەعفەر. چەند دێڕێکی لەلایەن موحسین عاملی لە بەشی یەکەم و چاپی یەکەمی کتێبی (أعیان الشیعە) بڵاوکراوەتەوە، وەك وەردی خۆشی پێی ڕاگەیاندم، بەڵام لە بەدبەختی خۆم، نەمتوانیوە چاپی یەکەمی ئەم کتێبەم دەسکەوێ.

## مامۆستایەتی و وانەوتنەوە:

وەردی دەڵێ" دوای دەرچوونم چوومە وەزارەتی مەعاریف بۆ ئەوەی تەعیین بم. تەواو ڕەتم دەکردەوە، واسیتەیەکی گەورە بکەم بۆئەوەی هەلی کارێکی شیاوم دەستبکەوێ لەو سەردەمەدا. لە بەدبەختی من، وەك مامۆستایەك لە قوتابخانەی شەترەی سەرەتایی فەرمانی دامەزراندنم دەرچوو". وەك دکتۆر ڕەهیمی و دکتۆر حللی بەڵگەنامەکەیان بڵاوکردۆتەوە، یەکەم دامەزراندنی عەلی وەردی لە بەرواری ١٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٧ بووە. عەلی وەردی یەکەم ساڵی مامۆستایەتی بەرەو شەترە دەچێت. لە بەغدا بە پاس دەچێتە ناسرِیە و لەوێشەوە وەك خۆی باس دەکات بە هێستر و گوێدرێژ دەچێتە شەترە. دەبینی قوتابخانەکە لە قوڕ دروستکراوە، حەوشی نییە، قوتابیان لەسەر زەوی دادەنیشتن و پێویستیان بە کەسێکە بنەماکانی خوێندن و نووسینیان فێر بکات. گەڕانەوە بۆ بەغدا ئاسان نەبوو، لەبەر سەختی ڕێگاوبانی ئەوکات و پابەندبوونی وەردی بۆ یەکەم کاری فەرمی کە پارەی تێدا دەستدەکەوێ. ئەمەش خۆی پلانی بۆ دانابوو بۆ ئەوەی لە دەسەڵاتی باوکە توندەکەی قوتاری بێت وەك ئەو کات بیری لێ کردۆتەوە.

لە ڕۆژگاری شەترە عەلی وەردی لە مەینەتی ڕاستەقینەدا دەژی، چونکە لەوە ڕانەهاتبوو لە کۆمەڵگایەکی عەشایری داخراو بژیت. زۆریان پەیوەندیان لەگەڵ وەردی پچڕاندبوو، چونکە گەنجێك بوو لە ناوەڕاستی بیستەکانی تەمەنی بوو، ژنی نەهێنابوو، کەسی سەڵتیش لە کۆمەڵگای لادێی عێراقدا کەسێکی بێزراوە، چونکە زۆربەی گەنجان لە کۆمەڵگای عەشایری عێراقی لە دوای تەمەنی هەژدە ساڵی

هاوسەرگیریی دەکەن. عەلی وەردی ساڵە درێژ و جارپسکەرەکەی بە پەستی تەواو دەکات. هەرکە پشووی هاوین دێت، وەردی دەگەڕێتەوە بەغدا بۆ ئەوەی بەدوای کەسێکی دەستڕۆیشتووی وەزارەتی مەعاریف بگەڕێت، تا لە شەتڕە بیگوازنەوە. تەواوی هاوین لەبەر دەرگای وەزارەت دەبێت. وەردی دەڵێ دواجار کوڕانی گەڕەکەکەی بە فریای کەوتن و چوونە لای یەکێك لە کوڕەکانی گەڕەك کە لە وەزارەتی مەعاریف کار دەکات، بۆ ئەوەی هاوکاری وەردی بکات. ئەمەش بەپێی خواستی ئەو بوو وەزارەتی مەعاریف لە ڕۆژی یەکەمی تشرینی یەکەمی ١٩٣٨ عەلی وەردی بۆ قوتابخانەی شالجیەی سەرەتایی گواستەوە.

کاتێك وەردی دەرگای واسیتە دەدۆزێتەوە، وا دەکات وەزارەت ڕازەکەی بگوازێتەوە وەك مامۆستای ئابووری بچێتە ئامادەیی مەرکەزی لە بەغدا. بەمەش وەردی خۆی لە کۆمەڵگای بەغدایی دەدۆزێتەوە دوور لە کۆمەڵگا داخراوە ئایینەکەی کازمیە و دوور لە کۆمەڵگا عەشایرییەکەی شەتڕە. ئامادەیی مەرکەزیی دووەم خاڵی وەرچەرخان بوو لە ژیانی وەردیدا، پەیوەندی لەگەڵ هەندێك لە کەسایەتییە ڕۆشنبیرییەکانی بەغدا دروستکرد. وەك مامۆستایەکی قوتابخانەکانی بەغدا، لە کۆڕە ئەدەبییەکانی کازمیە ئامادە دەبوو. بەرە بەرە کۆمەڵگای ڕۆشنبیریی بەغدا کەسێتیی مامۆستا عەلی وەردی دەناسی.

## وەردی ڕێکەوتی قەدەرەکەی دەکات... نارەزایی دەردەبڕێت!

لە ئامادەیی مەرکەزی ڕووداوە هەرە گرنگەکە ڕوودەدات، وەزارەتی

مـەعاریف عـەلی وەردی بـۆ وتنـەوەی ماددەیـەکی نـوێی خوێنـدن دەستنیشان دەکات، کە لـە قوتابخانەکـە خراوەتـە سـەر مەنهـەجی خوێندن. ئەو ماددەیەی مەبەستیانە لەلایەن عەلی وەردی بگوترێتەوە ناونیشـانەکەی ئەمەیـە (بـارودۆخی کۆمەڵایـەتی لـە عێـراق). کـە بابەتەکانی تایبەت دەبێت بـە خوێنـدنی واقیعـی کۆمەڵایـەتی وڵات، لەگەڵ ئەو هۆکارانەی کاریـان لەسـەر ڕێڕەوەکـەی کـردووە، لەگـەڵ دیارترین سیما و تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای عێراقی. عەلی وەردی لە بەرامبەر ئەو قەدەرەی ناڕەزایی دەردەبڕێت، بۆیە بیانووگرتنێکی نووسـراو بـە وەزارەت دەدات لـە بەرامبـەر سـەپاندنی ماددەیـەکی کۆمەڵایـەتی کـە لــە چوارچـێوەی پسـپۆڕی ئـەم نییـە، بـەڵام ناڕەزاییەکانی و ڕەتکردنەوەی وتنەوەی ماددەکە کە دوور بـوو لـە پسپۆڕی ئەو، وەك لە ناڕەزاییە ماقوڵەکەی نووسرابوو، هـیچ یـەکێك لەوانە سوودی نەبوو. وەزارەت سوور بوو، هەڕەشەی ئەوەشی کـرد ڕاژەکـــەی وەردی دەگوازێتـــەوە قوتابخانەیـــەکی دیکـــە، ئەگـــەر کاردانـەوەی پێویسـتی نـەبێت بـۆ وتنـەوەی مـاددە نوێیەکـە، ئـەو ماددەیـەی دواتـر کەسـایەتیی زانسـتی و کۆمەڵایـەتی عـەلی وەردی دورست دەکات. دواجار عەلی وەردی ناچار دەبێت ملکەچی فەرمانەکە بێـت و قبـوڵی ئـەوە بکـات، وانـەی بـارودۆخی کۆمەڵایـەتی عێـراق بداتەوە.

وەردی لەم کتێبەدا ژوانی لەگـەڵ قـەدەری خـۆی هـەبوو، سـەرقاڵی خوێندنـەوە و بەدواداچـوون بـوو بـۆ ماددەکـە، بەتایبـەتی وانەکـە کتێبێکـی دیـاریکراوی نـەبوو، کـە لەلایـەن وەزارەتـی مەعاریفـەوە دەستنیشان کرابێت، بە پێچەوانەی وانـەکانی دیکـە، کـە لـە هـەموو

قۆناغەکانـدا کتێبـی چـاپکراوی خۆیـان هـەبوو. وەردی بابەتـەکان کۆدەکاتەوە، چەندین ڕۆژ و شەو لە کتێبخانـەکانی بەغـدا و کازمیـە دەگەڕێت بۆ ئەوەی کتێبێکی مەنهەجی بـۆ ماددەکـە بنووسـێت.... ئەمـەش سـەرەتاکە بـوو.. وەردی بـە سەرسـامییەوە وەسـفی ئـەو ڕێکەوتە دەکات و دەڵێ: قەدەر لە دەرگات دەدات و یاخەت دەگرێت، لەوانەیە دژی بوەستیتەوە و هەلەکە لەکیس بدەیت، لەبـەر ئـەوەی بەسەرت سـەپێنراوە. کەچـی لـە کۆتاییـدا ئەمـە قـەدەری تۆیـە بـە ڕێکەوتێکی سەیر هاتووە!

وانەی کۆمەڵایەتییەکە کاریگەری بەسەر عەقڵ و هزری عەلی وەردی دەبێـت، بۆیـە پەرۆشـی بـۆ توێژینـەوەی زانسـتی شـوێنی ترسـەکە دەگرێتەوە، دواتریش بەداواداچوون بۆ کۆمەڵگای عێراق و وردبوونەوە لـە دژبەیەکـەکانی دێـت. بەمـەش وەردی لـە دەروازەی کۆمەڵناسـی دەچێتە ژوورەوە و هەرگیز بۆ دەرەوە ناگەڕێتـەوە. عاشـقی وانـەی کۆمەڵایەتی دەبێت کە ڕەتـی دەکـردەوە. ئـەم دووانـەش هـەنگاوی یەکەم بوون بۆ بنەمایەکی تیـۆری (المقدمـە) ی ئـیبن خەلـدون، لـە دکتۆراکەیدا.

خوالێخۆشبوو مامۆسـتا حوسـێن عـەلی مـەحفووز بـۆی گێڕامـەوە، ڕۆژێکیان عـەلی وەردی بینیـوە، کـە دیقـەتی نەخشـەیەکی گـەورەی داوە، کە گۆی زەوی نیشان داوە. پرسیاری ئەوەی لێ دەکات نهێنی بایەخ و دیقەتدانەکەی چییە. وەردی ئاماژە بۆ بیابانی چین و بیابانی عەرەبی دەکـات و دەڵـێ ئـەم ناوچـانە بیابانیشـینی بـە شارنشـینی دەگەینێ، لەوێ بیابان بـە ڕووبـار دەگـات، بۆیـە چـەندین جـەنگ و داگیرکاری ڕوویداوە، لەلایەن خەڵکی بیابان لە مەنگۆلیا و دوورگـەی

عەرەبەوە، وەك ئەوەی لە ناوچە عەرەبییەکانی خۆیان بە ئاڕاستەی دۆڵی سەوز ڕوویداوە لەوێش خۆراك و لەوەڕگا و ئاو هەیە. حوسێن عەلی مەحفووز وتی ئەوکات عەلی وەردی هێشتا سەفەری ویلایەتە یەکگرتووەکانی نەکردبوو. دواتر هەستم کرد کە تیۆرەکەی لەبارەی بیابانئنشین و شارنشیلنی لە قۆناغی پێگەیشتنە، ماوەیەکی زۆر بوو خۆی بۆ ئامادە کردبوو.

مامۆستایان دکتۆر عەلا حوسێن ڕەهیمی و مامۆستا عەلی تاهیر حللی توێژینەوەیەکیان لە گۆڤاری زانکۆی کوفە بەناونیشانی (عەلی وەردی: ژینگە و گەشەکردن و کۆششە پەروەردەییەکانی. توێژینەوەیەکی مێژوویی) بلاو کردۆتەوە. لەم توێژینەوەیە فایلی دکتۆر وەردیان لە میانەی ئەو بەڵگانە گواستۆتەوە کە لە وەزارەتی پەروەردە و خوێندنی عێراقی هەبووە، کە ئەو کات ئەم وەزارەتە بە مەعاریف ناسراوە. ئەم کارەیان جێگای دەستخۆشییە. ئەم فایلە لە توێژینەوە بەپێزەکەی ئەوان دەگوازمەوە، ئەمەش وەك جەختکردنەوە لەسەر لایەنی ئەکادیمی کە دەبێت ئاماژە بە سەرچاوە بکرێت. ئەوانیش خاوەن کارەکەن، تکاشم وایە هەر کەسێك شتێك دەگوازێتەوە، ئاماژە بە سەرچاوەکەی بکات.

**فەرمانە کارگێڕییەکانی تایبەت بە دامەزراندنی وەردی و ئەرکە فەرمییەکانی لە نێوان ساڵانی ١٩٣٧ - ١٩٧٠**

| شوێنی کارکردن | مێـــــژووی دامەزراندن | مێـژووی دەست لەکارهەڵگرتن |
| --- | --- | --- |
| مامۆستا لە قوتابخانەی شەتڕەی سەرەتایی | ١٩٣٧/١/١٦ | ١٩٣٧/١١/١ |
| مامۆستا لە قوتابخانەی شەتڕەی سەرەتایی | ١٩٣٨/٣/١٧ | ١٩٣٨/١٠/١ |
| مامۆستا لە قوتابخانەی شالجیە | ١٩٣٨/١٠/١ | ١٩٣٩/١٠/٢٥ |
| مامۆستا لە ئامادەیی مەرکەزی | ١٩٤٣/٩/١٥ | ١٩٤٤/١٢/١ |
| مامۆستا لە ناوەندی بازرگانی | ١٩٤٤/١٢/١ | ١٩٤٥/١/١٢ |
| مامۆستا لە ناوەندی بازرگانی | ١٩٤٥/١/١٣ | ١٩٤٥/١/١٥ |
| مامۆستا لە ناوەندی بازرگانی | ١٩٤٥/١/١٦ | ١٩٤٥/١٠/١ |
| مامۆستا لە کۆلیژی ئاداب و زانستەکان | ١٩٥٠/١٠/٣٠ | ١٩٧٠/٥/٢٥ |

## بەرەو بەیرووت بۆ خوێندنی بەکالۆریۆس

کاتێك وەزارەتی مەعاریف لە ساڵی ١٩٣٩ ڕایگەیاند قوتابی بۆ خوێندن ڕەوانەی زانکۆی ئەمریکی دەکات لە بەیرووت، عەلی وەردی بە مەبەستی خۆی گەیشت. بۆیە عەرزوحاڵی پێویستی پێشکەش بە وەزارەت کرد. لەبەر ئەوەی پسپۆڕی یەکەم کە هەمیشە سازشی لەسەر نەدەکرد، ئابووری بوو، لە کاتی ڕاگەیاندنی ئەنجامی

کاندیدکردنەکان، وەردی لە دەرچووکان بوو، کورسییەکی تایبەت بە خوێندنی بازرگانی و ئابووری بۆ ئەو بوو. یەکسەر ڕازی دەبێت، هەرچەندە ئارەزووی خوێندنی ئابووری نەمابوو، بەڵام ڕێگایەکی دیکەی لەبەردەم نەبوو چارەسەرکردن نەبێت، ئەمەش لە ترسی ئەوەی کورسییەکەی لەدەست بچێت. چونکە بەدەستهێنانی بە یەکەم هەنگاو دادەنرێت بۆ سەرکەوتنی بە پەیژەی شکۆمەندی زانست. ئەو کاتە مۆڵەتی خوێندنی پێشکەش بە وەزارەتی مەعاریف کرد، بۆ تەواوکردنی خوێندنی زانکۆ کە چوار ساڵ دەخایەنێ.

وەك دەردەکەوێ کاتێك عەلی وەردی دەبێتە مامۆستا، ئاسۆی ڕۆشنبیری و زانستی لەبەردەم دەکرێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئاواتی ئەو لە وانەگوتنەوە بە قوتابیان نەوەستا، بەڵکو لەم قۆناغەدا هەستی بەتینوێتی کرد بۆ زانست و پێویستی بە پێشکەوتن بوو. بۆیە دەبوایە لە دەرگای دیکەی زانستەوە بدات، یەکێك لەم دەرگایانەش بەدەستهێنانی بەکالۆریۆس بوو لە بەیرووت.

وەردی بۆ سەفەرکردن بەرەو دەرەوەی عێراق، تووشی ناڕەزایی باوکی دەبێتەوە. سەفەرکردن بەرەو بەیرووت ئەو کات پڕ بوو لە مەترسی، چونکە بەیرووت بە کاردانەوەی بەرامبەر خۆرئاوا بەناوبانگ بوو، وەردیش گەنجێکی سەڵت بوو کە هێشتا هاوسەرگیریی نەکردبوو. باوکی مەرجی ئەوەی بۆ دادەنێت هاوسەرگیری بکات، ئینجا ئەو ڕازی دەبێت سەفەر بکات. کەچی عەلی وەردی بەڵێن بە باوکی دەدات دوای گەڕانەوەی لە خوێندنەکەی هاوسەرگیری دەکات، لەسەر ئەم هەڵوێستەشی بەردەوام بوو. لە بەرامبەر پێداگری و ویستی سەلماندنی خود، باوکەکە ڕازی بوو، وەردی بەرەو بەیرووت

ڕۆیشت.

وەردی دەڵێ گەشتکردن بۆ بەیرووت سەخت و پڕ مەترسی بوو. ئۆتۆمبیلی کرێ تۆیان لە بەغداوە بەرەو شام دەگواستەوە، کە زۆرینەی ڕێگاکان و درێژترینیان لە بیابانەوە بوو. لە شامیشەوە هەر بە ئۆتۆمبیلی کرێ بەرەو بەیرووتیان دەبردی. لەوێ جیهانێکی دیکە دەبینێ لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست کە شارستانیەتەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لەوێ بەیەکتر دەگەن. وەردی لەوێ بۆ یەکەم جار سەیری دەریا و چیا دەکات، کە بەیرووتی پێکهێناوە، ئەو شارەی پایتەختی کتێبی عەرەبی و هزری دیموکراسی ئازادە!

وەردی دەچێتە بەیرووت ئەو کاتە دەوڵەتانی گەورە جەنگی دووەمی جیهانی لە سێپتەمبەری ١٩٣٩ ڕادەگەیەنن. وەردی ناوی خۆی لە زانکۆی ئەمریکی لە بەیرووت تۆمار دەکات (زانکۆی ئەمریکی لە بەیرووت لە کۆنترین زانکۆ ئەمریکییەکانە لە وڵاتانی عەرەبی، بەناوی کۆلیژی سووری ئینجیلی لەسەر دەستی قەشە دانیال لە ساڵی ١٨٦٦ لە بەیرووت دامەزرا، ئێستا هەشت کۆلیژ لەخۆیەوە دەگرێت). ئەوکاتە وەردی تووشی هەندێك بژاری کولتووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی نوێ دەبێت، کە لێی ڕانەهاتووە و پێشتر نموونەی لە عێراق نەبینیوە. لەوانە جووڵانەوەی قوتابیانی زانکۆ بوو کە کاریگەریی ڕۆشن و ئاشکرای بەسەر کۆمەڵگاوە هەبووە، دووەم پەیوەندی بە لوبنانەوە هەبووە وەك دەوڵەت و وڵات. ئەم وڵاتە هەڵی جەنگ دەقۆزێتەوە بۆ ئەوەی خۆی لە داگیرکاریی فەرەنسی ڕزگار بکات. وەردی بە چاوەکانی خۆی دامەزراندنی ئەو دەوڵەتە نوێیە دەبینێ.

وەردی لە ناڕەزاییەکان لەگەڵ قوتابییەکان بەشدار دەبێت، هەر زوو

لەنێو کۆمەڵی قوتابیـان تێکـەڵ دەبێـت. هـانی هنـدی و عەبـدولئیلا نەسڕاوی لە کتێبەکەیاندا بەناوی "بزووتنەوەی نەتەوەخوازیی عەرەب – سەرهەڵدان و پێشکەوتنی" لە میانەی بەڵگەکانییەوە لە لاپەڕە ٣٥ باس لەو ماوەیەی زانکۆی ئـەمریکی دەکـات لـە بـەیرووت کـە تێیـدا هاتووە" کۆمەڵێك لە قوتابیان چالاك بوون کـە لـە زانکۆکـە لـەنێوان ١٩٤٠ – ١٩٤٢ دەرچـوو بـوون، لـە لوبنـان و فەڵەسـتین و سـووریا هاتبوون، هەموویان لە جووڵانەوەیـەکی قوتابیـان بەشـدار بـوون لـە کاتی جەنگی عێراقی – بەریتانی لە ئایاری ١٩٤١ ( کە لە عێـراق بـە جووڵانەوەی مایس دەناسرێت). تەنانـەت هەنـدێکیان ئامـادە دەبـن وەك خۆبەخش بچنە جەنگـەوە بـۆ پاڵپشـتی کردنـی عێـراق، وڵاتـی وەردی".

کتێبەکەی هندی و نەسڕاوی سوودی ئەوەی پێگەیاندم، هاوڕێیانی وەردی لە نەتەوەخوازە عەرەبییەکان بناسم کە لەو مـاوە سـەختەی خوێندن لەگەڵی بوون، بینیم هەندێك کەسایەتیی بەناوبانگی لەگـەڵ دابووە، لەوانـە حەیـدەر عەبدولشـافی دەرچـووی کۆلیـژی پزیشـکی ١٩٤٣، محەمەد یوسف نـەجم، مـەعتوق ئەسمـەر، جـۆرج حەبـەش، تۆفیق شخشیر، ئەحمەد یەشـرتی، عیصـمەت سـەفدی (فەڵەسـتین) ناجی زڵی و هانی هندی (سوریە) عاسم شێخ و سامی جەبر (لوبنان)، عبدولجەبار هنداوی، تاریق خـزری، ئەحمـەد مـەلاح، هـادی سـەڕاف (عێراق)، ئەحمەد خەتیب (کوێت)، عومـەر سـەقاف و زیـاد شـەواف (سعودیە).

فەڕەنسا لە جـەنگی دووەمـی جیهانیـدا لەسـەر دەسـتی هێزەکـانی ئەڵمانیا شکستی هێنا. حکومەتێکی فەڕەنسی کە لایـەنگری ئـەڵمان

بوو دامەزرا، ئەمەش یەکەم موژدەی سەربەخۆیی سووریا و لوبنان بوو لە دەسەڵاتی فەرەنسی. وەردی شاهێدحاڵی ئەم لەدایکبوونە بوو، خۆی بۆ تێگەیشتن و درکپێکردن مەڵاس دابوو. گەلی سووریا و لوبنان ڕەتیان کردەوە مامەڵە لەگەڵ حکومەتی فەرەنسای ڤیچی بکەن کە نێردراوی باڵای خۆی رەوانەی لوبنان کردبوو. بەڵام زوو بابەتەکان دەکەوتنەوە دەست هێزەکانی فەرەنسای ئازاد کە ژەنەڕاڵ دیگۆل سەرکردایەتی دەکرد. کە ئەوەیان لە کاتی کۆتایی هاتنی جەنگ و چوونی هێزەکانی بەریتانیا بۆ شام، بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە، تێیدا بەڵێنی سەربەخۆیی بە لوبنانی و سورییەکان دا. هەرچەندە فەرەنسا سستی دەنواند، بەڵام دواجار ناچار بوو لە ٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩٤٣ سەربەخۆیی لوبنان و سووریا ڕابگەینێ. عەلی وەردی بەچاوەکانی خۆی سەربەخۆیی دەوڵەت و هەڵبژاردنی ئازاد و تێگەیشتنی نێوان موسڵمان و مەسیحییەکان دەبینی. لەگەڵ دانانی دەستوورێك کە ڕێز لە کەمینەکان دەگرێت، دانانی ئاڵایەکی نوێ. کەچی واقیعی لوبنانی لەژێر ئەو دەستوورە پێشنیارکراوەی فەرەنسا مایەی دڵنیایی نەبوو. وەردی شاهێدحاڵی هەموو ئەو ڕووداوانە بوو، دواجاریش گەڕایەوە وڵاتەکەی خۆی.

قوتابییەکی عێراقی بە ناوی عەلی حوسێن موحسین وەردی، لەنێو قوتابییە نایابەکانی زانکۆی ئەمریکی دەبێت. لە ماوەی مانەوەی لە بەیرووت ئامادەبوونێکی زانستی و کۆمەڵایەتی تایبەتی دەبێت. زانکۆی ئەمریکی لە بەیرووت لە سایتەکەی خۆی بە زمانی ئینگلیزی ناوی ئەو کەسانەی داناوە کە تێیدا دەرچوون و دواتر بەناوبانگ بوون، کاتێك دەگەیتە سەر عێراق ناوی عەلی وەردی مێژوونووس و

زانای کومەڵناسی لەنێو چەندین ناوی گەورەی عێراق دایە.

وەردی لە ۱۹٤۳ لە زانکۆی ئەمریکی لە بەیرووت دەرچوو و گەڕایەوە بەغدا، خەریك بوو جەنگی دووەمی جیهانی بە سەرکەوتنی هاوپەیمانان کۆتایی دەهات. دوای تەواوکردنی زانکۆ و گەڕانەوەی بۆ بەغدا ئیدی هەلێك لەبەردەم وەردی نەمابوو، بۆیە دەبێت لەگەڵ خێزانەکەی پەیوەندی بەردەوام بێت و ئەو بەڵێنە جێبەجێ بکات کە پێش سەفەرەکەی بە باوکی دابوو. وەردی کە تازە لە بەیرووتی تازە ئازادبوو گەڕایەوە تووشی هاوسەرگیرییەکی نەریتی بوو. دایکی ژنێکی بۆ دەستنیشان کرد. بەر لەوەی بۆچوونی وەردی وەربگرێت و یان بەر لە زەواجەکە بیناسێ. وەردی لەناکاو دەبێتە زاوا و ئەم زەواجەش یەکێك لە ڕێکەوتە دڵخۆشکەرەکانی ژیانی وەردی بوو، کوڕێکی بوو ئەمەشیان شانسێکی باش بوو، حەسان لە ساڵی ۱۹٤٤ لەدایك بوو دواتر لە ساڵی ۱۹٤٥ کوڕێکی دیکەیان بوو بە ناوی جەعفەر، وەردی زۆر پەیوەست بوو بەم کوڕەی دووەمی لە خۆشەویستیان ناوی نابوو (حماد).

دەبووایە وەزارەتی مەعاریفی عێراقی، ئەو فەرمانبەرەی دابمەزرێنێتەوە کە لە خولەکەی خۆیدا پلەی شەرەفی هەبوو. بۆیە وەك مامۆستا لە ئامادەیی مەرکەزی لە ۱٥ ئەیلولی ۱۹٤۳ دامەزرایەوە. دوای ساڵ و نیوێك وەردی بۆ ناوەندی بازرگانی گوێزرایەوە و ئەمەش لە کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹٤٤ بوو. لەوێ ئەرکی گوتنەوەی وانەی ئابووری و بارودۆخی کۆمەڵایەتی عێراقی پێ سپێردرا.

## خوێندنی ماستەر و دکتۆرا لە زانکۆی ئۆستن لـە ویلایـەتی تێکساسی ئەمریکی

کاتێك وەردی لە بەغدا سەقامگیر بوو، لەویێ ماڵ و خێزان و منداڵ و کـاری فـەرمی هـەبوو، لەگـەڵ ئـەو کۆمـەڵگا ڕۆشـنبیرەی ناسـی و پەیوەندی لەگەڵ کەسایەتییە دیارەکانی کۆمەڵگای بەغدایی بەست. ئەمانە وەك ئەوە بوون هەموو ئەو شتانە بێت کە لە ژیان دەیخواست. کەچـی ڕوحـی یـاخی ئـەو لـەدوای سـەرفرازییەکی دیکـە دەگـەڕا لـە شـوێنێکی دیکـە. ئەمـەش کاتێـك بـوو کـە وەزارەتـی مـەعاریف دەستنیشـانی کـرد بـۆ ئـەوەی بـۆ خوێنـدن ڕەوانـەی ویلایەتـە یـەککگرتووەکانی ئـەمریکای بکـات بـۆ مـاوەی چـوار سـاڵ. ئـەویش پێشوازی لەم هەلە کرد، لە تاقیکردنەوەکان سەرکەوتوو بوو، لە یەکی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥ مۆڵـەتی خوێنـدنی پێشـکەش کـرد بـۆ تـەواوکردنی خوێنـدنی بـاڵڵا لـە زانکـۆی تێکسـاس لـە ویلایەتـە یەککگرتووەکانی ئەمریکا.

وەردی دوو کێشـەی لەبـەردەم بـوو، یەکـەم: بەدەسـتهێنانی ڕەزامەندی باوکی، چونکە دەبووایە ژن و منداڵەکانی بباتە لای باوکی، تا لەگەڵ ئەو بژین. دووەم: فێربوونی زمانی ئینگلیزی بـوو، چـونکە خوێندن لە زانکۆکە بە زمانی ئینگلیزی دەبێت و عەلی وەردیش ئـەم زمانەی بە چاکی نەدەزانی. بۆیە بەر لەوەی سـەفەر بکـات دەچێتە قوتابخانەی زمانـەکان لـە بەغـدا، لـەویێ نمرەیـەکی بـەرز لـە زمـانی ئینگلیزی دەهێنێ. ڕۆژێـك مامۆسـتا مـەحفووز بـە منـی وت: وەردی نموونەیـەکی دروسـت و ڕاسـتگۆ بـوو بـۆ بەدەسهێنانی زانسـت لـە تەمەنێکی درەنگدا. بە شێوەیەك جیاوازی تەمەن لەگەڵ هاوڕێیەکان

تووشی شەرمەزاریی نەکرد، بەڵکو ئامانجەکەی لەبەر چاوی خۆی دانابوو، ئەو ئامانجەش نایەتەدی ئەگەر هۆکارەکانی سەرکەوتنی نەبێت، یەکێك لە هۆکارەکانیش فێربوونی زمانی ئینگلیزی بوو.

خاڵی وەرچەرخانی ئەمریکی لە ژیانی وەردیدا، لە هەموو لایەکەوە سەرنجراکێش و پڕ لە دژبەیەك و سەیروسەمەرەکان بوو. هەر لە سەرکەوتنی بۆ فڕۆکەی جامبۆ، کە هەردەم بە سەفەرکردن بەسەر پشتی گوێدرێژ بەراوردی دەکرد. وەردی درك بەوە دەکات کاتێك بەرەو تەوژمی شارستانیەتی نوێ دەچێت، کە بەلای ئەو جۆرێك بوو لە خەیاڵ، خۆی پێشتر لە دابڕانێك و داڕووخانێکی شارستانی ژیاوە، وەك خۆی لە یەکێك لە دیمانە ڕۆژنامەوانییەکان باسی دەدات.

کاتێك وەردی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بووە، چەندین نامەی لەگەڵ هەندێك لە برادەران و کەسوکاری گۆڕیوەتەوە، لە نامەکان باسی ئەو جیاوازییە زانستی و تەکنەلۆژییە دەکات کە لەنێوان ئەمریکا و عێراقی ئەوسا هەبووە. ئەمەش خاڵی نییە لە گاڵتەپێکردنێکی تاڵ بەرامبەر بە کۆمەڵگا دواکەوتووەکەی، سەلام شەماعی ڕۆژنامەنووس نامەکانی کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی لە یەکێك لە کتێبەکانی لەبارەی وەردییەوە بڵاوی بکاتەوە.

لە سەرەتای یەکتر ناسینمان وەردی بەپارێز بوو لەوەی باسی ئەزموونی ئەمریکا بکات لە ژیانی خۆیدا، ئەمەش بەهۆی ئەو ناکۆکییە سیاسییە بوو کە دوای جەنگی عێراق و ئێران نیشانەکانی دەرکەوتبوو، دواتر هەر ئەم ناکۆکییە لە سەروبەندی داگیرکردنی کوێت لەلایەن هێزەکانی عێراقەوە بوو بە جەنگێکی خوێناوی، چارەنووس دەرفەتی بە وەردی نەدا کەوتنی بەغدا بە دەستی

هێزەکانی ئەمریکا ببینێت. وەردی سەرسام بوو بە شارستانییەت و پێشکەوتنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەتایبەتیش کاتێک چووە ئەمریکا، هێشتا لەم وڵاتەدا سەدای سەرکەوتن لە جەنگی دووەمی جیهانی بەسەر هەموو شتێکەوە زاڵ بوو. ئەمریکا خەریك بوو جیهانی ڕۆژئاوای دەخستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، بەو سیفەتەی پێشەنگ و سەرکردەی ئەو کۆمەڵگایەیە، بە پرۆژەی مارشاڵ کۆمەکی وڵاتانی ئەورووپای دەکرد، کە ئەم پرۆژەیە توانای ئەورووپای بووژاندەوە. وەردی زیاتر لە جارێك لەلای من هیوای دەخواست عێراق لە بارودۆخێکی هاوشێوەی ئەمریکا بێت.

وەردی هەمیشە ئەوەی بۆ ئێمە دووبارە دەکردەوە، کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و عێراق لە زۆر ڕووەوە لەیەکتر دەچن. بەتایبەتی لە دەرامەتی ئابووری، هەردوو وڵات نەوت و وزە و ڕووبارێکی زۆریان بۆ کشتوکاڵ هەیە، هەردوو وڵات دەرامەتێکی مرۆیی داهێنەریان هەیە کە دەتوانن پشت بە وڵاتی دیکە نەبەستن، هەردوو دەوڵەت سەرچاوەی شارستانیەتن، خەڵك لە ناوچەکانی دیکەی جیهانەوە ڕوویان تێکردووە و کردوویانە بە نیشتیمانی خۆیان.... وەردی دەیگوت کەواتە چ شتێك ڕێگرە تا عێراق وەك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بێت!

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئاسۆیەکی زانستی و کولتووری و هزری لەبەردەم وەردی کردەوە. وەردی لەوێ درکی بە مانای میتۆدی زانستی کرد لە ڕووی پراکتیك و شیکردنەوەدا. وەردی لە نزیکەوە تاوتوێی کۆمەڵگای ئەمریکی کرد، هەمان ئەو ئامرازەکانی ڕۆژئاوای بۆ توێژینەوە بەکارهێنا. هەروەها توێژینەوەی کۆمەڵگای عێراقیشی کرد

بەو ئامرازانەی کە دەمێك بوو ئامادەی کردبوو، هەر لەو سەردەمەی کە وانەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی عێراقی پێدرابوو لە ناوەڕاستی سییەکاندا.

لە بەختیاری وەردی، ویستی خودایی کە خۆی تا دوا ڕۆژەکانی ژیانی بە ڕێکەوت ناوی دەبرد، وا دەکات بچێتە کۆنترین و بەناوبانگترین زانکۆکانی ئەمریکا، ئەویش زانکۆی ئۆستن بوو لە ویلایەتی تێکساس کە بە یەکێك لە مەزنترین و دەوڵەمەندترین زانکۆکانی ئەمریکا دادەنرێت لە ساڵی ١٨٨٣ لە شاری ئۆستنی پایتەختی ویلایەتی تێکساس دامەزراوە، ئێستا زانکۆیەکی گەورەیە زیاتر لە ٥٥ هەزار قوتابی لەخۆوە دەگرێت، بە بەهێزترین زانکۆ دادەنرێت لە ڕووی پسپۆڕی زانستە مرۆییەکان و زانستە ئەبستراکت و زانستە پراکتیکییەکانەوە".

بازدانی گرنگ و گەورەتر هاتە بەردەم وەردی کاتێك خۆی لەنێو کۆمەڵێك زانای کۆمەڵناسی جیهان بینیوە. وەك خۆی دەیگوت بە شێوەیەك پێویستی بەوە بوو کۆششێکی ئەفسانەیی بکات بۆ ئەوەی بە ئامانجی خۆی بگات. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك لوبنان نییە کە لە عێراقەوە نزیك بوو، ئامادەکاریی ماستەر تەواو لە خوێندنی بەکالۆریۆسی زانکۆی ئەمریکی بەیرووت جیاوازە، سەرەڕای سەختی ڕۆژانی یەکەم و خۆگونجاندن و جددییەتی وانەکان لە یەکەمیاندا، کەچی وەردی سەلماندی خۆی زەمینەیەکی گونجاوە بۆ وەرگرتنی زانست و مەعریفەی ڕۆژئاوایی و دواتریش بۆ هەزمکردن و گواستنەوەی بۆ کۆمەڵگاکەی خۆی.

دوای دوو ساڵ لە کۆششێکی زانستی بێوچان، وەردی گەیشتە

یەکەم دڵۆپی دەریای خواستە ڕەواکەی خۆی، ئەویش بڕوانامەی ماستەر بوو. عەلی وەردی بە سروشتی خۆی کاری لەسەر توێژینەوە زانستییەکان دەکرد بە شێوەی ئیستقرایی و وردبوونەوە، واتە پراکتیکی زانستی هەموو ئەو بابەتانەی کە لە دووتوێی کتێبەکان بوون. بەتایبەتیش لە شرۆڤەکردنیان هێندە پێگەیشتوو بوو، لە هەموو هاوڕێکانی زانکۆی جیادەکرایەوە.

پێشینەی وەردی لە توێژینەوە دەگەڕێتەوە بۆ زانینی وانەی کۆمەڵایەتی کە پێشتر لە عێراق بەسەری سەپێنرابوو، ئەمە ڕێسایەك بوو وەردی لە تایبەتمەندی خۆی پشتی پێ بەستبوو. هەرچەندە ئامرازەکانی توێژینەوەی لە عێراق بەوەی ئەمریکا نەدەگەیشت، بەڵام لەو پراکتیزەکردنەیە لێیوە فێری وتنی هەقیقەتی تاڵ دەبێت لەبارەی نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکانەوە، تەنانەت ئەگەر لە دژی ئارەزووی خۆشت بێت. ئەرکی کۆمەڵناسیش ئەوەیە لە پانتاییەکانی خۆیدا دەستنیشانی دەرد و نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکان بکات.

## بڕوانامەکەی زانکۆ، مێژووەکەی، بابەتەکەی، ئەو مامۆستایانەی گەنگەشەیان کردووە

لە بیست و هەشتی ئابی ساڵی ١٩٤٨ عەلی وەردی بڕوانامەی ماستەری بە سەرکەوتنەوە بەدەستهێنا. وێنەی بڕوانامەکانی زانکۆی ئۆستن لەنێو پاشکۆی بەڵگەکانی ئەم کتێبە بڵاو دەکرێتەوە. سەرکەوتنەکەی پاداشتی خۆی دەبێت، زانکۆ دەرفەتی خوێندنی دکتۆرای پێ دەدا بۆ ماوەی دوو ساڵ، ئەگەر وەردیش خواستی هەبوو، ئەوا دەتوانێ بیکات بە چوار ساڵ.

سەیرترین شت کە لەبارەی ئەم سەردەمە لە وەردی گوێبیستی بووم ئەوە بوو: لە پشووی هاوین نەگەڕایەوە بەغدا، ئەمەش لە ترسی تووڕەیی باوکی، چونکە ئەرکی بەخێوکردنی منداڵ و هاوسەرەکەی بە ئەستۆی باوکی جێهێشتبوو! وتی پلانم دادەنا لە قوتابخانەکانی هاوینە لە بەریتانیا زمانی ئینگلیزی بخوێنم، پشووەکەی بەریتانیاش بۆ وەردی وانەیەکی دیکەی کۆمەڵایەتی بوو.

عەلی وەردی کاتێك دەچێتە بەریتانیا، تازە ئەم وڵاتە لە جەنگەکەی لەگەڵ هیتلەر سەرکەوتبوو، بە زۆرترین زیانەوە ئەگەر لەگەڵ هاوپەیمانەکانی بەراورد بکرێت. هەروەها ئەم وڵاتە زیاتر لە بیست ساڵ  بەربەستێکی سەخت بوو لە بەرامبەر ڕەوتی شیوعی، ئەمەش وەك بەرگرییەك بوو لە بەهاکانی ڕۆژئاوا لە دیموکراسی و ئازادی. عەلی وەردی بەریتانیای بینی برینەکانی سارێژ دەکرد و هەموو موڵکەکانی خۆی لە ئوسترالیاوە تا هیند بە زلهێزێکی نوێی جیهان دەفرۆشت، ئەویش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو. لە لەندەن عەلی وەردی ژوورێکی لە ماڵی پیرەژنێکی بەریتانی بەکرێ گرتبوو. یەکەمجار بوو وەردی شارەزای دابونەریتی بەریتانییەکان دەبوو کە تەواو جیاواز بوو لە ئەمریکییەکان. لەوێ کاتێك وەردی بەیانیان بۆ قوتابخانەی زمان و ئێوارە بۆ دیداری هاوڕێیەکانی دەڕۆیشت، کڵاوەکەی وەك سڵاوکردن بۆ بەساڵاچووەکانی گەڕەکە کۆنەکەی لەندەن بەرزدەکردەوە.

لەم شانشینە دێرینەدا، ئەو ژنەی خاوەن ماڵەکەی بوو سەرسامی دەکات، کاتێك ناڕەزایی دەردەبڕی لەوەی عەلی وەردی کڵاوی بۆ پیرەژنێك بەرزکردۆتەوە کە لەسەری گەڕەکە، وەردیش سەرسام دەبێت و پرسیاری لێدەکا: بۆچی کڵاوی بۆ بەرز نەکەمەوە؟ ئەی

ئەمە ئاكارێكی خوازراوی ئێوە نییە؟ ژنانی هەموو گەڕەكەكە بە ئاماژەی سەر وەڵامی سڵاوەكەم دەدەنەوە! ژنەكەش دەڵێ وایە، من تەنها نارەزاییەكەم بۆ ئەو ژنەیە كە لەسەری گەڕەك نیشتەجێیە، نەوەك بۆ هەموو ژنان، چونكە ئەو ژنە شەریف نییە! وەردی زەردەخەنەیەكی ڕۆژهەڵاتییانە دەكات گوایە لە ماناكە گەیشتووە!!

بەڵام پیرەژن بە هەستە ژنانەییەكەی لە نهێنیی زەردەخەنەكەی وەردی دەگات بۆیە دەڵێ: ئایا باوەڕ دەكەی كاتێك فڕۆكەی نازییەكان بۆردوومانی ئێمەیان دەكرد، ئەم پیرەژنە سەرسپییە مۆمەكانی ماڵەكەی نەدەكوژاندەوە، بۆ هەموو گەڕەكەكەی سەلماند كە ژنێكی بەئابڕۆ و شەریف نییە!!

وەردی سەرسام و پاشگەز دەبێتەوە، بەڵام درك بەو جیاوازییە دەكات كە لە نێوان بەریتانیا و عێراق لە پێوەری شەرەف هەیە. تا ڕۆژانی كۆتایی تەمەنی ئەم بەسەرهاتەی بۆ ئێمە دەگێڕایەوە و وانەیەكی پێ دەداین لە چۆنیەتی تێگەیشتن لە كەسانی دیكە. هەمیشە دەیگوت و دووبارەی دەكردەوە كە پێویستە بزانین ئەویتر چی لە تۆ دەوێت، بۆئەوەی بزانی چۆن گفتوگۆی لەگەڵ بكەیت، نەوەك تێگەیشتنی ئەو بەسەر بیرۆكەت زاڵ بكەیت.

وەردی وتی ئەو كاتەی سەردانی بەریتانیام كرد، هێشتا شەقامەكان پڕ بوو لە پروپاگەندەی جەنگ. لەوێ پۆستەرێكم بینی وێنەی پیاوێكی نەناسراو بوو، پەنجەی بۆ تەماشاكەری وێنەكە درێژ دەكرد، لەژێر وێنەكەش نووسرابوو (تۆ). سەرم لەو وێنەیە سوڕما، پرسیارم لە واتاكەی كرد، وتیان ئەو وێنەیە لەگەڵ هەر بەریتانییەك دەدوێ و پێی دەڵێ تۆ بەرپرسیاری لە بەرگریكردن لە وڵاتەكەت. تەنها (تۆ)

نووسرابوو. ئەمەی وت و دواتر بە گاڵتەکردنەوە پێکەنی و وتی" بەریتانییەکان دەڵێن ئەم وێنەیە بۆ بەرگیرکردن لە نیشتیمان زۆرترین سەرکەوتنی بەدەستهێناوە" (ئەم قسەیەی وەردی کاتێکە کە لە عێراق دەهۆڵی جەنگ دوای داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە لێ دەدرا) جا عەلی وەردی دەیگوت" سەیری ئەو برایەش بکە هەموو ڕۆژێك گۆرانییەکی نیشتیمانپەروەری هەیە و کەچی گەنجەکانیش لە جەنگ ڕادەکەن".

هەستم دەکرد، ئەم قسانە گرنگن، بە لەبەرچاوگرتنی کولتووری دێرینی بەریتانیا لەسەر هزری وەردی. ئەو زانستەی کە لە سەرچاوەوە لە ئەمریکا وەریگرتبوو، ئەوا پراکتیکەکەی لەسەر ئەرزی واقیعدا لە بەریتانیا بوو. بەتایبەتیش قەدەر یان ئەوەی خۆی بەرێکەوت ناوی دەبرد یاوەری بوو لەوەی تا ئاستێکی زۆر زانست و کولتوور لە سەرچاوە ڕەسەنەکانیان وەربگرێت.

وەردی گەڕایەوە ویلایەتە یەکگرتووەکان و زانکۆی دایك لە تێکساس، بۆ پێشکەشکردنی توێژینەوەی دکتۆراکەی. لەوێ مێژوونووس و و فەیلەسووفی کۆمەڵایەتی ئیبن خەلدون و بیروبۆچوونەکانی لەبارەی کۆمەڵناسییەوە کردە بابەتی تێزەکەی (ئیبن خەلدون لە نێوان ساڵانی ١٣٣٢ – ١٤٠٦ز ژیاوە، بە یەکێك لە زانایانی سەردەمی خۆی دادەنرێت لە بواری کارگێڕی و سیاسەت و دادوەری و ڕۆشنبیری و هونەردا. ئیبن خەلدون لە تونس لەدایك بووە، چەندین پۆستی لە مەڕاکیش و میسر وەرگرتووە. خاوەنی کتێبە بەناوبانگەکەیە، کە بە (المقدمة) ناسراوە) لە بەشی سێیەم بەوردی باسی ئیبن خەلدون دەکرێت وەك یەکێك لەو کەسایەتییانەی کە

دکتۆر عەلی وەردی پێیوە کاریگەر بووە.

دوای دوو ساڵ لە کۆششی زانستی بەردەوام، کە پێشتریش لێکۆڵینەوە و وردبوونەوەی بۆ کردبوو، لە ڕێکەوتی ١٩٥٠/٥/٨ ، تێزەکەی بە شێوەیەکی ئەکادیمی تەواو پێشکەش کرد. تێزەکەی جێگای سەرنج و پێزانینی مامۆستایانی بوو. ئەوەی مایەی سەرنجە لیژنەی تاوتوێکردنی نامەکەی لە هەشت کەس پێکهاتبوو لەگەڵ سەرپەرشتیارەکەی، لە پاشکۆی ئەم کتێبە وێنەیەکی نامەی دکتۆراکەی دەبینین کە ئیمزای هەر هەشت ئەندام و سەرپەرشتیارەکەی بەسەرەوەیە.

لیژنەکە بڕیاری دا بڕوانامەی دکتۆرا بە پلەی نایاب بە عەلی حوسێن وەردی بدات، بە فەرمیش لە ١٩٥٠/٧/٢٧ بڕوانامەکەی بەدەستهێنا. زانکۆ ڕێزی لێنا و پێشنیاری چاپکردنی تێزەکەشی کرد. ئەو تێکستەی خوارەوەم لە توێژینەوەکەی حللی و ڕەهیمی دۆزیوەتەوە، وەك خۆی دەگوازمەوە هەرچەندە زانیارییەکانی ناو ئەو تێزەم لە وەردی نەبیستووە" هەرکە وەردی بە شێوەیەکی فەرمی پلەی دکتۆرای بەدەستهێنا، زانکۆ دکتۆرایەکی فەخریشی پێ بەخشی، تەنانەت حاکمی ویلایەتی تێکساس نیشانەی لێهاتوویی لەسەر ئاستی ویلایەتەکەی بە وەردی بەخشی، ئەم نیشانەیەش بە هەموو کەسێك نادرێت تەنها ئەو توێژەرانە نەبێت کە داهێنانێکی زانستی دیار ئەنجام دەدەن. هەروەها زانکۆکەکە بڕوانامەیەکی ڕێزلێنان و یاداشتێك بۆ وەزارەتی مەعاریف دەنێرێ، تێیدا جەخت لەسەر پلە سەرنجڕاکێشەکەی عەلی وەردی دەکاتەوە کە بەدەستی هێناوە، تەنانەت تێزەکەی بەقەد سێ تێزی تایبەتی دکتۆرایە لە بوارەکەی

خۆیدا. تەنانەت بەوەندەش نەوەستاوە بەڵکو زانکۆ جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە تێزەکەی عەلی وەردی زێدەیەکی ڕاستەقینەیە بۆ کۆمەڵناسی". توێژەر و چاودێران دەتوانن دەقی تێزە چاپکراوەکەی وەردی ببینن، لەگەڵ ناوی سەرپەرشتیارەکەی لە میانەی یەك ژمارەدا. لەگەڵ وێنەیەکی کە لە پاشکۆی بەڵگەکانی ئەم کتێبەیە، بۆ ئاسانکاریی توێژەرانیش من لێرەدا ناونیشانی تەواوی تێزەکە دەگوازمەوە:

Sociological Analysis of Ibnkhaldun theory
Study in the sociology of knowledge
No. 00663962
Prof. Harry Moore
Of the sociology Department. University of Texas
The Chairman of the Sociology Department
Prof. Carl Rosonquist
Prof. Walter FIRES
At 08/05/1950

١٩٥٠/٠٧/٢٧

## گەڕانەوەی بۆ عێراق

وەردی بە بڕوانامە زانستییە بەنرخەکەی و ئەو ڕاسپاردە گرنگانەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی هێنابوو، گەڕایەوە عێراق. چوار ساڵی دووروودرێژ لە بەغدا و خێزانەکەی دوور بوو، منداڵەکانی لە ماڵی باپیرەیان گەورە بوون. چاوەڕوانی دیداری باوکێکی تووڕە لەو سەفەرە دووروودرێژە. وەردی دەڵێ" دوای ئەو دابڕانە یەکەم دیدارم لەگەڵ باوکم دۆستانە نەبوو، دیدارێکی گێژەلووکە ئاسا بوو، بە کەمتەرخەم تۆمەتباری کردم گوایە هەستی بەرپرسیارێتی خێزان و منداڵم نییە. ئێستا پێم وایە لەسەر هەق بوو!" بەڵێ بەمشێوەیە دوای

چل ساڵ بەسەر تێپەڕبوونی ڕووداوەکە دان بەوە دەنێت، دوای ئەوەی بە چاوی باوکێکی بەرپرسیار سەیری بابەتەکەی دەکرد.

وەردی ڕووداوی دیدارەکە تێدەپەڕێنێ، کە لە زەینیدا بە چەسپاوی مایەوە، بەڵام هێشتا کۆمەڵێك ئاڵەنگاریی دیکەی لەبەردەم بوو. عەرزوحاڵی پێشکەش بە زانکۆی بەغدا کرد، لە کۆلیژی ئاداب و زانستەکان لە ۱۹٥۰/۱۰/۳۰ بە ناونیشانی (مامۆستا) دامەزرا. (دەروونناسیی کۆمەڵایەتی) یەکەم کتێب بوو عەلی وەردی موحازەرەکانی خۆی لە کۆلیژی ئاداب و زانستەکان لەبارەیەوە دەدا.

داڵانەکانی کۆلیژ پڕ بوو لە دەنگە دەنگ و چرپە چرپ، هەموویان باسی ئەو کەسە نوێیەیان دەکرد کە بە بیرکردنەوەی زانستی سەرنجڕاکێش گەڕاوەتەوە، هەمووان بەدوای دکتۆر عەلی وەردی دەگەڕان کە بڕوانامەی بە پلەی ئیمتیاز لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەرگرتووە و کۆمەڵگای عێراقی و کەسێتیی تاکی عێراقی لە ڕووی دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە شی دەکاتەوە. تەنانەت موحازەرەکانی بۆتە بابەتێکی جەماوەری ئەوتۆ، قوتابیان لە سەرجەم کۆلیژ و بەشەکانی زانکۆ هەڵپەیان بۆ دەکرد.

## دامەزراندنی بەشی کۆمەڵناسی لە کۆلیژی ئادابی زانکۆی بەغدا

عەلی وەردی دەڵێ محەمەد فازڵ جەمالی ڕۆژێك بانگی کردووە (کەسایەتییەکی سیاسیی عێراقی بوو لە ساڵی ۱۹۰۳ لەدایك بووە و لە ساڵی ۱۹۹۷ کۆچی دوایی کردووە، بڕوانامەی دکتۆرای لە پەروەردە لە زانکۆی کۆلۆمبیا لە نیویۆرك بەدەست هێناوە لە ساڵی ۱۹۳۲.

بەڕێوەبەری گشتی مەعاریف بوو، سەرۆکی پشکنینی گشتی بوو، ئەندامی کۆڕی زانیاری عێراقی بوو، چەندین جار وەزیری دەرەوە بوو، دوو جاریش سەرۆك وەزیران بووە یەکەمیان لە ساڵی ١٩٥٣ و دووەم جاریش لە ساڵی ١٩٥٤ بوو) ئەم سیاسەتمەدارە عێراقییە کاتێك بانگی وەردی دەکات بۆ نووسینگەکەی پێشنیاری دامەزراندنی بەشی کۆمەڵناسی بۆ دەکات لە زانکۆی بەغدا. هەردووکیان بە ئامادەبوونی چەندین کەسانی پسپۆڕ تاوتوێی بابەتەکە دەکەن و عەلی وەردیش بەڵێنی پێدەدا توێژینەوەیەك بۆ کردنەوەکە ئامادە بکات.

وەردی لە ژێر ڕۆشنایی زانستی کۆمەڵناسی پلانی بۆ کردنەوەی بەشەکە دانا، کە ئەم زانستەش لەسەر بابەتی دیاردەی کۆمەڵایەتی دەوەستێ، دواتر تیۆرێکی ئیستقرایی لەسەر ئەم واقیعە دانا. دواتریش هەوڵی بۆ ئەوە دا، هەر ئەگەرێك پراکتیزە بکرێت کە لە ئایندەدا ڕوودەدات. بۆیە دەبێت کەسێك ئەو زانستە بخوێنێ لە کۆمەڵگاکەی و گۆڕان و کێشەکانی شارەزا بێت. وەردی دەڵێ پوختەی ئەوەی لە ئەمریکا وەریگرتبوو لە مەنهەجی بەشی کۆمەڵناسی دانا. سەرەڕای ئەمەش توێژینەوەی مەیدانی خستەپاڵ خوێندنی تیۆریی، هەرچەندە جێبەجێکردنی توێژینەوەی مەیدانی ئەوکات لە عێراق ڕووبەڕووی کێشەی گەورە دەبۆوە.

لەپێناو چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە و هەمەجۆرکردن و پێکهێنانی پسپۆرییەکان، وەردی پێشنیاری کرد بەشی کۆمەڵناسی لە سێ لق پێك بێت، هەرچەندە ئەوسات دروست نەبوو، بەڵام دواتر تەواو بوو، ئەوانیش بەشی کۆمەڵناسی و بەشی کاری کۆمەڵایەتی و بەشی ئەنثرۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی بوو. زیادکردنی دوو بەشەکەی دیکە

لەپێناو دانانی کرۆکی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی و خزمەتی کۆمەڵگا بوو، لەگەڵ ڕێکخستنی کۆمەڵگا، کەچی پێشنیارکردنی ئەنثرۆپۆلۆژی بۆ بایەخدان بوو بە توێژینەوەی مەیدانی لە کۆمەڵگا ناوخۆیی بە لادێ و شارنشینەوە، لەگەڵ گەڕان بەدوای دۆزینەوەی چارەسەریی بۆ کێشەکان.

هەرکە ساڵی خوێندنی ١٩٥٤ – ١٩٥٥ دەستی پێکرد، دامەزرانی بەشی کۆمەڵناسی لە کۆلێژی ئاداب و زانستەکان لە زانکۆی بەغدا ڕاگەیەنرا، وەردیش بە وەکالەت بووە سەرۆکی ئەم بەشە نوێیە. وەردی لە ٩ی شوباتی ١٩٥٣ لەبەر نووسینی نامیلکەی (کەسێتیی تاکی عێراق) و کتێبی (خوارق اللاشعور) نازناوی (پرۆفیسۆری یاریدەدەر) ی پێ بەخشرا. هەروەها ئەرکی کارگێڕی کەوتە سەر ئەستۆی وەردی، ئەو دوو جار بە وەکالەت کراوەتە سەرۆک بەش. دواتریش بۆ ماوەی هەفتەیەك بووە ڕاگری کۆلێژی ئاداب لە ١٩٦٠/٦/١٦. دواتر نازناوی (پرۆفیسۆر) ی بەدەستهێنا لە ١٩٦٢/٨/٦ دا، ئەرکی سەرۆکایەتی بەشی کۆمەڵناسی لە ١٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٣ پێ سپێردرا.

## خانەنشین کردن و پێدانی نازناوی (پرۆفیسۆری فەخری ) لێسەندنەوەی نازناوەکە

لە زانکۆی بەغدا لە ڕێکەوتی ١٩٧٠/٩/٢٧ نازنازی (پرۆفیسۆری فەخری) بە عەلی وەردی بەخشرا، ئەمەش ئەو ساڵە بوو کە تێیدا خانەنشین کرا (ساڵەکان لە توێژینەوەکەی ڕەهیمی و حللی وەرگیراوە) دواتر نازناوە زانستییەکەی لێ وەرگیرایەوە، ئێمە هەر لەم

کتێبەدا باسی بەسەرهاتی لێسەندنەوەی نازنازەکە دەکەین:

ژمارەی دەرچووانی بەشی کۆمەڵناسی لە کۆلیژی ئاداب
(١٩٥٩ – ١٩٧٠)

| ساڵی خوێندن | ژمارەی قوتابیان |
|---|---|
| ١٩٥٩–١٩٦٠ | ٣٢ |
| ١٩٦٠–١٩٦١ | ٢٥ |
| ١٩٦١–١٩٦٢ | ٢٢ |
| ١٩٦٢–١٩٦٣ | ٤١ |
| ١٩٦٣–١٩٦٤ | ٣٦ |
| ١٩٦٤–١٩٦٥ | ٢٨ |
| ١٩٦٥–١٩٦٦ | ٣٠ |
| ١٩٦٦–١٩٦٧ | ٣٦ |
| ١٩٦٧–١٩٦٨ | ٣٤ |
| ١٩٦٨–١٩٦٩ | ٣٧ |
| ١٩٦٩–١٩٧٠ | ٣٢ |

عەلی وەردی دوای حەسان و جەعفەر کە بەر لە سەفەرەکەی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان لەدایك ببوون، کچێکیان بوو بەناوی سەنا، ئەو ئێستا دایك و دەرمانسازە و لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٢ وەك جەعفەری برای لە دیمانەیەکی ڕۆژنامەوانی باسی کردووە بە داوای لێبوردنەوە. دوایین کوڕیش بەناوی فەیسەڵ لە ساڵی ١٩٥٥ لەدایکبووە، هەموو ئەم مێژووانەش جەعفەر باسی کردووە.

بەر لە خانەنشینی وەردی لە بواری ڕاگەیاندن دەرکەوتبوو، چونکە بەشداریی لە پرۆگرامی کۆڕی ڕۆشنبیری دەکرد کە پێشتر لە سەرەتای دامەزراندنی ئێزگەوە لەلایەن حسێن ئەمین ئامادە دەکرا تا ساڵی ١٩٥٩، دواتر لە ساڵی ١٩٦٠ لەلایەن سالم ئالووسی پێشکەش دەکرا. ئەوەی کۆمەڵگای عێراقی ئەو سەردەمی وروژاند ئەوە بوو وەردی یەکێك لە قوتابییە کچەکانی هێنابوو دەیگوت هەست بە نزیکبوونەوەی سێکسی ناکات لەگەڵ پیاوان، بەڵکو ئارەزووی ژنان دەکات. وەردی ئەمەی لە ڕووی زانستییەوە شرۆڤە کرد گوایە ئەمەی بەسەر ئەو ژنە هاتووە گوناهی خۆی نییە، بەڵکو پێکهاتەی بوونی ئاوەژوو بووە!

## چالاکییە زانستییەکانی.... مامۆستای میوان لە زانکۆی وارشۆ

وەردی لە کارە زانستییەکانی نەوەستا، وەك مامۆستایەك لە پەیمانگای عەرەبی بۆ خوێندنی باڵا موحازەرەی دەدایەوە. هەروەها فایلی وەردی لە کۆلیژی ئاداب پێمان دەڵێ وەردی زنجیرەیەك موحازەرەی لەبارەی کەسێتیی تاکی عێراقی و سروشتی کۆمەڵگای عێراقی و دەروازەی کۆمەڵناسی داوە (نامەی زانکۆی پۆڵەندا ئاڕاستەی دکتۆر عەلی وەردی کراوە و داوای لێ دەکات مامۆستایەکی وانەبێژ بێت لە زانکۆکەیان لە سەرەتای ١٩٧٩ ، هەروەها ڕاگری پەیمانگای توێژینەوەی ڕۆژهەڵاتی لە زانکۆی پۆڵەندا، پێی دەڵێ هەر کاتێك بیەوێ دەتوانێ بچێتە پۆڵەندا و سەرپشکیشە لە گوتنەوەی موحازەرەکان... ئەوانیش چاوەڕوانی وەڵامی داواکەی عەلی وەردی دەکەن، لەنێو بەڵگەکانی ئەم کتیبە نامەکە هەیە.)

عەلی وەردی لەلایەن چەندین زانکۆ و ناوەندی توێژینەوەی جیهانی

داوای وانەبێژی لێ کراوە، ئەمەش چەند چالاکییەکی زانستییە کە لە فایلەکەدا هەیە، شوێنی موحازەرەکە و ناونیشان و مێژووەکەی دەردەخات:

**بەشدارییە زانستیەکانی دکتۆر عەلی وەردی لە دەرەوەی عێراق ١٩٥٣ – ١٩٨٨**

| ژمارە | ولات | شوێنی موحازەرە | مێژووەکەی | ناونیشان |
|---|---|---|---|---|
| ١ | لوبنان | دامەزراوەی روکفلر | ١٩٥٣/٣/٢٨ | سروشتی کۆمەڵگای عەرەبی |
| ٢ | سووریا،لوبنان، ئێران، تورکیا | چەندین زانکۆ | ١٩٥٧/٨/٣١ | چەند موحازەرەیەکی جۆراوجۆر لەبارەی کۆمەڵناسییەوە |
| ٣ | چین | زانکۆی پەکین | ئابی ١٩٥٨ | چین لە کولتووری عەرەبی |
| ٤ | ئێران | زانکۆی تاران | ١٩٦٠/٦/١٧ | چەند موحازەرەیەك سەبارەت بە کۆمەڵناسی |
| ٥ | میسر | سەنتەری نەتەوەیی بۆ توێژینەوەی کۆمەڵایەتی | ١٩٦١/١١/٢٥ | موحازەرەیەك سەبارەت بە ئیبن خەلدون |
| ٦ | میسر | پەیمانگای باڵای توێژینەوەی عەرەبی | ١٩٦٢ | موحازەرەیەك لەبارەی لۆژیکی ئیبن خەلدون |
| ٧ | سویسرا | زانکۆی ژنێڤ | ١٩٦٦/١٢/٢٦ | موحازەرەیەکی گشتی سەبارەت بە کۆمەڵناسییەوە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٨ | میسر | زانکۆی قاهیرە | ١٩٦٧ | دەروونناسیی پیشەیی |
| ٩ | کوێت | زانکۆی کوێت | ١٩٦٨/٤/١٨ | موحازەرەیەکی گشتی سەبارەت بە کۆمەڵناسییەوە |
| ١٠ | پۆڵۆنیا | زانکۆی وارشۆ بەشی توێژینەوەی ئیسلامی | ١٩٨٤/٣/١ | سەبارەت بە تیۆری ئیبن خەلدون لە کۆمەڵناسی |
| ١١ | پۆڵۆنیا | زانکۆی وارشۆ | تشرینی یەکەمی ١٩٨٤ | ئیسلام و بیابانشینی |
| ١٢ | پۆڵۆنیا | زانکۆی وارشۆ | ١٩٨٥/٤/١٢ | شارستانیەتی عەرەبی و کۆمەڵگای عەرەبی |
| ١٣ | پۆڵۆنیا | زانکۆی وارشۆ | ١٩٨٧ | موحازەرەیەکی گشتی سەبارەت بە کۆمەڵناسی |
| ١٤ | پۆڵۆنیا | پەیمانگای توێژینەوەی رۆژهەڵاتی | ١٩٨٨ | موحازەرەیەکی گشتی سەبارەت بە کۆمەڵناسی |

کەچی دوای ساڵی ١٩٨٨ رێگەی سەفەرکردن لە وەردی قەدەغە کرا، تا ساڵی ١٩٩٢ کە ئەو کاتەش توانای ئەنجامدانی هیچ سەفەرێکی نەمابوو، چونکە تەندروستیەکەی هاوکار نەبوو تا سەفەر بۆ شوێنێك بکات. تا دوایین سەفەری کە لە ساڵی ١٩٩٥ بوو بۆ چارەسەری بەرەو عەممان رۆیشت (لە دووتوێی ئەم کتێبە دێینە سەر باسی رێگرتن لە سەفەر و دواتر پاشگەزبوونەوە لە رێگرتنەکە و سەفەری چارەسەرکردن).

وەك تێبینی دەكەین هەموو گەشتەكانی دكتۆر عەلی وەردی لە دوای ساڵی ١٩٨٤ ەوە، تەنها بۆ بەشی عەرەبی زانكۆی وارشۆ بووە. لە بەختەوەرییم جارێكیان بۆ باڵوێزخانەی وارشۆ بۆ وەرگرتنی ڤیزا یاوەریم كرد، بینیم كاتێك باڵوێز زانی وەردی لە پرسگە وەستاوە، هاتە پێشوازی وەردی و ئێمەی لە نووسینگەكەی خۆی دانا تا كارەكان تەواو بوو. ئەوكاتە زانیم دكتۆر عەلی وەردی وەك مامۆستایەكی وانەبێژ و میوان هەموو هاوینێك دەچێتە زانكۆی وارشۆ. هەر كاتێكیش دەچێ ناوەندە زانستییەكانی پۆڵەندا پێشوازی لێدەكەن. ڕۆژنامەیەكی عێراقی ڕۆژێكیان پرسیاری لەبارەی نهێنیی سەفەرە بەردەوامەكانی عەلی وەردی كرد بۆ پۆڵەندا، ئەویش وەڵامەكەی بەمشێوەیە بوو: " لەڕاستیدا پەیوەندیم لەگەڵ زانكۆی وارشۆ زۆر كۆنە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٢ . ئەوكاتە بوو لە كۆنگرەی ئیبن خەلدون بەشدار بووم كە لە قاهیرە بەسترابوو. یەكێك لە بەشداربووەكانی كۆنگرەكە پرۆفیسۆر بیلۆڤیسكی بوو، كە سەرۆكی بەشی عەرەبی بوو لە زانكۆی وارشۆ. لە میانەی كۆنگرەكە یەكترمان ناسی، لەو كاتەوە پەیوەندی نێوانمان بەهێز بووە. لەبیرمە لە ساڵی ١٩٧٥ سەردانی عێراقی كرد، ئەمەش لەسەر بانگهێشتی وەزارەتی ڕاگەیاندنی عێراقی بوو. منیش لە چەندین گەڕانی ناوخۆی عێراق یاوەری بووم. هەروەها توانیم ئەم پیاوە بۆ ناو مەرقەدی پیرۆزی كازمیە بەرم. ئەو دەیتوانی بە عەرەبی قسە بكات، ناوم نابوو شێخ یوسف، كەس بەرەنگاری نەبۆوە. ئەو هێشتا ئەو ڕووداوەی بیرماوە و وەك بەسەرهاتێكی خۆش دەیگێڕێتەوە. شایەنی باسە بیلۆڤیسكی قورئانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی پۆڵۆنی. بەم نزیكانە

بڵاودەکرێتەوە. ئێستا ئەو سەرۆکایەتی بەشی عەرەبی دەکات لە زانکۆی وارشۆ، ئەمەش لەبەر گەورەیی تەمەنەکەی، کراوە بە سەرۆکی فەخری، یەکێك لە قوتابییەکانی لە شوێنی ئەو کراوەتە سەرۆك بەش، ئەویش پرۆفیسۆر دانیتسکی یە. ئەم سەرۆکە نوێیەش سەردانی عێراقی کردووە، لە چەندین گەڕان یاوەرییم کردووە، ئەویش هاتە کازمیە، دانیتسکی وەك عەرەبێك بە زمانی عەرەبی دەدەوێ، عەرەبی خۆشدەوێ و پەرۆشی کولتووری عەرەبییە.

بەهەرحاڵ بەشی عەرەبی زانکۆی وارشۆ، جا لە سەردەمی سەرۆکە کۆنەکەی بێت، یان سەرۆکە نوێیەکە، لەگەڵ من تەبان، زۆرجار بانگهێشتم دەکەن بۆ ئەوەی لە هەندێك کاری ئەکادیمی بەشداربم، بەتایبەتی لیژنەی سەرپەرشتیاری ئەو ماستەر و دکتۆرایانەی کە بە زمانی عەرەبی دەنووسرێن. ئەمساڵیش بانگهێشتیان کردم، ئەمساڵ مانەوەم لە ساڵانی دیکە زیاتر بوو. ئەمەش بەهۆی کێشەیەك بوو بەسەر یەکێك لە قوتابییەکان هاتبوو، کە خەڵکی وڵاتی میسر بوو. ئەم قوتابییە تێزێکی نووسیبوو بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆرا، منیش لە لیژنەی سەرپەرشتیاری تێزەکە بووم، من بۆچوونێکی دیارکراوم هەبوو، جیاواز بوو لە بۆچوونی ئەندامانی دیکە. دواتر کێشەکە ئاڵۆز بوو، لێرەدا دەرفەتی باسکردنی نییە. سوپاس بۆ خوا توانیم بەهێمنی لە کێشەکە دەربازم بێت، بە ئاسوودەیی ویژدان گەڕامەوە نیشتیمان".

شێخ سەلیم جبووری یەکێك لە بەڵگەکانی ئەمنی عامی پێداوم، بەڵگەکە ئەوە دەسەلمێنێ ئاگاداری وەردی کراوەتەوە لە موحازەرەکان ئاگاداری خۆی بێت، ئەمەش تەواوی زانیارییەکانی

بەڵگەکەیە: ( لە وەزارەتی ناوخۆ – بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی عام – ژمارە ٤٥س / ٦٦٤٣٦ لە ڕێکەوتی ١٩٧٩/٤/٣٠ ، بابەت نهێنی، ئاراستەی بەڕێوەبەرایەتی توێژینەوە و پێشخستن کراوە.. تێیدا هاتووە: تکایە ئاگاداری دکتۆر عەلی حسێن وەردی بکرێت لەوەی ئاگای لە موحازەرەکانی بێت، خۆی لە باسکردنی ئەو شتانە بەدوور بگرێت کە خەڵکانی دیکە لێی سوودمەند دەبن و هەڕەشە لەسەر ئاسایشی ناوخۆ دروست دەکات – مەبەست لە موحازەرەکانی پۆلۆنیایە) تکامان هەیە... ئیمزای بەڕێوەبەر ٤٥ . ئەم بەڵگەیەش لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا هەیە".

نازانم چۆن ئاگادارکردنەوەکە بە دکتۆر عەلی وەردی دراوە، ئایا بانگی باڵەخانەی ئەمن کراوە، لەبەر ترسناکی بابەتەکە و پەیوەستبوونی بە شێوەیەکی ترسناك بە ئاسایشی ناوخۆ. یان ئاگادارکردنەوەکەی بۆ ڕەوانەی ماڵەوە یان زانکۆ کراوە. شێخ سەلیم جبووری بەڵگەکانی دیکەی نیشان نەدام، بۆ ئەوەی لەوە وردببمەوە کە چۆن ئاگاداری وەردی کراوەتەوە.

با بگەڕێینەوە سەر بابەتەکەمان، کە لەسەر خانەنشینکردنی وەردی وەستاین لە ساڵی ١٩٧٠. زانکۆی بەغدا جارێکی دیکە لە ساڵی ١٩٨٩ وەردی بیرکەوتەوە، بەڵام ئەمجارەیان نازناوی (پرۆفیسۆری فەخری)یان لێ وەرگرتەوە، هەروەها کڕین و فرۆشتنی کتێبەکانی لە بازاڕ قەدەغە کرا. لە بەشی چوارەم خوێنەر ئەو هۆکارە سیاسییانە دەبینێ کە بەرە بەرە ڕێگری لە عەلی وەردی کراوە، دوای ئەوەی بۆ سەرانی ڕژێمی عێراقی دەرکەوت کە بیروبۆچوونە کۆمەڵناسییەکانی سەرۆك لەگەڵ بۆچوونەکانی وەردی یەك ناگرێتەوە!

لێرەدا پشت بە دیمانەیەك دەبەستم، کە لەلایەن باهیرە شێخلی لە سایتێك لەگەڵ سەلام شەماعی ڕۆژنامووس ئەنجام دراوە. سەلام ماوەیەکی زۆر یاوەری وەردی بووە، چەند وتارێکی وەردی لە ڕۆژنامەی جمهوریە و گۆڤاری ئەلف با بڵاوکردۆتەوە. جا لە دیمانەکەدا سەلام شەماع وەڵامی پرسیاری چەوساندنەوەی وەردی دەکات لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە. سەلام دەڵێ" هێندەی من بزانم تەنانەت ئەو مێزە تایبەتەشیان هەڵگرت کە لە بەشی کۆمەڵناسی کۆلیژی ئاداب تایبەت بوو بە وەردی. نەریتێك لە زانکۆی بەغدا هەبوو، هەر کەسێك پلەی (پرۆفیسۆری فەخری) ی هەبووایە، ئەو مێزەکەی تایبەت دەبوو، لە دوای ئەویش هەڵنەدەگیرا نەدەبوو کەس بەکاری بهێنێ. پرۆفیسۆرەکە خۆی هەر کاتێك دەیویست دەیتوانی بەکاری بهێنێ، ئەمەش وەك ڕێز و پێزانین بوو بۆ خزمەتە زانستییەکەی. جگە لەمەش لە کۆڕ و کۆبوونەوەکان بانگهێشتی وەردی نەدەکرا، وەك چۆن بانگهێشتی پرۆفیسۆرەکانی دیکە دەکرا. ئەگەر ئەو نامەیە بخوێنیتەوە، کە وەردی ئاراستەی تەها نعێمی سەرۆکی زانکۆی کردووە لە بەرواری ١٤/٩/١٩٨٩، کە بە دەسخەتی وەردی لە کتێبەکەم بڵاوکراوەتەوە، تەنها لەبەر شێواز و گلەییەکەی وەردی دڵتەنگ دەبیت. بەتایبەتی لە کۆتایی نامەکەیدا هاتووە" بەڕێزم سەرۆکی زانکۆ... من بەلامەوە گرنگ نییە پرۆفیسۆری فەخری بم، یان خانەنشین، هەردووکیان بۆ کەسێکی وەك من کە لە ڕۆژانی دوایی تەمەنیەتی وەك یەکە. بەڵام ئەوەی بەلامەوە گرنگە ڕاستیەکە بزانم، من لە بەرگی ئەو کتێبەی لە ساڵی ١٩٧٠ دەرچووە نووسراوە – لەسەر داوای خۆی خانەنشین کراوە – من پرۆفیسۆری فەخرییم،

لەوانەیە لە دوایین ڕۆژەکانم کتێبی دیکەم دەربچێ. تکایە ڕاستیەکەم بۆ دەربخەیت، بۆ ئەوەی بۆ خوێنەرانی ئاشکرا بکەم، فێڵیان لێ نەکرێت. بەهەرحاڵ خودا پەنامانە".

ئەمە ڕێزی زانکۆی دایك بوو لە بەغدا، کە وەردی بەدەستی هێنا. نعێمی سەرۆکی زانکۆ وەڵامی نامەکەی وەردی نەدایەوە، چونکە دەیزانی وەردی بۆ مێژوو دەنووسێت، نەوەك ئێستا. هەمیشە پێشبینی ئەوە دەکەم سەلام شەماع پەیوەندی گرژی نێوان وەردی و ڕژێم ئاشکرا بکات.

## هاتنی وەردی بۆ نێو مەجلیسە ئەدەبییەکان

لەوەتەی بەغدا هەیە، کۆڕ و مەجلیسی ئەدەبی تێدا سازدەکرێت. ئەمەش تایبەتمەندییەکە لە پایتەخت و شارەکانی دیکە نییە. ئەبو حەیانی تەوحیدی لە کتێبی (الامتاع و المؤانسة) باسی کردووە، ئیبن قوتەیبە لە (عیون الاخبار) باسی ئەو کۆڕ و دانیشتنە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییانەی کردووە کە ڕۆشنبیریی عەرەبییان دەوڵەمەند کردووە، ناکرێت دەستبەرداریان بین. جگە لەمانەش لە کتێبی (الاغاني) ئەبو فەرەجی ئەسفەهانی و (العقد الفرید)ی ئیبن قوتەیبەی ئەندەلوسی باسی مەجلیسە بەغدایییەکان کراوە لە سەردەمی گەشەسەندووەکەیدا. بەڵام لە سەردەمی عوسمانییەکان ئەم مەجلیسانە ناوێکی نوێی وەرگرتووە، ئەویش (قبولات)ە. بە زمانە لۆکاڵییەکە کە کاریگەری تورکی بەسەرەوە بووە، تاکی وشەکەی (قبوله) یە بە مانای پێشوازی دێت، ئێستا خەریکە ئەم وشەیە نامێنێ.

هەندێك بنەماڵەی دەوڵەمەند و خانەوادەی ئەدەبی لە بەغدا، هەر کەسە بەپێی ئاڕاستە و مەیلی خۆی مەجلیسیان دادەنا، لەوێ ئەدیب و نووسەران بەیەکتر دەگەیشتن، لەوانەش سیاسییەکان بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان ئامادە دەبوون. وەك نەریت بوو لەو مەجلیسانە باسی بابەتی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی تەنانەت بابەتی سیاسیش دەکرا بەپێی ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتییەی کە دەڕەخسا.

دکتۆر عەلی وەردی پەروەردەی ئەو مەجلیسانە بوو، یادەوەری خێزانەکەی بوو. ماڵی وەردی لە دوایین ڕۆژانی دەسەڵاتی عوسمانییەکان و سەرەتای دەسەڵاتی نیشتیمانی لە عێراق، مەجلیسێکی ئەدەبی دیاریان هەبوو. باپیرەی وەردی کە ناوی موحسین صایغ بوو دوو مەجلیسی هەبوو، بەیانیان لە دوکانەکەی، ئێوارانیش لە ماڵەکەی. بەناوبانگترین ئەو کەسایەتییانەی لە مەجلیسەکەی ئەودا ئامادە دەبوون: محەمەد سەعید حبوبی، شاعیر جابر کازمی، عەبدولباقی عەمری، باقر هندی و محەمەد جواد شەبیبی، حاجی عەلی مەحفووز ( باوکی دکتۆر حسێن عەلی مەحفووز).

وەردی لە هەرەتی گەنجیدا، ئامادەی مەجلیسی هەبەتودینی شەهرستانی دەبوو، کە ڕیفۆرمخواز و سیاسەتمەدارێکی ناسراوی عێراق بوو. وەردی لە سەرەتادا بە بیروڕای ئەم پیاوە کاریگەر بوو، لەم بارەیەوەشی نووسیوە. دواتر دکتۆری ئینسکلۆپیدیا ئاسا، مستەفا جەواد، وەردی لەگەڵ خۆی بردۆتە چەندین مەجلیسی بەغدا، لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا.

دوای ئەوەی وەردی لە هەموو ڕووێکەوە پێگەیشتوو دەبێت، ئەو

مەجلیسە ئەدەبییانە دەکاتە ماددەیەك بۆ توێژینەوەی کۆمەڵایەتی. ئامادەبوونی ئەو ڕەونەق و چالاکی زیاتری بە مەجلیسەکان دەدا، ئەمەش بەهۆی ئەو پرسیارانەی ئاراستەی ئامادەبووانی دەکرد بەتایبەتی لە کەسانی شارەزا. ئەو مشتومڕ و گفتوگۆیانەی ڕووی دەدا، قسەکردن لەگەڵ وەردی ماوەیەکی زۆر بەسەر زەین و هزر دەمایەوە لەوانە بوو بۆ ماوەیەکی زۆریش لە کۆمەڵگای ڕۆشنبیری بەغدا باس دەکرایەوە. بەتایبەتی ئەو مشتومڕانەی کە ئەو کات ڕووی دەدا، بەر لەوەی شانۆی ژیانی عێراق ببێتە شوێنی جەنگە بە کۆتا نەهاتووەکان. زەینی خەڵك بە بیرکردنەوەی ئەوە پەرتەوازە ببوو، کۆمەڵگای ئەوکات لە داڕووخاندایە. کارێکی سروشتیشە وەردیی کۆمەڵناس، ئەوە بۆ خەڵك دەربخات کە لەگەڵ زانست و قۆناغەکە یەك دەگرێتەوە. وەك خۆی دەیگوت، خۆی بلیتی ئەم پێشبینیانەی دابوو لە سەقامگیری دەروون و تەندروستی خۆیەوە، لە بەرامبەر دەسەڵاتێك کە باوەڕی بە بۆچوونی دیکە نەبوو.

مەجلیسی خوالێخۆشبوو مەکی سەید جاسم (١٩٠٥ – ٢٠٠١) لەدایکبووی شارۆچکەی شەتڕەیە، چەندین کتێبی تەحقیق کردووە، لەوانەش خولاسەی زەهەبی مسبوکی ئەربیلی، دیوانی الحیص و بیص، تلخیص البیان، مجازات القرانی شەریف ڕەزی و چەندین کتێبی دیکەش) بەلای عەلی وەردی ئەم مەجلیسە باشترین بوو. کۆمەڵێك لە ڕۆشنبیران لەو مەجلیسە ئامادە دەبوون، بەشێکیان بۆچوونی وەردییان قبووڵ دەکرد، هەندێکیشیان بە توندی پێچەوانەی بۆچوونەکانی وەردی بوون. بەیانیانی هەینی لە ناوچەی مەنسووری بەغدا ئەنجام دەدرا. مەجلیسێکی دیکە هەبوو کە دکتۆر عەلی وەردی

هاموشۆی دەکرد، ئەگەر سەفەر و نەخۆشی نەبووایە، ئەوا هەمیشـە ئامادەی دەبوو، ئـەویش مەجلیسـی عەبدولحەمیدی هـیلالی بـوو لـە وەزیرییە. لەوێ شەقامێکی فـراوان ناوچـەی ئەعزەمیـە کـە وەردی تێیدا دەژیا، لەگەڵ ناوچەی وەزیرییەی لەیەکتر جیا دەکردەوە. بۆیە وەردی پێویستی بەوە نەبوو بە ئۆتۆمبیل بگات، بەڵکو بەیانی هەینی ڕێگای دەگرتە بەر ئەمەش وەك وەرزشێك بوو، بۆ دیداری دۆسـتان، لەگـەڵ گفتوگـۆکردن لـەبارەی خـەم و باسـی ئـەدەب و سیاسـەت. زۆربەی ئامادەبووانی مەجلیسەکان هاوتەمەنی خاوەن مەجلیسەکان بـوون، سیاسـەت باسـی یەکـەمیان بـوو. بـەناوبانگترین ئـەو کەسایەتییانەی وەردی بە دیداریان دەگەیشت ئەمانە بـوون: دکتـۆر عەلی سافی (وەزیری پێشـوو)، دکتـۆر ڕاجـی تکریتـی و لیـوا جاسـم مـوخلس (لـە سـەروبەندی ئـەوەی بـە پیلانگێـڕی ناسـرا لـە ١٩٩٥ لەسێدارە دران) دواتر مەجلیسەکە داخرا و خاوەنەکەشی لە کۆتـایی نۆهەدەکان کۆچی دوایی کرد.

چەندین مەجلیسی دیکەی بەغدایی هەبوون، کە وەردی حەزی لێیان بوو، تێیدا ئامادە دەبوو و موحازەرەی تێدا داوە. لەوانە مەجلیسی ئـال شـعرباف (کـۆنترین مەجلیسـی بەغدایـە)، لەگـەڵ مەجلیسـی عەبدولڕەزاق محێدین، مەجلیسی مونتەدای ئەبو حەنیفە نعمـان ئـەو کاتـەی دکتـۆر ڕەشـیدی عوبێـدی بـەڕێوەی دەبـرد، مەجلیسـی هەبەتودین شەهرستانی لە کازمیە، دواتـر مەجلیسـی خوالێخۆشـبوو جـەوادی شەهرسـتانی کـە لـە نووسـینگەی جـەوادین لـە کازمیـە سازدەکرا، مەجلیسی مامۆستا محەمەد جەواد غەبان، مونتەدای بەغدا لە کازمیە، چەندین مەجلیسی دیکە، بە داوای لێبوردنەوە هەندێکیانم

بیرچووە.

## دامەزراندنی مەجلیسی ڕۆشنبیریی خاقانی

بەسەرهاتی دامەزراندنی مەجلیسی ڕۆشنبیریی خاقانی لەلایەن وەردییەوە لەو کاتەوە دەست پێدەکات، کە بەهادین خاقانی ئامۆزام ڕۆژێك پێی ڕاگەیاندم، ئەو یاوەری زیائەدینی خاقانی باوکی کردووە بۆ مەجلیسێك هەریەکە لە دکتۆر عەلی وەردی و حوسێن عەلی مەحفووز تێیدا ئامادە دەبن، وتیشی خاوەنی مەجلیسەکە کە مامۆستا محەمەد جەواد غەبانە، هەواڵی عیسا خاقانی باوکمی پرسیوە. ئەمەش لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٨٨ بوو. خوا یار بوو لەوەی باوکم هاتە عێراق، ئەو کاتەش مامۆستا مەحفووز سەردانی ماڵەکەی ئێمەی کرد بۆ بەسەرکردنەوەی باوکم کە زۆر لە عێراق نامێنێتەوە. لەبەر ئەوەی من زۆر پەرۆش بووم بۆ ئامادەبوون لەو مەجلیسەی بەهادین بۆی باسکردبووم. بە ئامادەبوونی مامۆستا مەحفووز پرسیارم لەبارەی خاوەن مەجلیسەکە کرد، کە باوکم دەناسێ. ئەوکاتە زانیم مامۆستا محەمەد جەواد غەبان، لە قوتابخانەی سەرەتایی نەجەف مامۆستای باوکم بووە، باوکیشم بەپەرۆش بوو بۆئەوەی سەردانی مامۆستاکەی بکات کە لە سەرەتایی وانەی زمانی عەرەبی پێ گوتووە. چووینە مەجلیسەکەی مامۆستا محەمەد غەبان لەوێ بۆ یەکەمجار ڕووبەڕوو دکتۆر عەلی وەردیم بینی. من پێشتر هەندێك لە کتێبەکانی وەردیم، بە مێژوویی و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و پاراسایکۆلۆژی خوێندبۆوە. بەر لەوەی مەجلیسەکە کۆتایی بێت، باوکم ئەوانی بانگهێشتی ماڵەوە کرد بۆ نانخواردن کە زۆربەی خواردنەکان خۆی ئامادەی کردبوو.

سەردانی مامۆستا مەحفووز و عەلی وەردی و سەلام شەماع ڕۆژانە لەسەر داوەتی باوکم بە شێوەی نانخواردن و عەسرەپا و چاخواردنەوەی ئێواران دووبارە دەبۆوە. دانیشتنەکە بە مشتومڕی زانستی و ڕۆشنبیری و ئایینی گەرم دەبوو. لە بەختەوەریی من، ڕۆڵێکی سەرەکیم لە ئامادەکاریی ئەم داوەتانە هەبوو. ڕۆڵەکەم ئەوەبوو بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆم میوانەکان بگەینمە ماڵی خۆمان و دواتریش بۆ ماڵەکانی خۆیان بیانگێڕمەوە. هەمیشە بە ئەنقەست دکتۆر عەلی وەردیم تا دوایین کەس لە ئۆتۆمبیلەکەم دەهێشتەوە، بۆ ئەوەی ئەمە بکەمە دەرفەتێك تا بەتەنیا لەبارەی ناوەڕۆکی کتێبەکانی قسەی لەگەڵ بکەم. هەر ئەمەش بە خەیاڵی گەنجێك دێ کە تەمەنی هێشتا نەگەیشتۆتە بیست و پێنج ساڵ، بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستیی زانایەك کە بۆ دەروازەی کۆتایی دەڕوانێ نەوەك ئایندەیەکی گەش، کە گەنجێك چاوی تێ دەبڕێ. من ئێستا بڕوام وایە لەلای وەردی مامۆستام پەسەند بووم، بۆیە بەرە بەرە زانست و ڕۆشنبیریم لێ وەردەگرت.

دوای ئەوەی باوکم سەفەری کرد، دیدارە ڕۆژانەییەکان لەگەڵ وەردی هەر مابوو. سەلام شەماع هۆکارێکی سەرەکی بوو لە بەردەوامبوونی. سەلام دوای تەواوبوونی دەوام و گەڕانی بە مەجلیسەکان، ئۆتۆمبیلەکەی منی دەستدەکەوت، بۆ ئەوەی بیگەیەنێتەوە ماڵ. تا وایلێهات دیدارەکان ڕۆژانە و ڕۆتینی دەبوون، تەنانەت وەردی لە ئەعزەمیەوە بەرەو کازمیە بە پێ دەهات، ماوەیەك لە دوکانەکەی سەفا وەردی یان باسل خەزرەجی دەحەسایەوە کە لە دەرگای (دەروازە) بوو، دواتر دەچووە مەرقەدی کازمیە و بەشدار

دەبوو لە مەجلیسی کلیلدار عەباس شەبیبی و یان مەجلیسی جەواد شەهرستانی پارێزەر کە هەموو پێنج شەممەیەك لە کتێبخانەی (الجوادین) رێك دەخرا کە لەلایەن هەبەتودینی شەهرستانی دامەزرابوو. دواتر بەیەکەوە بەرەو ماڵی مامۆستا مەحفووز دەڕۆیشتین، ئەویشمان لەگەڵ خۆمان دەبرد بەرەو ماڵەکەی ئێمە دەچووین بۆ ئەوەی ئێوارە زانستی و ڕۆشنبیرییەکە لەگەڵ وەردی تەواو بکەین. چەندین کەسی دیکە لەگەڵمان بەشدار دەبوو، لەوانە مامۆستا زوهێر عامری، سەفا وەردی، عەبدولموتەلیب مەهدی پەیکەرتاش، مامۆستا باسل خەزرەجی، عەباس جەبار کازمی، نزار تاریق هەمەوەندی، ئەندازیار عیسا حوسێنی سەغیر کە ئەوکات قوتابی کۆلیژی ئەندازیاری بوو، هەندێك جاریش عەبدولحەمید سەغیر ئامادە دەبوو. دوای تەواوبوونی مەجلیسەکەش لە نیوەشەودا من هەریەکە لە دکتۆر وەردی و دکتۆر مەحفووز و سەلام شەماعم دەگەڕاندەوە ماڵەکانی خۆیان.

دوای ئەوەی ئەم دیدارانە زیاتر لە مانگێك بەردەوام بوو، وەردی فەرمانی وەستاندنی دا، فەرمانێك پاشگەزبوونەوەی نەبوو. مامۆستا مەحفووزیش ڕەزامەندی بۆ فەرمانەکە هەبوو. لەبەر ئەوەی دیداری ڕۆژانە نەك تەنها بۆ خاوەن ماڵ، بەڵکو بۆ هەمووان شەکەتییە. لەبری ئەوە دکتۆر وەردی پێشنیاری کرد، مەجلیسی ڕۆشنبیری و ئەدەبی خاقانی دابنرێت، هەفتانە تێیدا کۆببینەوە، ئەمەش بۆ کەمکردنەوەی فشار بەسەر هەموانەوە. بەم پێشنیارە زۆر دڵخۆش بووم، بەڵام دەبووایە ڕەزامەندی شێخ عیسای خاقانی باوکم وەربگرم. ئەویش بە بیستنی هەواڵەکە زۆر دڵخۆش بوو، پیرۆزبایی لێکردین، خودا لە

نزاکانی ئەو بێبەشم نەکات. کەچی مامۆستا مەحفووزی دانا، سێ مەرجی بۆ دامەزراندنی مەجلیسەکە دانا، داواشی کرد بە مەرجەکانی ڕازی بین، ئەوەبوو کە نابێت مەجلیسەکە گفتوگۆی وەهای تێدا بکرێت خەڵك لەیەکتر جیا بکاتەوە، لەوانە، یەکەم: ڕێگەنەدان بە قسەی تایفەگەری. دووەم: ڕێگەنەدان بە خۆهەڵکێشان بە نازناو و باسکردنی ناکۆکی سیاسی. سێیەم: ڕێگەنەدان بە باسکردنی بابەتی سێکس و هاوشێوەکانی، کە سەنگینی و ڕێزی مەجلیسەکە کەم دەکاتەوە. وەردی ڕەزامەندی بۆ مەرجەکانی دا، تەنانەت ستایشی کرد، چونکە ئەم قۆناغەی تێیدا دەژیاین بەرگەی ئەم جۆرە بابەتانەی نەدەگرت.

ئەو ڕۆژانەی کە بەر لە دامەزراندنی مەجلیسی خاقانی و دوای چەند مانگێکی دیکەش، کە لەگەڵ دکتۆر حسێن عەلی مەحفووز و عەلی وەردی کۆدەبووینەوە، چەند ڕۆژانێکی دەگمەن بوون، لە مێژووی عێراقدا ئەم چەند ساڵە پڕ سیاسەتە گرگرتووەی عێراق، بەخۆیەوەی نەدیوە. ئەو کات جەنگی عێراق – ئێران وەستابوو، کە هەشت ساڵی خایاندبوو، تازە لە ١٩٨٨/٨/٨ وەستابوو. جەنگە گێژەلووکەکەی کوێت هێشتا هەڵنەگیرسابوو. ئەمەش دەرفەتێکی ئازادی ڕەخساندبوو، هیچ عێراقییەك لەبیری ناکات کە لەو سەردەم ژیابێت.

دیداری یەکەمی دامەزراندنی مەجلیسی خاقانی لە ١٩٨٩/٣/٥ ئەمەش بۆ ڕاگەیاندنی مەجلیسی ڕۆشنبیریی خاقانی بوو، لە کازمیەی بەغدا. دواتر ڕاگەیاندنەکەی لە کۆڕی مەجلیسەکانی دیکە ڕاگەیاندرا، بەڵام کەس ئامادە نەبوو، تەنانەت مامۆستا غەبان ڕەزامەندی لەسەر دامەزراندنی مەجلیسەکە نەبوو، کە لەلایەن گەنجێکەوە سەرپەرشتی

بکرێت کە تەمەنی هێشتا نەگەیشتۆتە سی ساڵ. لەنێو ئەو پیرە پیاوانە، کەمی تەمەنم تووشی نائومێدی کردم، بەڵام وەردی فەرمانی کرد ئاڵەنگاری و بەردەوامیم هەبێت. وەك چارەسەرییەك بۆ ئەم کێشانە مامۆستا مەحفووز فەرمانی کرد سەلام شەماع مەجلیسەکە بەڕێوە ببات. هەندێك هەڵسوکەوت لە سەلام بینرا، هەندێك لە برایان لێی پەست بوون، بۆیە مامۆستا مەحفووز خۆی کارگێڕیی مەجلیسەکەی لە ئەستۆ گرت.

مەجلیسەکە خەریك بوو بەرە بەرە گەورەتر دەبوو بە هاتنی مامۆستا محەمەد حەسەن سەغیر و ڕۆژنامەنووسی گەورە سەجاد غازی، لەگەڵ ئەوەش دووەم نەقیبی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراق دوای جەواهیری دەهات، ئەویش نووسەر و ڕۆژنامەنووس فەیسەڵ حەسون بوو، لەگەڵ ئەوانیش مامۆستا حافز ئەبوکەلەل دەهات.

وەردی ئەستێرەی یەکەمی مەجلیسەکە بوو، مامۆستای دانا حوسێن عەلی مەحفووزیش کلیلی سەقامگیری بوو. هەرکە مەجلیسێکی ئەدەبی دادەخرا، یان مەجلیسێك لاواز دەبوو، ئەوا ژمارەی ئامادەبووانی مەجلیسی خاقانی زیاتر دەبوو. چەندین کەسایەتیی مەجلیسە ئەدەبییەکان لە مەجلیسی ئێمە ئامادە دەبوون، لەوانە دکتۆر عەبود بلداوی، دکتۆرخالد عوزی، مامۆستا عەبدولغەفار حەبیوبی، دکتۆر ئەحمەد تامر، مامۆستا یەحیا مانع، عەبدولغەنی حەبیوبی، دکتۆر موحسین شێخ ڕازی، غالب حاج فلیحی پارێزەر، مامۆستا و شاعیر عەلی حەیدەری. هەندێك لەو ناوانە کە بەهۆی هەڵوێستێکی نەخوازراو لە خاوەنی مەجلیسێك نیگەران

ببوون، لە مەجلیسەکە دابڕابوون، بە شێوەیەکی هەمیشەیی لە مەجلیسی خاقانی ئامادە دەبوون.

دوای ساڵێك لە دامەزراندن، وەردی فەرمانی کرد، کارگێڕییەکە بگرمە ئەستۆ. مامۆستای دانا حوسێن مەحفووزیش جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، فەرمانەکە بە ڕێکەوتنی هەردووکیانە. بۆیە من لەسەر مێزی کارگێڕی مەجلیسەکە دانیشتم هەر لە ساڵی ١٩٩٠ وە تا ساڵی ٢٠٠٣. هیچ کاتێك جێم نەدەهێشت تەنها ئەو کاتە نەبێت کە سەفەرم دەکرد، ئەو کاتەش بۆ یەکێك لەم دوو مامۆستا گەورەیە جێم دەهێشت مەهدی سەعید و شامل شەمەری، یانیش بۆ ڕەفعەت سەفاڕ. لەنێو مەجلیسەکانی بەغدا مەجلیسی خاقانی ناوبانگی پەیداکرد، سنوور و ئاسۆکانی تێپەڕاند. چاکەی یەکەمی ئەمەش بۆ مامۆستا مەحفووز دەگەڕێتەوە کە پلانی ئایندەی دادەنا و بۆنەکانی پێشنیار دەکرد. دووەم بەهۆی بوونی وەردییەوە بوو، کە چەندین بابەتی دەورووژاند لە مەجلیسەکانی دیکە نەبوو. سێیەم و گرنگترین هۆکاریش ئامادەبوونی چەندین کەسایەتیی دیکە بوو، کە دوای ساڵێك یان دوو ساڵ دوای دامەزراندن ئامادە دەبوون، لە ساڵانی دواتر کاریگەریان هەبوو، لە نموونەی شاعیری گەورە ڕازی مەهدی سەعید و نووسەر حاجی عەباس عەلی مەندەلاوی، حەیدەر سەید ئیسماعیل سەدر، عەبدولموتەڵیب ئەعرەجی، و یەحیا مانع و دکتۆر ئەحمەد تامر، مامۆستا ئیحسان دەباغ و مامۆستا عەبدولهادی بلیبل و مامۆستا ڕیاز هادی عۆدە و مامۆستا هادی شینە و دکتۆر یەحیا بوکا، ڕەئووف کەمنە، عەبدولحسین ڕەفیعی. ئەمە و سەرەڕای چەندین کەسایەتیی دیکە وەك: شامل شەمەر، نیعمە عەزاوی، محەمەد ڕەزا

قاموسی، ڕەفعەت سەفاڕ، حەمید مەجید هدۆ، عەلی تـایی، سـەلمان قەیسی، عەبدولڕەحیم بەلداوی، ڕەئوف سەفاڕ، ساڵح مەهدی هاشم، عەبدوڵلا سودانی، عەبدولموتەڵیب عەبود، سەلام شەماع، عیسا عیسا، محەمەد عەلی حەمزە، عەبدولئەمیر وەرد، عەلی جـەلیل وەردی، داود ڕەحمانی، کازم سەلامی، عامر ئەنباری، ڕەشـاد ئیبراهیمـی، مـونزڕ تامر، ناسر تامر، عەدنان بەلداوی، محەمەد ئەمین ئەسەدی، عەباس شەدیدی، هاتف عەزیز (مامۆستای زمـانی ئینگلیـزی بـوو، یاداشـتی ڕۆژانـــەی مەجلیســـەکەی دەنووســـی، هیــوادارم ئـــەو نووســـینانەی پاراستبێ)، هەروەها جەواد شـەیبانی، عـەلی کـەنانی، عەبدولکـەریم دەباغ، هاتف عەتەبی. هەروەها مەجلیسەکە سـەرنەدەکەوت ئەگـەر هەڵوێستی جوامێرانەی هاوڕێیەکانم نەبووایە، کە زۆربـەیان قوتـابیی زانکـۆ بـوون. کـە کـاتێکی زۆریـان بـۆ ڕێکخسـتنی مـەجلیس و ئامادەکاریی بۆ میوانەکان ڕێك دەخست. ئەوەی بیرم بێت ئەم برایانە بوون: عەبدولعال حاتم بـەغلانی، مەهـدی موسـەوی، عیسا سـەغیر، عەباس کازمی، نزار هەمەوەندی، ناسر ئەسەدی، هاشم کەعبی، تاڵب زەیـدی، ماجـد کـەنعان، سـادق جـەزایری، مـەکی مەجیـد ڕەشـید، خوالێخۆشبوو سامی عەلی ئیمارە کـە خـەڵکی دیالـە بـوو، مامۆسـتا ئەحمەد هاتف، خوا ئاگاداریان بێت، لە هەر کوێیەك بن، بە هـەزاران چاکەیان بەسەرمەوە هەیە.

بابەتێکی گرنگتر هەیە شایەنی باسکردنە، کە ڕۆڵی لە بەردەوامی و سەرکەوتنی مەجلیسەکە هەبوو، لەوانە پاڵپشـتێکی گـەورە لەلایـەن ماڵە گەورەکانی کازمیەوە لە مەجلیسەکە دەکرا، لەوانە کەسایەتی و پیاوماقولان مەجلیسـەکەیان بـە مەجلیسـی خۆیـان دەزانـی. تـا

حاڵەتەکە بەوە گەیشت، مەجلیسەکە دانیشتنی تایبەتی لە دەرەوەی ڕۆژە فەرمییەکانی خۆی ئەنجام دەدا، ئەمەش بۆ تاوتوێکردنی ئەم بابەتە کۆمەڵایەتییە گەورانەی پەیوەندی بە کۆمەڵگا و خەڵکەوە هەبوو، بۆ دۆزینەوەی چارەسەریی بۆیان. ئەگەر وەستانی ئەم خۆشەویستانە نەبووایە، بەتایبەتی کاتێك زیاتر لە جارێك بانگهێشتی بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی کازمیە کرام، بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر مەجلیسەکە، ئەوا سەرنەدەکەوتین. لێرەدا هەڵوێستی دکتۆر عەبدولستار ڕاوی لەبیرناکەم کاتێك خۆی لەبەردەم بەڕێوەبەری ئەمنی بەغدا داکۆکی لە مەجلیسەکە کرد، کاتێك بەڕێوەبەرەکە ویستی مەجلیسەکە دابخات. ئێستا سەرقاڵی ئامادەکردنی کتێبێکم لەبارەی مەجلیسی خاقانی، هەموو ئەو بابەتانە کۆدەکەمەوە کە بەسەر مەجلیسەکە هاتووە. سەرەڕای باسکردنی ئەو بەڕێزانەی کە گەورەیان کردم و پاڵپشتم بوون، بەتایبەتی خەڵکی کازمیە، کەسایەتییەکانی لەسەرووی هەموویانەوە مامۆستا مەحفووز و سەید حوسێن سەدر، خودا لە مردووەکان خۆش بێت و تەمەنی زیندووانیش درێژ بکات.

## نەخۆشییەکەی وەردی

ڕۆژانی کۆتایی ١٩٩٤ بۆ هەموو دانیشتوانی مەجلیسەکە خەمبار بوو، چونکە دکتۆری مەزن وەردی نەخۆش کەوت و نەیدەتوانی ئامادە بێت، تەنها حاڵەتی دەگمەن نەبێت. دەبێت بۆ مێژوو بگوترێت وەردی زۆر لە نەخۆشییەکەی زۆر بەهێزتر بوو، تەنانەت بە گاڵتەئامێزییەوە باسی نەخۆشییەکەی دەکرد. کاتێك پزیشك پێی

گوتبوو لەوانەیە نەتوانی کۆنترۆڵی میزکردن بکەیت، چونکە ئەگەری تووشبوون بە میزەچۆڕکەی هەیە. بە گاڵتەوە وەردی بە منی وت: لە مەجلیسەکان پێویستمان بە کوڕە بچووکەکەت دەبێ، عیسا. منیش وتم چ کارێکمان بەو منداڵە هەیە کە هێشتا سێ ساڵی تێنەپەڕاندووە. وەردی وتی" لە مەجلیسەکان لەباوەشی خۆمی دادەنێم، ئەگەر نەمتوانی میز ڕابگرم، ئەوا هاواری تۆ دەکەم، ئەها محەمەد ئەوە کوڕەکەت لە باوەشی من میزی کرد، تۆش داوای لێبوردن دەکەیت و خەڵکەکەش باوەڕ دەکەن! خوالێخۆشبوو لە ڕووبەڕووبوونەوەی نەخۆشەییەکەی بەهێز و ئازا بوو، بە پێچەوانەی ئەوەی لە دراما تەلەفزیۆنییەکە نیشان دراوە، گوایە دەناڵێ و دەگری!

پرسیاری نەخۆشییەکەی وەردیمان لە حەسانی کوڕی کرد، وتی نەخۆشییەکەی دیارکراوە کە شێرپەنجەی زراوە. دکتۆر حەسان و پزیشکانی عێراق هەوڵیان دا وەردی مەزن بەو دەرمانانەی لە عێراق هەیە، چارەسەر بکەن، کەچی ئابڵۆقەی ئابووری کاریگەری لەسەر تەندروستی و چارەسەری تەواوی عێراق هەبوو، دەرمان بۆ نەخۆشییە ترسناکەکان نەبوو، نەخۆشییە هەمیشەییەکانیش کارتی بۆ کرابوو نەخۆش دەچوو لە نەخۆشخانەکان بە نۆرە وەری دەگرت. هەموو ئەمانەش بە فرمانی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو. تەمەنی وەردی هەشتای تێپەڕاندبوو، توانای بەرگری لەم تەمەنە لاواز دەبێت، جا تووشی شێرپەنجەش بێت. ئێمەش چاوەڕوانی هەواڵە دڵتەزێنەکە بووین.

## چارەسەرییەکی درەنگ لە ئەردەن

لە مانگی دووەمی ساڵی ١٩٩٥ لە ئەردەن بووم، لە سەروبەندی

گەڕانەوە بووم بۆ عێراق، لەوێ بە برام دکتۆر یەحیا بوکا و تاهیر بوکا گەیشتم، کە پەیوەندی دۆستانەم لەگەڵ ئەم دوو کەسە و خێزانەکەیان هەیە. لە شوقەکەی خۆم لە عەممان مەجلیسێکی ئەدەبیمان ڕێکخست. باسی هەموو ئەو بابەتانەمان کرد کە ئەو کات بەلامانەوە گرنگ بوو. نەخۆشییەکەی دکتۆر وەردی نیگەرانی بۆ من دروستکردبوو، بێگومان زۆربەی دۆستانیش لەم نیگەرانییە بەشدار بوون. من پێشنیاری ئەوەم بۆ دکتۆر تاهیر خستەڕوو، کە نامەیەك بۆ شا حوسێن تەلالی شای ئەردەن بنووسم، داوای لێ بکەم چارەسەری وەردی لە ئەستۆ بگرێت! بەلام لەم مەسەلەیەدا دوو کێشەم هەبوو: یەکەم چۆنیەتی نووسینی نامەکە بوو، چونکە نووسینی نامە بۆ شاکان شێوازی تایبەتی دەوێ، دووەم چۆنیەتی گەیاندنی نامەکە بوو. دکتۆر تاهیر هەردوو بابەتەکەی لە ئەستۆ گرت، بە هاوکاری دکتۆر یەحیا کاغەزێکی فەرمیمان بەدەست خست کە دکتۆر یەحیا لە نووسینگەی شەوقی نەقل چاپی کردبوو، ئەمەیان یەکێکە لە پیاوماقولانی ئەردەن. مەجلیسی خاقانی وەك ناونیشانێکی دیار لە کاغەزەکە نووسرابوو، دەبووایە من ئیمزای بکەم چونکە من خاوەن و سەرۆکی مەجلیسی ڕۆشنبیریی خاقانی بووم، دەبووایە دکتۆر تاهیریش نامەکە دابڕێژێتەوە. بە سوپاسەوە ئەو دایڕشتەوە و منیش ئیمزام کرد. دکتۆر یەحیا نامەکەی گەیاندە سلێمان حنیتی، کە براکەی لە دیوانی شاهانەی ئەردەن کاری دەکرد، ئەمیش ئەرکی گەیاندنی نامەکەی بە شا حوسێن لە ئەستۆ گرت. ناونیشانی نووسینگەی مامۆستا شەوقیمان وەك ناونیشانێکی جێگیر جێهێشتبوو، بۆ مەبەستی وەرگرتنەوەی وەلامەکە، پێیان ڕاگەیاندین

کە نامەکە گەیشتۆتە دیوانی شاهانە، ئێمەش گەڕاینەوە بەغدا.

لە بەغدا هیچ شتێکم لەبارەی نامەکەوە بە وەردی نەگوت، لەوە دەترسام نامەکە لە دیوانی شاهانە فەرامۆش بکرێت و وەردیش ئومێدی پێی هەبێت. لەگەڵ هاوڕێیان ڕێکەوتین کە نابێت وەردی لەگەڵ ئازارەکانی بەتەنیا جێبهێڵین، بۆیە سەردانی ماڵی وەردیمان کرد و هێنامانە ئەو مەجلیسەی کە خۆی دروستی کردبوو، بەڵام حاڵەتی تەندروستی باش نەبوو، هەستەکانی لەدەست نەدابوو، هێشتا بەسەر خۆی زاڵ بوو، بەڵام لە دانیشتنەکەی ئاسوودە نەبوو، هەستت دەکرد ئازار هاودەمیەتی. مامۆستا مەحفووزم بینی، سەیری وەردی دەکات و فرمێسک لە چاوەکانی دێتە خوارەوە، پێم گوت: دکتۆر مەمانگریێنە، من وا بەرەنگاری فرمێسکەکانم دەبمەوە. مامۆستا مەحفووز وتی"من بۆ ئەو مێژووە مەزنە دەگریم کە وا بەبەرچاومەوە وەك لم پەرتەوازە دەبێت!". حکومەتی ئەوسای عێراق بایەخی بە وەردی نەدەدا، هەرچەندە مامۆستا سەلام شەماع لە ڕێگای ئەو ڕۆژنامە فەرمیانەی تێیدا کاری دەکرد، ڕووی لە حکومەت کردبوو. تا ئەو ڕۆژە هات مامۆستا ڕەجائی وەر لە عەممانەوە هاتە مەجلیسی خاقانی فەرمانی شا حوسێنی هەڵگرتبوو کە فەرمان دەکات لە نەخۆشخانەی حوسێنی چارسەرەی وەردی بکرێت لەسەر خەرجی دیوانی شاهانەی ئەردەنی. شاگەشکە بووم، پەیوەندیم بە وەردی کرد و پێم وت لە ئەردەنەوە میوان هاتووە ئارەزووی دیداری ئەو دەکەن، دەبێت چارەگێکی دیکە ئامادە بێت، بۆ ئەوەی بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆم بیگەیەنمە مەجلیسەکە.

وەردی بە دیداری ئەوان دڵخۆش بوو. پێم گوت ئەوان فەرمانی شا

حوسێنیان هێناوە، بۆ ئەوەی بەخێرایی لە نەخۆشخانەی حوسێن لە عەممان چارەسەر بکرێت. وەردی وتی" کێ بە شا حوسێنی وتووە من نەخۆشم" منیش وتم"من". وتی" بە دیداری شا گەیشتووی، بۆچی بە منت نەگوت". وتم " نەمدیوە، بەڵکو نامەم بۆ ناردووە، پێم گوتووە تۆ نەخۆشی پێویستیت بە چارەسەر هەیە، ئەویش ڕەزامەندی داوە و ئەوەتا ڕەجائی وەری بۆ وەڵام و ڕەزامەندییەکە ناردووە". نووسراوی دیوانی خوێندەوە، دواتر داوای لێکردم کۆپی ئەو نامەیەی بۆ بهێنم کە بۆ شا حوسێنم ناردووە. بەرەو ژووری کتێبخانە چووم کە کۆپییەکی نامەکەم لەوێ پاراستبوو، بەڵام یەکسەر بۆ وەردیم نەهێنا، بەڵکو بە قەڵەمێك تاکە ڕستەیەکم لە نامەکە سڕییەوە ئەویش ئەم ڕستەیە بوو" تووشی نەخۆشی شێرپەنجەی زراو بووە" نەبادا ببینی و کاریگەر بێ، دواتر نامەکەم بۆ هێنا.

وەردی بەخێرایی سەیری نامەکەی کرد و وتی" چۆن نامەیەك بۆ شا دەنێری کە هێڵی ڕەش و سڕینەوەی تێدا بێت، ئەم قسانە لەگەڵ شاکان ناکرێت" نێوچەوانم ماچ کرد و وتم، دکتۆری بەڕێز ئەمە ڕەشنووسی نامەکەیە، کە لەلای خۆمە، نامەکە بێ هەڵە و هێڵی ڕەش بۆ خاوەنشکۆم ناردووە" وەردی سوپاسی ڕەجائی کرد بۆ گەیاندنی نامەکە، بەر لەوەی ڕەجائی بڕوات هەندێك ستایشی وەردی کرد و ڕۆیشت، لەو کاتەدا وتی زۆر بە ئاکار و زانستی وەردی سەرسامە.

بە دکتۆر وەردیم وت دەبێ پەلە بکەین، بۆ ئەوەی بگاتە عەممان، ڕەتی کردەوە و وتی ماوەی نێوان بەغدا و عەممان زیاتر لە دوانزە کاتژمێرە، من ناتوانم تەنها کاتژمێرێك دانیشم، ئەی چۆن بەو ڕێگا

درێژە بڕۆم. منیش وتم دکتۆر ئێمە ئۆتۆمبیلێکی دوانزە کەسی بەکرێ دەگرین، کورسییەکانی دواوەت بۆ چۆڵ دەکەین، جێگایەکی نەرم و نیانت بۆ ڕادەخەین، بۆئـەوەی هـەر کاتێـك مانـدوو بـووی بخـەویت. یەکێك لە کوڕەکانیشت لەگەڵ دەبێت، نەبادا پێویسـتیت بـە شـتێك بێت. هەروەها شوفێرێکت بۆ دەستنیشان دەکەین برایانی مەجلیس بیناسن و بەها و ڕێزی تۆ بزانێ، هەر کاتێکیش هەستت بە شەکەتی و ماندووبوون کرد داوای لێ بکە بوەستێ!.

بە ئازارەوە وەردی سەری سوڕمابوو. سەیری سیمای ئێمەی کرد و بەتایبەتیش سەیری مامۆستا مەحفووزی کرد، دەیزانـی چـاوەڕوانی وەڵامی ئەرێنی دەکەین، بۆیە سەری ڕەزامەندی لەقاند و ڕەزامەندی نیشان دا. وتم دکتۆر هەر ئێستا پەیوەندی بە دکتۆر حەسانی کوڕت دەکەم، یەکێك لە برایانیش دەنێـرم بۆئـەوەی ئۆتۆمبیلەکـە ئامـادە بکـات. نیـو کاتـژمێری پێنەچـوو شـوفێرەکە لـەلامان بـوو. بـە شوفێرەکەمان وت لە بەرامبەر گەیانـدنی وەردی بـۆ عـەممان چـەند وەردەگری، وتی ٤٠ هەزار دینار کە دەیکـرد (نزیکـەی بیسـت دۆلار) وەردی لـە ژمارەکـە حەپەسـا. بـە گاڵتـەوە بـە شـوفێرەکەی وت" خانووی نورەدین مەحموودم لە جەرگەی ئەعزەمیە بە دوانزە هـەزار دینار کڕیوە، کە سەرۆك وەزیرانی عێراق بوو لە سەردەمی پاشایەتی، تۆش بۆ سەفەرێکی عەممان داوای ٤٠ هەزار دەکەیت، ئەمە مەحاڵە".

شوفێرەکە وەڵامی دایەوە، من تـەنها مافی ڤیزەی خـۆم وەردەگـرم، کەچی سەفەرەکە بۆ تۆ بەخۆڕاییە، من شانازی بە تۆ دەکەم. (ئەو کـات هـەر کەسـێکی عێراقـی سـەفەری دەرەوەی وڵاتـی بکردایـە، دەبووایە چەکێکی بانك بە بەڕێوەبەرایەتی ئەمن بدات، بە بەهای ٤٠

هەزار دینار، تا ڕێگای سەفەری پێ بدرێت، ئەوە ئەگەر کێشەیەکی نەبووایە، بەهای ئەم ڤیزەیە کە ئەو کات وەها ناودەبرا، بەرزبۆوە تا لە ڕۆژانی کۆتایی ڕژێم بۆ تاکە کەسێك گەیشتە ٢٠٠ هەزار دینار).

ڕۆژی سەفەرەکە دیارکرا، کەسی یاوەریش مامۆستا جەعفەری کوڕی دکتۆر وەردی بوو. کاروانەکە ڕۆشت، دوای دوو ڕۆژ دکتۆر حەسان و مامۆستا فەیسەڵ بەدوایان ڕۆیشتن بۆ ئەوەی لە بارودۆخی باوکیان دڵنیا ببنەوە. هەمووماں هەناسەی ئاسوودەییمان هەڵکێشا. جێگای داخ بوو نووسەرێکی نەفسنزم لە یەکێك لە ڕۆژنامە عێراقییەکان بابەتێکی نووسی بوو، گلەیی لە وەردی دەکرد، چونکە عێراقی جێهێشتووە و لە ئەردەن لەسەر حسێبی شا حوسێن چارەسەر وەردەگرێت. گوایە بەشەرەفتر بوو ئەگەر لە عێراق بمردایە، لە توانای کەسێکمان نەبوو وەڵامی بداتەوە، چونکە وەڵامدانەوەی ئەو وەڵامدانەوەی دەسەڵات بوو، وەڵامدانەوەی دەسەڵاتیش وەك ئەوە بوو عزرایل لە ماڵت بێت. بۆیە ئەو کات بێدەنگ بووین، ناوەکەمان تۆمارکردووە. ئێستا ئەو نووسەرە لە بەغدا دەخولێتەوە لەسەر پەتی سیاسەت باز دەدات، لێرە لەبەر ئەوە ناومان نەبردووە، بۆئەوەی گرگنێکی وەها ناوی بە وەردی مەزن پەیوەست نەبێت!

ماوەیەکی زۆر تێنەپەڕی کاتێك وەردی گەڕایەوە، شەکەت و ماندوو. لەبارەی بارودۆخی وەردی پرسیارم لە دکتۆر حەسانی کوڕی کرد. ئەویش وتی" گەیشتنمان بۆ عەممان زۆر درەنگ بوو، دەبووایە چەندین مانگ پێشتر لە نەخۆشخانەکە بێت، کاتێك چووینە نەخۆشخانەکە خوێنی لەبەر ببوو، یەکێك لە دکتۆرەکان هەوڵی دا، بەڵام جەستەی کاردانەوەی بۆ چارەسەرییەکان نەبوو.

نەشتەرگەرییان بۆ کرد، بەڵام بەداخەوە سەرکەوتوو نەبوو". جێگای داخە هەندێك لە عەممان سازشیان لەسەر چاپکردنی کتێبەکانی کرد، یەکێکی دیکە ڕەزامەندی بڵاوکردنەوەی لێ وەرگرت... داوا لە ئازیزان کوڕەکانی وەردی دەکەم، باسی وردەکاری ئەم بەسەرهاتانە بکەن، کە من بیستوومە، ئەمەش بۆ ئەوە نییە ئابڕۆی کەسێ ببەم، بەڵکو بۆ مێژووە کە وەردی حەزی دەکرد هەمیشە بە بەڵگەوە بێت!

## ڕێزلێنانی وەردی لەلایەن یەکێتیی نووسەرانەوە

برایانمان لە مەجلیس لە خراپی بارودۆخی تەندروستی وەردی ئاگاداریان کردینەوە. نزای چاکبوونەوەمان بۆ کرد. ئەوکات مامۆستا موئەیەد عەبدولقادر لە مەجلیسەکە لەگەڵمان بوو. هەڵچوو بە ناوی یەکێتیی نووسەرانی عێراقی بڕیاری ڕێزلێنانی وەردی دا. دەشزانم مامۆستا موئەیەد کۆششێکی ئەفسانەیی کرد بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندییە فەرمییەکان.

لە هۆڵێکی گەورە کۆبووینەوە، یادی وەردیمان کردەوە بە زانستییەکەیەوە. من یەکێك بووم لە قسەکەرەکان. هەرکە تەواو بووین مامۆستا موئەیەد پێشنیاری کرد شاندێك پێك بهێنین، لەماڵەکەی سەردانی وەردی بکەین و بەناوی یەکێتییەکە ڕێزی بگرین. پەیوەندیم بە وەردی کرد بۆ ئەوەی ئاگادار بێت و هەمووومان چووین. لە هۆڵەکەی ماڵەوەی وەردی و لە هەموو لایەکەوە دەورەمان دا. ئەوەی توانی قسەی کرد. مامۆستا موئەیەد وتی ئێمە بۆ ڕێزلێنانی وەردی و کتێبەکانی هاتووین. دوای تەواوبوونی وتارەکەی وەردی وەڵامی دایەوە و ئەو دێڕە شیعرەی خوێندەوە کە دەڵێ" وجادت بوصل حيث لا ينفع الوصل". لەم کتێبەدا وێنەکانم بڵاوکردۆتەوە

که له دوایین مانگی تەمەنیدا له ماڵی وەردیین.

## مردنی وەردی و خۆپیشاندانێکی جەماوەری له ڕێورەسمی ناشتنیدا

له سێزدەی تەمموز، له بەیانی ڕۆژێکی گەرم و وشکی ساڵی ١٩٩٥ کەسێك پەیوەندی پێوه کردین و هەواڵی مردنی وەردی پێ ڕاگەیاندین و داوای کرد له ماڵەکەی ئامادە بین. ئێمه لەبەردەم ماڵەکەی له ئەعزەمیه کۆبووینەوه، چاوەڕوانی ئەو ڕووداوه مەزنەمان دەکرد که نەماندەتوانی باوەڕ بکەین. خوالێخۆشبوو شامل شەمەری نارنجێکی له داری یەکێك له دراوسێیەکان لێکردەوه و کردی به دوو لەت، ئەو تابلۆیه کانزاییەی به لەته نارنجەکه سڕییەوه که لەلای چەپی دەرگای ماڵی وەردی، ناوی عەلی وەردی لەسەر نەخشێنرابوو، بەم سڕینەوەیه ناوەکه زیاتر دەدرەوشایەوه، جا شامل گریا و وتی" وەردی بەدرێژایی ژیانی دەدرەوشایەوه".

تەرمەکەمان له ماڵەوه به ئۆتۆمبیل بەرەو شوێنی شووشتن برد له مەرقەدی کازمیه. بەمشێوەیه هەواڵەکه لەنێو خەڵك بڵاویۆوه. من لەگەڵ وەردی چوومه شوێنی شووشتن، مردن و نەخۆشی سیمای وەردی زۆر نەگۆڕیبوو... دوای شووشتن بەرەو مەرقەدی کازمیه برا بۆ ئەوەی نوێژی مردووانی بۆ بکرێت.

لەو ماوه کورتەدا، که خەریك بوو ئامادەکاریی دەکرا بۆ ئەوەی تەرمەکەی به ئۆتۆمبیل هەڵبگیرێت. من بڕیارێکی شەخسیم دا، بۆ ئەوەی به هەڵگرتن تابووتەکه هەڵبگرین بەرەو مەرقەد بڕۆین، تەرمەکەمان بردە ناو بازاڕی گەورەی کازمیه، فەوزی خۆشنووس ئەو پارچه قوماشەی تەواو کردبوو که ناوی کۆچکردووی مەزنی لەسەر

نووسرابوو. ناوەکە سەرنجی خەڵکی ڕاکێشا و زۆربەیان کاریان جێهێشت بەدوای تەرمەکەی ڕۆیشتن. لە شێوەی ڕێپێوانێکی جەماوەری بێدەنگ بوو لە سەردەمێکدا کە کۆبوونەوەی دوو کەس قەدەغە بوو. بەڵام ئێمە هاوارمان دەکرد" لا إله إلا الله محمد رسول الله" تەرمەکەی وەردییش بەسەر شانمانەوە بوو.

چووینە مەرقەدی کازمیەی پیرۆز، خوالێخۆشبوو سەید حوسنی حەیدەری وەستا و نوێژی لەسەر تەرمەکەی وەردی کرد. حەیدەری لە ساڵی ٢٠١٣ کۆچی دوایی کرد. بارودۆخی دەرەوەی مەرقەد شڵەژابوو، ئەمەش لە ئەنجامی ڕێپێوانە بێ مۆڵەتەکەمان بوو. کە زیاتر لە ئاڵەنگارییەك دەچوو نەوەك ڕێوڕەسمی ناشتنی تەرمێك. هەرکە نوێژ تەواو بوو، تابووتەکەمان لەسەر شانی خۆمان دانا بەرەو مزگەوتی براسا ڕۆیشتین. بەڵام ئەوەی ڕوویدا لە خەیاڵی ئێمە نەبوو. ئەو کاتە مامۆستا حوسێن عەلی مەحفووز فەرمانی پێکردم ئۆتۆمبیلەکان ئامادە بکەین بۆ ئەوەی تابووتەکە هەڵبگرین، دەشیزانی ئەم فەرمانەی بەرپەرچ نادرێتەوە. ئێمەش تەرمەکەمان هەڵگرت بۆ لای شەقامی موفید نزیك قوتابخانەی ئێرانی کۆن، کە ئۆتۆمبیلەکان لەوێ وەستابوون.

## ناشتنی وەردی لە گۆڕستانی قوڕەیش

وەردی لە گۆڕستانێك نێژرا، هەموو مەزنەکانی سەردەمی خۆی تێدا نێژراوە. ناشتنەکەش بێ مۆڵەتی دەوڵەت بوو. چونکە ڕێگەی بە ناشتن نەدەدا، تەنها لە شوێنە تایبەتەکان نەبێت، یان لە گۆڕستانی بەغدا بێت یان لە نەجەف و کەربەلا. بەڵام وەردی مەزن لە گۆڕستانی

باووباپیرە مەزنەکانی جێگیر بوو. ئەم گۆڕستانە لە سەردەمە گەشەکردووەکانی ئیسلامدا، گۆڕستانی منداڵانی بەنی هاشم بوو، بۆیە بە گۆڕستانی منداڵان ناودەبرا. مامۆستا مەحفووزی دانا لەبارەی ئەو گۆڕستانەوە دەڵێ ئەمە گۆڕستانی مەزنەکانە، تەرمی کەسایەتییە مەزنەکانی لەخۆ گرتووە، مامۆستا مەحفووزی خوالێخۆشبوو دەڵێ" ئەو گۆڕستانەی وەردی لێ نێژراوە، من ناوم ناوە گۆڕستانی زانایان... ئەم گۆڕستانە دەکەوێتە مزگەوتی براسا، پێشتر منداڵی تێدا دەنێژرا...بەڵێ ئێستا گۆڕستانی مەزنەکانە، جەواد عەلی، تەها باقر، عەلی جەواد تاهیر، عەلی وەردی و عەباس عەلی، ڕۆژهەلاتناسێکی چیکی کە زمانی ئەڵمانیم لەلای خوێندبوو، بوو بە ئیسلام و دواتر مرد لە براسا نێژرا. هەروەها مامۆستا محەمەد عەلی ئال یاسین و کەسێکی بەغدایی کۆن کە ناوم لە کتێبێك خوێندۆتەوە پیاوێکی بەغدایی نووسیویەتی یەکێك لە هاوڕێیەکانی یەکەم کەس بووە لە براسا نێژراوە، بەمەش ژمارەیان دەبێتە هەشت، بۆیە ناوم بە گۆڕستانی زانایان بردووە، کاتی خۆی وتارێکم نووسیوە و داوام کردووە مینۆمێنتێك و کتێبخانەیان بۆ دروست بکرێت. بەداخەوە ئێمە لە عێراق ئەم کولتوورەمان نییە". بەداخەوە ئەم گۆڕەپانە بۆتە هۆڵێك لەلایەن ئاهەنگسازانەوە ژێر پێ دەخرێت!

سووکایەتی بەو گۆڕستانە کراوە کە وەردی تێدا نێژراوە، دڵنیام لەوەی ئەو کەسەی گۆڕستانەکەی کردۆتە هۆڵی ئاهەنگگێڕان، هەست بە نەرێنی کارەکەی خۆی ناکات. چەندە هیواخوازم سەرپەرشتیاری مزگەوتەکە کە شێخ جەلالەدینی شێخ عەلی سەغیرە، فەرمان بکات ئەو هۆڵە تێك بدرێت، گۆڕستانەکە مینۆمێنتەکەی بۆ بگەڕێتەوە کە

بەناوی ئەو زانایانەیە تێیدا نێژراوە، بەتایبەتیش زۆربەیان پەیوەندیان لەگەڵ شێخ عەلی باوکی خوالێخۆشبووی هەبووە.

سێ ڕۆژ پرسە بۆ دکتۆر عەلی وەری دانرا، لە حوسێنیەی ئال سەدر کە بە حوسێنیەی ئیمام کازم ناسراوە. ئەو حوسێنیە دەکەوێتە شەقامی دەروازەی مراد لە کازمیەی پیرۆز. دەسەڵاتی عێراقی هیچ نێردراوێکی خۆی بۆ پرسەکە نەنارد، تەنها تاریق عەزیز و حامد یوسف حەمادی و هەندێك لە ئەندامانی دەسەڵاتی سیاسی بە سیفەتی خۆیان هاتبوون، چونکە دکتۆر وەردی لە زانکۆ مامۆستایان بوو.

یەکێتیی ئەدیبان و نووسەرانی عێراق چلەی ماتەمینی بۆ دکتۆر عەلی وەردی سازکرد، لە چلەکەدا هەریەکە لە بەدرخان سندی و دکتۆر حارس عەبدولحەمید حەسەن و مامۆستا موئەیەد عەبدولقادر قسەیان تێدا کرد، هەروەها عەلی جەلیل وەردی شیعرێکی خوێندەوە، محەمەد خاقانیش بەناوی مەجلیسی خاقانی کە وەردی دامەزرێنەرەکەی بوو، وتارێکی خوێندەوە.

## ساڵیادێکی زانستی

عەلی وەردی حەزی نەدەکرد ئاهەنگی بۆ بکرێت، یان ستایشی بکرێت و باسی هەڵوێستەکانی بکرێت. ڕۆژێکیان بە بۆنەی یادی هەشتا ساڵەی لەدایکبوونی ئاهەنگمان گێڕا و بەناچاریی بەشداریمان پێکرد، کاتێك سوپاسمان کرد و ستایشمان کرد، وتی سوپاسی ستایشکەران دەکەم، ئەو کاتە مامۆستا مەحفووز پێکەنی و وتی وەردی جنێوی پێداین، چونکە ئەو هەمیشە پشت بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر دەبەستێ کە دەفەرموێ" خۆڵ بکەنە دەموچاوی

ستایشکەران" کەچی وەردی دەڵێ سوپاسی ستایشکەران دەکەم.

دوای کۆبوونەوە لەگەڵ کەسایەتییە گرنگەکانی مەجلیس، بڕیارمان دا لـە سـاڵیادی یەکـەمی وەردی ئاهـەنگێك سـاز بکـەین، شـایەنی خوالێخۆشبوو بێت، لە ئاست زانست و هزری ئەو بێت. لـە ئەنجامـدا گەیشتینە بیرۆکەی ئەوەی بانگهێشتی کەسانێك بکرێت بۆئەوەی لـە هەموو ئەو بوارانەی وەردی کاری تێدا کـردووە، توێژینـەوە بکرێـت. بەمشێوەیەی خوارەوە ڕێکەوتین:

١-مامۆستای دانا حوسێن مەحفووز قسە لەسەر لایەنی ئـەدەبی کتێبەکانی وەردی بکات.

٢-حاجی عەباس مەندەلاوی قسە لەسەر لایەنی فیکری بکات.

٣-دکتۆر عیماد عەبدولسەلام لایەنی مێژوویی.

٤-عەبدولستار ڕاوی قسە لەسەر لایەنی فەلسەفی بکات.

٥-دکتۆر حارس عەبدولحەمید لایەنی پاراسایکۆلۆژی.

٦- دکتۆر بەدرخان سندی لایەنی دەروونی.

٧- هـەردوو شـاعیری گـەورە عـەلی جـەلیل وەردی و ڕازی مەهـدی سەعید بە دوو قەسیدە بەشدار بن.

٨- ئێوارە کۆڕەکەش لەلایەن محەمەد خاقانی بەڕێوەدەبرێت و ئەو وتەی مەجلیسی خاقانی دەخوێنێتەوە.

سێ مانگ بەر لە ساڵیادەکە نامەمان بۆ کەسـانی دەستنیشـانکراو نـارد، بۆئـەوەی بتـوانن توێژینـەوەکانیان ئامـادە بکـەن. داواشمـان لێکردن مانگێك بەر لە یادەکە پەیوەندیمان پێوە بکەن، ئەگەر هاتوو دەرفەتی بەشدارکردنیان نەبوو، بۆ ئەوەی لە شوێنی ئەوان کەسانی دیکە دابنێین. سوپاس بۆ خوا هیچ یەکێك لەوان پۆزشی نەهێنایەوە.

ئێوارە کۆڕێکی زانستی دەگمەن بوو، لەبیر ناکرێت. گیانی عەلی وەردی بەسەر ئامادەبووانەوە باڵەفڕەی بوو. بەهۆی بوونی من لە تاراوگەی بەریتانیا، ناتوانم ئەو وشانە کۆبکەمەوە. خوا پشت و پەنام بێت هیوام وایە بتوانم ڕۆژێك لە کتێبێکدا کۆی بکەمەوە لەبەر بەپێزییە زانستییەکەی.



## بەشی دووەم

## وەردی وەک ئەوەی من ناسیومە

دەمویست بەسەر میتۆد بازبدەم و ئەم بەشە بێ پێشەکی و دەسپێك بنووسم. ئەو بابەتانەی لەبارەی وەردی نووسیومە، بەو شێوەیەی کە من ناسیومە، وێنەی وەردی بەو شێوەیە دەکێشێ وەك خۆی: هەڵسوکەوتی، هەڵوێستەکانی، بۆچوونەکانی، چۆن پێشوازی لە وەڵامەکان دەکرد. بەڵام نەمتوانی بەسەر ئەو میتۆدە بازبدەم کە پەیڕەوم کردووە. بەڵکو لەبری ئەو هێندەی بتوانم سەرکێشی دەکەم، تا وەڵامی شتە نارۆشنەکان لە چوارچێوەی بابەتەکانی ئەم بەشە بمێنێتەوە، نەوەك ئەم پێشەکییەی ئێستا.

لەبەرئەوەی ئەم پێشەکییە کورت دەبێت، ئەو بابەتانە ڕوون ناکاتەوە، کە لە پێرستی بەشەکەدا هاتووە، تەنها دوای خوێندنەوەی بابەتەکانی نەبێت. سەربووردەی ژیانی وەردی شێوەی نمایشێکی سینەمایی بەچێژە، بۆیە منیش ئەو ناونیشانەم بۆ سەربووردەی ژیانی هەڵبژاردووە (سینەمای بەغدا). سەبارەت بە ڕستەی (دەتخەمە ناو مێژوو) ئەمە قورسترین ڕستە بوو کە وەردی بە کەسێکی دەگوت ئەگەر وەڵامی نەدابووایەوە. سەبارەت بەوەی وەردی (عرووبی یان ئیسلامی) بووە، من ئامۆژگاریت دەکەم خۆت ئەم بەشە بخوێنیتەوە، بۆئەوەی لەم بابەتە دڵنیابیتەوە. هەوڵیشم داوە، شتەکان بە نووسینی مێژوو و ناوهێنانی پیاوەکان بسەلمێنرێت. سەبارەت بە (پێوەرە ئاوەژووەکان) ئەو پێوەرانە لە ژیانی وەردی زیاتر لە

چیرۆکێکیان هەیە، ئەمەش وایکردووە، هەر ئەمانەش پێوانەی کۆمەڵگا و داب و نەریتەکانن، تەنانەت دەسپێوەگرتنێکی کوێرانەیە لە واعیزەکانی سوڵتاندا. سەبارەت بە (شەنفەڕا و وەردی لە شەقامی موتەنەبی) ئەمە سەیرترین بەسەرهاتە کە لەبارەی وەردی دەیبیستی.

هەرکە لە ژیانمان بە شەقامێك تێپەڕین، لە میانەی ئەو تێپەڕبوونە تێڕوانینمان بۆ شەقام و خەڵك و حکومەت نییە، لەوانەشە بەخت یاوەرمان بێت لە مەزاری کازمیە نوێژیش بکەین، بەڵام هەموو ئەو بابەتانەی ژیان لەلای وەردی وەك توێژینەوەیەکی کۆمەڵایەتی بوو، کە خوێنەر خۆی لە میانەی ئەم کتێبەوە دەیخوێنێتەوە. من لە زۆرێك لە موحازەرەکان لە چەندین شوێنی گشتی بەغدا یان لە شارەکانی دیکە یاوەری وەردی بووم، هەندێك ڕووداو لە میانەی ئەو موحازەرانەوە ڕوویداوە، پێویستی بەوە بوو ڕۆشناییان بخرێتەسەر، کە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

یەکەم: هەندێك لەوانەی لە موحازەرەکانی وەردی ئامادە بوون، هێشتا لە ژیان ماون، لەوانەیە یەکێکیان بتوانێ زێدەی بکات، یان ئەوەی نووسیمە بیری بکەوێتەوە، ئەمەش بۆ سوودی زانستییە.

دووەم: بەداخەوە هەندێك کەوتوونەتە ژێر کاریگەری زەمەنەوە، جا لەبارەی موحازەرەکانی وەردییان نووسیوە، جیاواز بووە لەوەی ڕوویداوە، یان کەم بووە، زیاد بووە، پێچەوانە بووە. بۆیە ئەوەی من لەو موحازەرانە گواستوومەتەوە، لەوانەیە سوودی بۆ ئەوانە بێت کە شتێکیان لەکیس چووە یان لەبیریان کردووە.

هەندێك لە مامۆستایان لە عەلی وەردی قین لەدڵ بوون، بۆ هەر

کوێیەك دەچوو، خۆیان بۆ مەلاس دەدا. ئەمەش بۆ تێکدانی موحازەرەکانی و وروژاندنی گومان لەبارەی وەردییەوە. وەردی بە ئامادەبوونی ئەوان دڵخۆش دەبوو، چونکە بە شێوازی خۆیان، هاوکار دەبوون لە بڵاوکردنەوەی بیروڕاکانی وەردی بەنێو خەڵکدا. کاتێك وەردی تەمەنی گەیشتە هەشتا ساڵ تەواو لێیان پەست بوو. ئەرکێك لە ئەستۆی مەجلیسی خاقانی بوو، ئەویش دەبووایە ئاشتیان بکاتەوە. ئەوەی لێرەدا ناوبراوە (ساختەکردنی کتێبەکانی وەردی لە ئێران) ئەمەش باسی چاپکردنی کتێبەکانیەتی بێ ئەوەی مافی نووسینی پێ بدرێت. دەزگاکانی چاپ لە ئێران پشتیان بە فەتوایەکی ئیمام خومەینی بەستووە. من دەقی ئەو فەتوایەم خوێندۆتەوە، لەبارەی موڵکداریی هزری، لێرەدا باسم کردووە، لایەنەکانیم هەڵسەنگاندووە، بۆ ئەوەی بەبەرچاوی خوێنەرانەوە ڕوون بێت.

وەردی تێرم و زاراوەی تایبەت بە خۆی هەبوو، تەنها خەڵکە نزیکەکە دەیانزانی. بۆئەوەی ئەم زاراوانە لەگەڵ زەمەن پەرتەوازە نەبن، لێرەدا لەژێر ناونیشانی (زاراوەکانی عەلی وەردی) باسی هەندێکیانم کردووە. باسی یەکەم و دوایین جەژنی لەدایکبوونی وەردیم کردووە، کە لە مەجلیسی خاقانی ئەنجام درا. وەردی لە وەڵامی خەڵکی بەشداربوو وتی" سوپاسی ستایشکەران دەکەم". دواجار وەردی دەڵێ: ئیسلام ڕێگەی بە سەما و ژنان و مەینۆشین داوە، ئەمەش دەبینی بیانوویێکە لەلای مەزهەبی تێکەڵکردن، لەم بەسەرهاتە وەردی باسی هاوڕێیەکی خۆی دەکات. ئێمە وا لە بیست ساڵ دوای وەفاتی وەردی نزیك دەبینەوە، هەست دەکەین، هەندێك لە مشتومڕەکانی وەردی دراوەتە پاڵ کەسانی دیکەوە، هەندێك لەو

مشتومڕانەی مەجلیسیش بۆ یادگاری ماوەتەوە.

## سینەمای بەغدا.... سەربووردەی عەلی وەردی

دکتۆر عەلی وەردی ناونیشانی (سینەمای بەغدا) ی بۆ سەربووردەی ژیانی خۆی دانابوو. ئەو سەربوردەیەی بە دیقەتەوە نووسیبوو، بۆچوونی خۆی بە ڕاشکاویی لەبارەی بابەتەکانەوە نووسیبوو. هەروەها قسەی لەسەر ئەو کەسایەتییانە کردبوو کە لە ژیاندا یاوەری بوون، بۆچوونی خۆی لەبارەی ئەوان خستبووە ڕوو. پاساویشی لە بۆچوونەکان هێنابۆوە، لەو هۆکارانەی وایکردبوو ئەو بۆچوونانەی هەبێت. دواتر لە هەندێك لە بۆچوونەکانی پاشگەزبۆوە، وەك پێشتر باسکرابوو وتی" لەڕاستیدا پەشیمانییەکەم لەوە سەرچاوەی گرتبوو، گۆڕانکاریی بەسەر بۆچوون و ڕێبازی بیرکردنەوەم هاتووە، ئەمەش بابەتێکی سروشتییە بەلای مرۆڤەوە. چونکە کە مرۆڤ تەمەنی گەورە دەبێت زۆرێك لەو بۆچوونانەی دەگۆڕێت کە لە گەنجێتی گەلاڵەی کردبوو. چەند جارێك وتوومە، ئێستاش دووبارەی دەکەمەوە، ئەو هەژانە کۆمەڵایەتییەی کە عێراق لە ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بەخۆیەوە بینی، زۆرێك لە تێگەیشتن و تیۆری منی لەبارەی ژیان و کۆمەڵگا گۆڕیوە. بەر لەم ڕووداوە بە دیدێکی دیاریکراو سەیری ژیان و کۆمەڵگام دەکرد. دواتر ئەو ڕووداوە پڕ هەراوزەنایەی ١٤ی تەمموز و دواترم بینی، ئەو کات درکم بەوە کرد کە من لە تێڕوانینە کۆنەکەم بۆ سروشتی مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی و بۆ سروشتی کۆمەڵگای عێراقی بەتایبەتی، هەڵە بووم".

ئەم دەستنووسە دەگمەنە کە ئێستا تەواو نەماوە. تێیدا وەردی بە

شێوەیەکی گشتی تێیدا باسی لە بۆچوونەکانی خۆی کردووە، لەبارەی سیاسەت و مێژوو لە عێراقدا. وەردی بۆچوونی خۆی لەبارەی سیاسەتمەدارانی عێراق خستۆتەڕوو. بە چاوی کۆمەڵناسێك تێیان دەڕوانی. هەروەها وەردی توێژینەوەیەکی سایکۆلۆژیی بۆ سیاسەتمەدارانی عێراق کردووە. هەروەها قسەی لەسەر سەیرترین وێستگەکانی مێژووی هاوچەرخی عێراق کردووە، کە خۆی بینیویەتی.

ڕۆژێکیان من و مامۆستا سەلام شەماع، بەرەو ماڵەکەی یاوەری وەردیمان دەکرد. بە پێ دەڕۆیشتین، کاتێك ناوە ناوە زەوی ژێر پێمان دەلەرزی. ئەو کات ئاسمانی عێراق بۆ عێراق نەبوو، بەڵکو بەتەواوی ببووە موڵکی فڕۆکە ئەمریکییەکان، کە بە خواستی خۆیان کاریان دەکرد و بە خواستی خۆیان شوێنەکانیان بۆردوومان دەکرد. جیاوازیی لەنێوان ژێرزەمینەکەی عامریە و منداڵ و سەرکردەی سوپا و بەرگری و هاواڵگریی نەدەکرد. ئەمەش لە زستانی ۱۹۹۱ بوو، ئەو کاتەی عێراق ملکەچی بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان نەبوو، لە کوێت پاشەکشەی نەکرد. بۆیە فڕۆکەکانی ئەمریکا عێراقیان بۆردوومان دەکرد و ژێرخانی ئابوورییان وێران دەکرد هەر لە پردەکانەوە بگرە تا پاڵاوگەی ئاو و وێستگەی کارەبا، تەڕ و وشکی بەیەکەوە دەسووتاند. وەردی یاداشتی ڕۆژانەی لە سینەما بەغدا لەسەر هەموو ئەو ڕووداوانە دەنووسییەوە.

وەردی ڕۆژێکیان بە ئێمەی وت" باپیرانی بەستەزمانمان هەمیشە ئەو پەندەیان دەگوتەوە: ڕەجەبێك بژی عەجەبێك دەبینی. بێ ئەوەی ڕۆژێك بەدوای سەیروسەمەرەیەکی ڕەجەب بگەڕێن. سوپاس بۆ خودا تەمەنم هێندە درێژ بوو کە ڕەجەب بە عەجایبەکەوە ببینم.

بۆردوومانی عێراق لەلایەن ئەمریکاوە، لە ڕەجەب بوو. وتم مەبەستت ئەو بۆردوومان و جەنگەیە، وتی نەخێر بۆردوومان سەیر نییە، بەڵکو پێویستییەکانی جەنگە، بەڵام سەیر ڕووداوی بەر لە جەنگەکەیە، لەوانە داگیرکردن و تا دانوستاندن و شێوازەکانی، دواجاریش جەنگەکە. بەڕاستی هەموو ئەمانە عەجایبن، ڕێك ئەوەیە باپیرانمان باسی عەجایبی ڕەجەبیان کردووە. وتم دکتۆر چۆن تێڕوانینی تۆ لەمەڕ عەجایبەوە ببینم، تۆ تا ئێستا باست نەکردووە. وەردی وتی: دوای مردنم دەیبینی لە یاداشتەکانم نووسراوە، واتە لە کتێبەکەی بەناوی سینەما بەغدا!

ئەم دەستنووسە گرنگە کە لەوانەیە گرنگترین دەستنووسی مێژوویی بێت لە عێراق، لە بەدبەختیمان ون بوو. جێگای داخە کە دەڵێم من دەستنووسەکەم لە کتێبخانەکەی وەردی بینیوە. وەك پێشتر باسم کرد پرسیارم لە حەسانی کوڕە گەورەی وەردی کرد. پێشم وت من لە کتێبخانەی باوکی خوالێخۆشبووی بینیومە. دکتۆر حەسان جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەویش گوێبیست بووە، دەیویست بیبینی، بەڵام لە بەدبەختیدا نەیبینیوە. لە کتێبخانەکەی بەدوای گەڕا، کەچی هیچ شوێنەوارێکی دیار نەبوو. خوازیارم لە خودای گەورە خێزانی خوالێخۆشبوو وەردی سەربخات لەوەی ئەو دەستنووسە بدۆزنەوە تا کتێبخانەی عەرەبی پێشوازیی لیّ بکات.

سەبارەت بەوەی بۆچی وەردی سەربووردەی ژیانی خۆی ناوناوە (سینەمای بەغدا). ئەمە بۆ یەکەم سینەما دەگەڕێتەوە، کە لە سەرەتای دەسەڵاتی نیشتیمانی لە عێراق دانراوە. سەبارەت بە خەڵکەوە چوون بۆ سینەما بابەتێکی گرنگ بوو. کاتێك یەکێك

سەردانی سینەمای بەغدای دەکرد، تەنها ئەوە نەبوو چیرۆکی فیلمەکە لەگەڵ خۆی بهێنێتەوە، بەڵکو باسی لە سەرەتا و کۆتایی گەشتەکەی دەکرد بۆ سینەما. بەتایبەتیش ئەوکات زۆربەی پیاوانی ئایینی سینەمایان حەرام کردبوو. جا کاتێك یەکێك دەچووە سینەما باسی هەموو ئەو شتە سەیر و سەمەرانەی دەکرد کە بەر لە فیلمەکە و دوای فیلمەکە بینیویەتی. جا ئەو شتە سەیر و سەمەرانەی کە عەقڵ قبوڵی نەدەکرد، بە سینەما بەغدا ناودەبرا. ئەمە ئەو هۆکارەیە کە وای لە وەردی کردووە، یاداشتەکانی بەو ناوە ناوبنێ، کە ون بوو، پێشتریش من و مامۆستا سەلام شەماع بینیومانە، ڕەزامەندیمان لەسەر ناوەکەی وەردی داوە. سینەما بەغدا لە نمایشی خۆی بەردەوام بوو، هەرچەندە کەسیش نەیبینی. بەهەرحاڵ خودا پشت و پەنامانە.

## دەتخەمە ناو مێژوو

ئەم گوزارشتە بەناوبانگە وەردی لەگەڵ هەموو کەسێکی بەکاردەهێنا کە مشتومڕیان لەگەڵ دەکرد. هەندێك ئەم قسەیەی وەردیان بە توانج دەزانی و هەندێکی دیکەش بە ستایشکردنیان دەزانی. ڕستەکەش هەردوو ئەگەری قبوڵ بوو. تەنانەت ئەگەری دیکەشی هەیە. لاستیك ئاسابوو، خاوەن پێناسە و مانایەکی ورد نەبوو، تا لەم میانەیەدا بسەلمێت کە وەردی بەنیازە بەم ڕستەیە چی بڵێت.

ڕۆژێکیان پرسیارم لە وەردی مەزن کرد، دەتخەمە ناو مێژوو مانای چییە. تکام لێکرد مانایەکی دروستم پێ بدات، من نازانم مەبەستی چییە؟ وتی بە مەرجێك واتاکەی بە کەس نەڵێم تا لە ژیان مابێت.

منیش دوای ئەوەی نزای تەمەندرێژیم بۆ کرد، بەڵێنم پێدا. ئەویش لە بەرامبەر نزاکەی من، لچی بەلای ڕاستـ هـەڵهێنا. ئەمـەش جووڵـەی وەردی بوو کاتێك نـزات بـۆ بکردایـە، یـان ستایشـی خـۆی و هـزری بکرابووایە. جا وەڵامی ئەو بەمشێوەیە دەبوو، ئەمەش جووڵەیەك بوو لە قسە ڕوونتر بوو. وەردی بە ڕاسـتگۆیی و بـێ گاڵتـەکردن وەڵامـی پرسیارەکەی منی دایـەوە، گوایـە نـاوی کەسـەکە دەخاتـە تۆمـاری یاداشتەکانی لە سینەما بەغدا. لـەوێ بۆچـوونی خـۆی بـە ڕاشـکاوی لەبارەی ئەو کەسە دەڵێ، لە ڕووی زانستی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت لە ڕووی سیاسیشەوە، پەردەی لە ڕوو دادەماڵێ. بۆیە ئەم کەسە بە فراوانترین دەرگا دەچێتە ناو مێژوو.

بە وەردیم وت، لەبری ئەوەی بیخاتە مێـژووەوە، بۆچـی لەبـەردەم کەسەکە، بۆچوونی خۆی بە ڕاشکاوی ناڵێت؟ وەردی وەڵامی دایەوە: لەبـەردەم هـەموو کەسـێ: نـاتوانی بۆچـوونی خـۆت بـە ڕاشـکاوی بدرکێنی. لەوانەیە ئەگەر کەسێك قەناعەتت پێ نەکات، ئەوا بتکوژێ. جیا لەمەش تۆ ناتوانی بـە شـێوازێکی زانسـتی و بـە سەرچـاوە، لـە هەموو شوێن و کاتێك قسە لەگەڵ خەڵك بکەیت. هەر مرۆڤێـك وزە و سنووری خۆی هەیـە لـەو چوارچـێوەیە کـار دەکـات و هەڵسـوکەوت دەکات. کەسی وەهاش هەیە بەلای خۆیەوە لە پزیشك شارەزاتر و لە ئەندازیار چاکتر بێت، یان لە شـرۆڤەکردن لـە زانایـەکی کۆمەڵناسـی بەدیقەتتر بێت. کارنجی وتی نابێت مشتومڕ لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە بکەم.

دواتر تێڕوانینی خۆی خستەڕوو وتی" کێشـەکە لەوەدایـە هەنـدێك تەنها لەبەر ئەوە مشتومڕت لەگەڵ دەکەن، بۆئەوەی دواتر ڕابیگەینن

گوایە مشتومڕی لەگەڵ وەردی کردووە. دوای ئەوەی لێی بێدەنگ دەبێت، وەڵامی نەزانییەکەی نادەیتەوە، سەرکەوتوو و خۆشحاڵ دەڕوات، وەك ئەوەی کارێکی گرنگی ئەنجام دابێت. لەوانەشە وا ڕێك بکەوێت دواتر لەنێو خەڵك بڵاو بکاتەوە، لە هەر ڕێگایەوە بێت، زارەکی بێت، یان بە کتێب، یان ڕۆژنامە، هەموو ئەمانە بۆ سیاسەتمەدار و تەڵەکەباز و ئەم کەسە هەڵەشانە، ڕەخساوە. هەڵبەتە بەوانە ناڵێم سەفستایی. لەبەر ئەوەش سینەما بەغدایان بۆ ئامادە دەکەم، بەهۆی ئەو کتێبەوە دەیانخەمە ناو مێژوو. بۆیە کاتێك دەڵێم دەتخەمە ناو مێژوو، تۆنی دەنگم شێوەی هەڕوگیفی تێدایە".

دووبارە دەڵێم خوازیارم ڕۆژێك ئەو ناوانە ببینم کە وەردی ئەوانی خستۆتە مێژووەوە. ئەگەر تەمەنمان دوای وەفاتی ئەو هێندە درێژ بێت دەبینین سینەمای بەغدا و شێوازی خستنە مێژووی کەسەکەکان، بەڵگەیەکی گرنگ دەبێت، توێژەران ناتوانن دەستبەرداری بن. لێرەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە هەروەك چۆن وەردی جەختی لەسەر کردۆتەوە، کە خستنە ناو مێژوو ئەو زانایانە ناگرێتەوە کە لەسەر بابەتە زانستیەکان مشتومڕیان لەگەڵ وەردی کردووە و بۆچوونی جیاوازیان هەبووە. هەر کەسە و بۆچوونی خۆی پاراستووە. چونکە ئەو زانایانە پسپۆڕ بوون، لەگەڵ وەردی لە هەمان پسپۆڕی مشتومڕیان لەسەر بابەتەکان دەکرد. بۆ نموونە دکتۆر عەبدولڕەزاق محێدین، کە لە کتێبی ئەفسانەی ئەدەبی باڵا بەشدار بووە، بەوپەڕی ئاسوودەیی مشتومڕی لەگەڵ وەردی کردووە. کەواتە ئەوەی ناوی لە سینەما بەغدا دەهات کەسانی سیاسی و دەوڵەمەند و خۆهەڵکێشەکان بوون، کە بە هێزی دەسەلات و پێگە و خۆهەڵکێشان مشتومڕیان

لەگەڵ وەردی دەکرد.

وەردی ڕۆژێـک باسـی پیـاوێکی قـۆزی بـۆ کـردم، کـە باڵابـەرز و دەوڵەمەند بوو، سیاسەتمەدارێکی سەرکەوتوو بوو. وەردی وتی ئـەو پیاوە لەبەردەمم وەستا وا خـۆی نیشـاندا کـە پیـاوێکی قارەمـان و سەرکەوتووە. بە منی وت دکتۆر بینیوتە من بە دەستی خۆم، خـۆم دروست کردووە. بڕوانامەی خوێندنی باڵام هەیە، پێگەم لە دەوڵـەت دیارە، سامان و نیشـانەم هەیـە. ئەمـەش بەڵگەیـە کـە ئـەوەی ئـەو قسـەیەی کـردووە گوایـە مـرۆڤ دروسـتکراوی ژینگـە و کۆمـەڵگا و خێزانەکەیەتی، ئەمە دروست نییە. وەردی وەڵامی دەداتەوە: بەڵێ تۆ ڕێساکەت بەزاندووە، هەر ڕێسایەك ڕیزپەڕی خۆی هەیە. دواتر وەردی لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە وتی" ئـەو پیـاوە نکـۆڵی لـەوە دەکات باوکی باڵابەرز بووە، دایکیشی لەنێو ژناندا کورت نەبوو. کەواتـە بـە بۆماوەیی باڵابـەرزە، جیـا لەمـەش لـە تێکـەڵبوونی دووکـەس بـووە هەردووکیان جـوان بـوون. بـۆ نموونـە ئەگـەر ئـەو کـوڕە باوکەکـەی کورتەباڵا بووایە و دایکیشی ناشیرین بووایە، ئەوا جوانییەکەی خۆی لە کێ دەهێنا. بڕوانامەکەشی بەڵگەیە بۆ دەوڵەمەنـدی بـاوکی، کـە ئەوی ناردۆتە بەرزترین زانکۆ، پارەیەکی زۆر و زەوەندی لـێ خـەرج کردووە. ئەگـەر بـاوکی دەوڵەمەنـد نـەدەبوو، ئـەوا کوڕەکـە بـەهۆی زیرەکییـە سـنووردارەکەی هـەرگیز نەدەچـووە زانکـۆ. هـەموو ئـەو قسانەش لەبارەی سـامان و زەوییـەکان دروسـتە کـە لـە باوکییـەوە بەجێماوە و ئەوی دەوڵەمەند کردووە. لەوانەشە ئەو سامانە بەهۆی کەم تێگەیشتنی لەناوبچێت.

وەردی وتی" ئـەم سیاسـەتمەدارە پڕوپووچـە، بـە زەبروەشـاندنی

ڕکابەرەکانی ناسراوە، هەمیشە لە پێگەی خۆی دەترسێت. قبوڵی بیستنی بۆچوونێك ناکات پێچەوانەی بۆچوونی ئەو بێت. بۆیە بەمشێوەیە وەڵامم دایەوە گوایە ئەو لە ڕێساکە ڕیزپەڕە، ئەو مەزنە ڕێساکەی شکاندووە. بەڵام لە کتێبەکەم سینەمای بەغدا، ئەو پیاوەم لە ماڵی (هیبۆ) دەرخستووە[1] و لە فراوانترین دەروازە خستومەتە ناو مێژووەوە.

## وەردی وەک ئیسلامییەک

ڕۆژێك لە ڕۆژان وەردی ئیسلامی نەبووە، باوەڕیشی بەو دروشمە نەبووە کە دەڵێ" ئیسلام چارەسەرە". بەڵکو ئەو بڕوای بە پڕاگماتی سیاسی هەبوو، بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسی جا لەژێر هەر ڕێبازێکی وشیارانەی سیاسی بێت. کاتی خۆی دێت ئەمە باس دەکەین. بەڵام چۆن وەردی ئیسلامی بوو، وەردی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە: ئەو کاتەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەمانخوێند، یەکێك لە مامۆستاکان هاتە ژوورەوە کە قوتابی زانای بەناوبانگی کۆمەڵناسی دیل کارنگی بوو. وانەکەی لەبارەی بۆچوونە بەرامبەرەکان بوو لە سروشتدا و باوەڕی هەر کەسێك بەوەی هەیەتی لە بنەما و بۆچوونی ئەوانی دیکە باشترە. بۆیە باوەڕی وایە و ناشکرێت تەنها بە مشتومڕ بۆچوونێکی دیکەی پێ بدرێت. بەڵکو لەسەرتە بنەمای بەهاکانی ئەو بگۆڕیت بۆ ئەوەی بۆچوونێکی دیکە لە

[1](لە ماڵی هیبۆم دەرخستووە) گوزارشتێکی کۆنی بەغدادییەکانە بۆ دەرخستنی کەموکوڕی کەسێك بەکاردێت. بەپێی ئینسکلۆپیدیای (عەبود شالجی) (هیبۆ) گەوادێکی ژن بووە لە سەرەتای سەدەی بیستەم، لە ماڵەکەی کاری لەشفرۆشی کردووە – وەرگێڕ

سیستەمی بیرکردنەوەی جێگیر بکرێت. مامۆستاکە وتی ئەم تیۆرە نوێیە لە داهێنراوەکانی دیل کارنگییە کە بیرمەندێکی کۆمەڵایەتی ناسراوە.

وەردی بۆ سەرنجدان دەست بەرز دەکاتەوە. مامۆستاکە دەڵێ با بزانین لەلای وەردی چ هەیە؟ وەردی دەڵێ ئەم تیۆرە نوێ نییە، بەڵکو لە کولتووری ئیسلامی نزیکەی ١٣٠٠ ساڵ دەبێت باس کراوە. قورئانی پیرۆز بە ڕوون و دیارکراوی باسی ئەوەی کردووە کە تۆ ئێستا باستکرد... مامۆستاکە سەرسام دەبێت و داوا لە وەردی دەکات ئەوەی قورئان لەگەڵ وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەی لەسەر تەختەکە بنووسێت. بۆئەوەی قوتابییەکان لە میانەی وەرگێڕانەکەوە لە بابەتەکە بگەن. وەردی ئەم ئایەتە دەنووسێ" كل حزب بما لديه فرحون". وەردی دەڵێ مامۆستاکە وەرگێڕانەکەی خوێندەوە و دواتر سەیری منی کرد و وتی تۆ دڵنیای محەمەد بەر لە ١٣٠٠ ساڵ ئەمەی وتووە. وەردیش دەڵێ ئێمە باوەڕمان وایە خودا ئەمەی بە پێغەمبەر گەیاندووە، ئەویش بۆ ئێمەی گواستۆتەوە. مامۆستاکە دەڵێ، ئەمە لووتکەی بلیمەتی محەمەدە. وەردی دەڵێ ئێمە پێمان وایە پێغەمبەرایەتییە. دکتۆرەکە وەڵامی دەداتەوە: من بە لووتکەی بلیمەتی دەزانم، ئەمەش نزیکە لە پێغەمبەرایەتی، بەڵام ناتوانم بڵێم ئەمە بەڵگەیە بۆ پێغەمبەرایەتی، چونکە ئەوە ناچارم دەکات وەك پێغەمبەرێك قبوڵی بکەم، ئەمەش پێچەوانەی باوەڕی منە لە ئێستادا. بەڵام پێم وایە ئێوە لەسەر هەقن ئەگەر بە پێغەمبەری بزانن، کێ دەزانێ لەوانەیە بەر لەوەی ببمە مامۆستای کۆمەڵناسی ئەگەر دەمخوێندەوە ئەوا باوەڕم پێی دەبوو.

وەردی دەڵێ مامۆستاکەی کۆمەڵناسی بایەخی بە ئایەتە پیرۆزەکە دەدا و شرۆڤەی دەکرد. تێبینییەکانی تۆمار دەکرد لەبارەی ئەوەی لە چ ڕوویێکەوە پێش زانست کەوتووە، لەوانەش کورتییەکە بوو، درێژ و شرۆڤەکراو نییە، کورتیش نییە بە شێوەیەك بێت مانای تەواو نەدات. بۆیە تەواو گونجاوە. لە هەمان کاتیشدا تیۆرێکی کۆمەڵناسی دیار دەکات کە ئەو ڕۆژە بابەتی وانەی ئێمە بوو. ئامازەیە بۆ کامەرانی و خۆشحاڵی هەر کەسێك بەو بیروباوەڕەی هەیەتی. هەروەها ئامازە بۆ مرۆڤایەتی هەر کۆمەڵە مرۆڤێك دەکات کە باوەڕیان بە بیرۆکەیەکی هاوبەش هەیە. هەرچەندە ناوی جیاجیا بۆ خۆیان بەکاردەهێنن، بەڵام هەریەکەیان (حزب) ە. خودی وشەی حزب لەلای کۆمەڵناسیی نوێ جێگەی مەبەستە. مامۆستاکە چەندین جار ئەوە دووبارە دەکاتەوە کە ئەم ئایەتە، یان ئەو قسەیەی محەمەد ئامازەیە بۆ بلیمەتی ئەو!

وەردی دەڵێ: بە مامۆستاکەم وت تۆ هێشتا قسەکە دەدەیتە پاڵ محەمەد. ئەو پێغەمبەری خودایە و قسەکانی خودای بۆ ئێمە هێناوە. مامۆستاکە دەڵێ" لەوانەیە قسەی خودا بێت، کەسێك ناتوانێ زیاتر لە سەدان سەدە بەر لە ئێستا ئەم قسەیە بکات. من بەدواداچوون بۆ تێزە زانستییەکانی دیکەی ئیسلام دەکەم بۆئەوەی بزانم چی دەڵێ. دواتر هەڵوێستی خۆم دیاردەکەم، کەواتە تۆ بەو پرسیارانە شەرمەزارم مەکە کە من وەڵامم بۆیان نییە، هەروەها ئاگاداریان نیم. وەردی بە تیۆرەکەی کارنگی وەڵامی مامۆستاکەی دەداتەوە کە دەڵێ" هەر کەسێك باوەڕی بەوە هەیە ئەو بنەما و بۆچوونانەی هەیەتی باشترینە. بۆیە تەنها بە مشتومڕکردن ناتوانی وا بکەیت بڕوای

دیکەی هەبێت، بەڵکو دەبێت بنەمای بەهاکانی داڕمێنی، بۆئەوەی بتوانی بۆچوونی دیکە بخەیتە عەقڵی ئەو".

ئەوکاتە مامۆستاکە بە ماناوە سەیری وەردی دەکات و دەڵێ" بەڵێ، ئەی وەردی".

وەردی ئەم بەسەرهاتەی لەبەردەم خەڵك نەگێڕاوەتەوە، لە کتێبەکانیشی باسی نەکردووە. خۆی پێ هەڵنەکێشاوە وەك لەم ڕۆژگارەمان هەندێك کەسی سەر بە ڕەوتە ئیسلامییەکان دەیکەن، چیرۆکی خەیاڵی هەڵدەبەستن. بەڵکو ڕۆژێك لە چوارچێوەی بابەتەکەی لەبارەی جیاوازی بیروڕای خەڵك باسی کرد. ئەمەش بە ئامادەبوونی مامۆستا مەحفووز بوو کە بەسەرهاتەکە گریاندی. لەگەڵ مامۆستایان سەلام شەماع و باسل خەزرەجی و عەبدولموتەڵیب مەهدی عەبوود ئامادە بوون، منیش لەوێ بووم. وەردی قسەکانی لەبارەی (حزب) تەواو کرد کە بەوەی هەیەتی دڵخۆش دەبێت و باوەڕی وایە هەقیقەت تەنها لەلای خۆیەتی. لەوانەشە حزبەکانی دیکە لەگەڵ خۆی ببات، جا باوەڕیان پێی هەبێت یان نا، ئەمەش دەبێتە هۆی کارەساتێك کە ئەنجامەکەی خوازراو نییە.

## وەردی وەك عروبییەك

لەوانەیە کەس باوەڕ بەوە نەکات کە عەلی وەردی نەتەوەخواز بووە، بیرۆکەی عرووبی هەبووە. ڕاستە وەردی لە بەرامبەر کەسانی دیکە مرۆیی بووە، بەهیچ شێوەیەك نەتەوەیەکی لەسەرووی نەتەوەیەکی دیکە دانەناوە. ڕۆژێك لە ڕۆژان بۆ نەژاد و مەزهەب دەمارگیریی نەبووە، بەڵکو دەمارگیری و بەرگرییەکەی هەمووی بۆ زانست بوو، جا لە هەر شوێنێك بووایە لەلای هەر کەسێك بووایە.

وەردی ڕۆژێك عرووبی دەبێت لە هەموو ئەو دەوڵەتانەی کە باوەڕیان بە نەتەوایەتی عەرەبی هەیە. ئەمە کاتێك زۆر ڕوون بوو کە هێرشی کردە سەر فەرمانبەرێکی پەساپۆرت کە پرسیاری لە ڕەچەڵەکی وەردی کردبوو، نەبادا فارس بێت. ئەم باسە لە سەردەمی بەعس بوو کە لە نێوان ساڵانی ١٩٦٨ – ٢٠٠٣ حوکمڕانی عێراقیان کرد. ئەم حزبە پێی وابوو نەتەوەی عەرەب یەك نەتەوەیە و یەك پەیامی نەمریان هەیە. لە بەختەوەریمان لەم ڕووداوەدا مامۆستا سەلام شەماع لەگەڵ وەردی دەبێت، کاتێك دەچێتە فەرمانگەی پەساپۆرت و دیداری ئەفسەری پەساپۆرت دەکات. با قسەکانی مامۆستا سەلام شەماع لەمبارەیەوە بخوێنینەوە: " سەبارەت بەم تۆمەتە لە ڕووداوێکی گرنگ یاوەری وەردی بووم. لە کاتی جەنگی نێوان عێراق و ئێران، وەردی داوای لە من کرد بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەساپۆرت یاوەری بکەم بۆئەوەی پەساپۆرتەکەی نوێ بکاتەوە. کاتێك چووینە ژووری ئەفسەرەکە بینیمان کۆمەڵێك ژنی لەلایە، ئەم ئەفسەرە ویستی هەندێك وەردی سووك نیشان بدات. پەساپۆرتەکەی بە دەستەوە گرت و هەڵی دەشەقاند، وتی: ئێوەی بنەماڵەی وەردی ڕەچەڵەکتان چییە؟ ئەگەر (تەبەعی)ین ئەوا تەسفیرتان دەکەین؟ ئێوە لەکوێ هاتوون؟ وەردی بەهێمنی وەڵامی دایەوە و وتی" بەخوا ئێمە خەڵکی حیجازین، بەڵام تێوەگلاین و هاتینە عێراق! "

بەڵام مامۆستا شەماع لە کتێبەکەی لەبارەی وەردییەوە دەڵێ وەردی وەڵامی پیاوەکەی دایەوە کە وەردی بە فارسبوون تۆمەتبار کردبوو. ئەم دەقەی خوارەوەی مامۆستا شەماع لە دیمانەیەك هاتووە کە لەگەڵی ئەنجام دراوە" بەڵێ وەردی بەوە تۆمەتبار کراوە کە

فارسە کەچی خانەوادەکەی حیجازییە و عەرەبی ڕەسەنن. خاوەن کتێبی (في الادب وما اليه) لەبارەی وەردییەوە دەڵێ: بە بڕوای من وەردی نەوەیەکی تازەیە لە کۆچبەرە فارسەکان کە هاتوونەتە عێراق. وەردی وەڵامی ئەو تۆمەتەی داوەتەوە و پووچەڵی کردەوە، ئەمەش لە پێشەکی کتێبی (من وحي الثمانين) بوو، لە چاپی دووەم و سێیەمیدا.

دوور لەو تۆمەتانەی کە وەردی لە سەردەمی ڕژێمێکی نەتەوەیی بەدەستیەوە ناڵاندوویەتی. کەچی هەڵوێستێکی نەتەوەیی ئەوتۆی لە بابەتە نەتەوەییەکان هەبوو، لەوانەیە زۆرێک لە دەوڵەتان ئەم هەڵوێستەیان نەبووبێت. ئەمەش وایکردووە ئەم بەشە ناو بنێم وەردی وەک عرووبییەک.

هەڵوێستەکەی وەردی لەمەی خوارەوە پوخت دەکەینەوە: کاتێک شۆڕشی تونسی لە ساڵی ١٩٥١ بۆ ڕزگاربوون لە دەسەڵاتی فەڕەنسا شکستی هێنا، شۆڕشگێڕان لە ترسی زەبری فەڕەنسا بۆ وڵاتانی عەرەبی ڕایان کرد. هەندێك لە شۆڕشگێڕەکان گەیشتنە بەغدا، بەڵام ئەو کات حکومەتی عێراق بودجەی دانابوو، بەندێك لە بودجە نەبوو ڕێگە بدات پارە بە ئاوارە تونسییەکان بدرێت. بۆیە ناچاربوون ئەوان لەو بەشە ناوخۆییانە جێگیر بکرێن کە بۆ قوتابیانی پارێزگاکان تەرخان کرابوو.

ئەم بابەتە لە میانەی قوتابییەکانەوە دەگاتەوە وەردی. بە هەستی نیشتیمانی بەرزی و بە ئاکارە بەرزەکەی هەست دەکات ئەم شۆڕشگێڕانە پارەیان نییە ئەو ماوەیە پێی بژین تا حکومەت چارەسەریان بۆ دەدۆزێتەوە. وەردی لە چاوەڕوانی دەرچوونی

کتێبەکەی بوو بەناوی (سروشتی تاکی عێراقی) ئەم کتێبە هەرچەندە لە ٨٠ لاپەڕە کەمتر بوو بەڵام بە هەوێنی کتێبەکانی دیکە دادەنرێت. وەردی نرخێکی زیاتری لەسەر ئەو نامیلکەیە دانا کە ئەو کات پەنجا فلس بوو، بۆ هەر دانەیەك. داوای لە قوتابییە دەوڵەمەندەکانی کرد کتێبەکە بکڕن. قوتابییەکانی دیکەش نامیلکەکە بەرەو کەسایەتی و پیاوماقوڵان دەبەن، قازانجی کتێبەکەش بۆ ئەو شۆڕشگێڕە تونسییانەیە کە لە تونسەوە هاتوون و حکومەتیش چارەسەری بۆ ئەوان نییە.

جا وەردی ئیسلامی بوو، لە بەرامبەر مامۆستاکانی لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا داکۆکی لە پێغەمبەر و قورئان دەکات. لێرەش عرووبی دەبێت داکۆکی لەو شۆڕشگێڕە تونسییانە دەکات کە لە وڵاتی خۆیان وەدەرنراون، دوای ئەوەی لە شۆڕشی بەدەستهێنانی ئازادی شکستیان هێناوە. خۆی بەو کارە نەتەوەیی و مرۆییەی هەڵنەکێشاوە، بە کەسی نەگوتووە، لە کتێبەکانی باسی نەکردووە. ئەم بەسەرهاتەی تەنها لە نێوان خۆم و خۆی باسکردووە. ئەمە کاتێك بوو کە باسی لە دەرکەوتنی کتێبی (سروشتی تاکی عێراقی) دەکرد، کە بە ئیمزا بەڕێزەکەی خۆی پێشکەشی کردووم.

## وەردی: قەحپەخانەی بەغدا دامەخەن

کتێبی مێژوویی دەڵێن هۆلاکۆی سەرۆکی مەغۆل کاتێك دەگاتە بەغدا شوێنێك دەستنیشان دەکات بۆ ئەوەی سەری نەیارەکانی تێدا ببڕێت. ئەم شوێنە بە زمانی مەغۆلی کە بەشێکە لە زمانی تورکی بە (کلجی) دەناسرێت. وشەکە لە زمانی فارسی و تورکی بە واتای سەر هاتووە. ئەم شوێنەش بەلای خەڵکەوە نەگبەتە چونکە خوێنی تێدا

ڕژاوە. دواتر لەشفرۆشەکان دەیکەنە شوێنی خۆیان و تێیدا دەژین. تا ئەو کاتەی حکومەتی نیشتیمانی دادەمەزرێت و فەیسەڵ دەبێتە مەلیکی عێراق. حکومەتی عێراقی بڕیار دەدا لەژێر چاودێری وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی، پشکنینی تەندروستی بە شێوەیەکی مانگانە بۆ ئەو ژنانە بکرێت کە لەو شوێنە کاردەکەن.

نوێنەران لە سەردەمی فەیسەڵی یەکەمەوە ناڕەزایی لە بەرامبەر ئەو قەحپەخانەیە دەردەبڕن و داوای داخستن و نەهێشتنی دەکەن. بەڵام هەموو ئەو حکومەتانەی هاتن بڕیاری داخستنیان نەدا. بارودۆخەکە وەك خۆی مایەوە تا ئەو کاتەی محەمەد فازڵ جەمالی لە ١٩٥٣ بووە سەرۆك وەزیران، یەکسەر بڕیاری داخستنی کلجیەی داو ڕێگری لە لەشفرۆشی فەرمی کرد لە عێراق. ئەمەش بڕیارێکی دەگمەن بوو لە عێراق، بۆیە بڕیاری داخستنەکە دەگاتە نەجەف. ئەو کاتە شێخ محەمەد عەلی یەعقووبی چەند دێڕە شیعرێك دەنووسێ و ڕەوانەی بەغدای دەکات بۆ ئەوەی لەنێو خەڵك بڵاو ببێتەوە لە شیعرەکە دەڵێ:

**وقالوا ببغداد الجمالي قد محا مـنازل قوم دنستها العواهر**

**لقد طهروا منها الديار ولم يكن لتطهر من ابنائهن الدوائر**

کەسێك نەبوو لە عەوامی خەڵك بەم هەواڵە دڵخۆش نەبێت، تەنها زیانلێکەوتووەکان نەبێت بە ژن و پیاوەوە، لەگەڵ دکتۆر عەلی وەردی کە بەوە نەناسراوە هامۆشۆی ئەو شوێنانەی کردبێت. سەبارەت بەوانەی زیانیان لێکەوتووە بە ژن و پیاوەوە، زۆرێك شوێن هەیە داڵدەیان بدات، ئەی سەبارەت بە وەردی بۆچی لەگەڵ داخستنی قەحپەخانەکە نەبوو؟

وەردی دەڵێ: قەحپەخانەکە هەموو ژنانی لەشفرۆشی لە یەك شوێن کۆدەکردەوە. شوێنەکەش لەژێر چاودێری وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی بوو، لە ڕووی چاودێری بژێوییەوە. لە ڕووی پشکنینەوە لەژێر چاودێری وەزارەتی تەندروستی بوو، کە پشکنینی (ژنە کارکەرەکان) ی دەکرد، وەردی ژنە لەشفرۆشەکانی بەم ناوە ناودەبرد.

وەردی دەڵێ: دوای داخستنی ئەم قەحپەخانەیە کۆمەڵگای عێراقی ڕووبەڕووی کێشەی جێکردنەوەی ئەو ژنانە دەبێتەوە. بە هەموو گەڕەکەکانی بەغدا بڵاو دەبنەوە. لەوانەیە لە دراوسێتی خەڵکی ئابڕومەند کارەکانی خۆیان بکەن، بەمەش تێکەڵ بە کۆمەڵگا دەبن و کاریگەرییان بەسەر ژنانی دیکەوە دەبێت. لەوانەشە ببنە خزمەتکاری ماڵان، ئینجا کاریگەرییان بەسەر خاوەن ماڵ و ژن و کچەکەی دەبێت. جا ئەو ژنانە کاتێك لەژێر چاودێری وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی دەردەچن، شەقام چاوەڕوانیان دەکات. لەوکاتەشدا لەشفرۆشی زیاد دەکات لەبری ئەوەی کەم ببێت، بێ یاسا و چاودێریش دەبێت. ئینجا تاوانیش زیاد دەبێت. لە کۆتاییدا: دوای قەدەغەکردن سەرپەرشتی تەندروستی نابێت، پشکنینی ناوە ناوە نابێت، ئەو ژنانە بە خۆیان و نەخۆشییە سێکسییەکانیان تێکەڵ بە کۆمەڵگا دەبن، نەخۆشییەکان بۆ کۆمەڵگا دەگوازنەوە.

## ڕوانگەیەک بۆ پێوەرە ئاوەژووەکان

دکتۆر وەردی لەوە ڕاهاتبوو، هەندێك لەو داب و نەریتانەی دەگواستەوە کە کۆمەڵگای ڕۆژئاوای پێ جیا دەکرایەوە، لەگەڵ ئەو

واقیعە بەراوردی دەکرد کە کۆمەڵگای ڕۆژهەلات تێیدا دەژیان. لە میانەی بەسەرهاتی پەندئامێز و زەردەخەنەی گاڵتەجاڕی هەوڵی دەدا وێنەی ئەم دابونەریتانەی نمایش بکات. ئەو بەسەرهاتانەی بۆ ئێمە دەگێڕایەوە، دواتر جیاوازییە زۆرەکەی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای شرۆڤە دەکرد لە بیرکردنەوە و جێبەجێکردندا، ئەمەش هەر لە میانەی بەراوردکارییەکاندا بوو.

وەردی دەیان چیرۆکی گێڕاوەتەوە، ئەوەی گوێی لە وەردی گرتووە، ئەزبەری کردووە. شێوازی دارشتنەوە و پێشکەشکردنی چیرۆك و بەسەرهاتەکان ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لەوەی کۆمەڵگای عێراقی قبوڵیان بکات. بە ڕاشکاوی دەڵێم لە میانەی هامۆشۆکردنم لەگەڵ وەردی و ئەوانەی لە دەوروبەری ژیاون، جێگەی داخە ئامۆژگارییەکانی وەردیمان جێبەجێ نەکردووە، کە دوای مردنی وەردی کردمان بە بابەتێك بۆ خۆمان بۆ خۆدەرخستن بە پەروەردە و ژینگەکەمان، کەچی بە منیشەوە کەسێك نەبوو پەندەکانی وەردی لە خودی خۆی جێبەجێ بکات. من ناچاربووم جێبەجێیان بکەم، لەبەر ئەوە نەبوو گوایە قوتابییەکی پاکی وەردی بم، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو لە بەریتانیا دەژیم کە یاسا و پێوەری تایبەتی خۆی هەیە. منیش لەو کەسانە نیم سەرپێچی یاسا بکەم، بەتایبەتی ئەگەر یاساکەش لەو جۆرە بێت کە مافەکان دەستەبەر بکات و ئەرکەکانت دیار بکات. ئەمەش تەواوی پێچەوانەی ئەو یاسایانەیە کە لە ولاتانی ئیسلامی ڕۆژهەلات هەیە. خوا لەو یاسایانە بەدوورتان بگرێت.

## پێوەری شادی و خەمباریی

" ئایا گوێتان لە گریانی بوو، ئەو دەکڕوزێتەوە، ناڵەی بەرزی ئەو

بەرد دەگرییێنێ. پێویستە لەسەرمان، بەتایبەتی ئێوە هاوڕێی ئەون، کێشەکەی چارەسەر بکەین. من شەرم دەکەم پرسیاری لێ بکەم. ئەو لە حەمام دەگری و دەناڵێنێ. دواتر بە شادی و کامەرانی دێتە دەرەوە، لەوە دەترسم قسەی لەگەڵ بکەم، لەوانەیە هەست بکات کەسێك پێشێلی تایبەتمەندییەکانی دەکات، چاوەڕێم ئێوە قسەی لەگەڵ بکەن، بۆ ئەوەی لە حاڵەتی ئەم پیاوە چاکە ئاسوودە بم!".

ئەمە زۆر لە تێکیستێکی گێڕانەوە دەچێت. کە پیرەژنێکی بەریتانی خاوەن ماڵ، بۆ هاوڕێیەکانی وەردی گێڕاوەتەوە، سەبارەت بە وەردی کە پشووی هاوینە لە بەریتانیا بەسەر دەبات. وەك نەریت بوو هەندێك لەو پیرەژنانە ماڵەکانیان بەکرێ بەو قوتابیانە دەدا کە دەهاتنە بەریتانیا. ئەم نەریتە هەتا ئێستاش لەلای هەندێك خاوەن ماڵ ماوە. ڕووداوەکە لە پشووی هاوینی دوای کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی بوو. ئەو کات ئەورووپا بە پرۆژەی مارشاڵی ئەمریکی دەبووژایەوە. جەنگ کۆتایی هاتووە، ئەی وەردی بۆ دەگری؟

هاوڕێیانی وەردی، کە ژمارەیان کەم بوو، لە باروودۆخی وەردی نیگەران دەبن. چونکە پیرەژنەکە باسی لە حاڵەتێکی دەروونی دژوار کردووە کەسێك بە دەنگێکی بەرز لە حەمام دەگریت. کرانەوەی هزری وەردی لە بەرامبەر خەڵك و گوێگرتن لەو کەسانەی قسەی بۆ دەکەن، کاری پرسیارکردن ئاسان دەکات، بۆیە پرسیاری لێ دەکەن: لە حەمام چییت دەکرد؟

وتی: خۆم دەشووشت.

وتیان: هیچی دیکەت دەکرد؟

وتی: نەخێر.

وتیان: خاوەن ماڵ گوێی لێبووە دەگری و دەناڵێنی. ئایا کێشەیەکت هەبووە. دەڵێ گریان و ناڵەکەش بە دەنگێکی بەرز بووە، هەموو جارێك لە حەمام ئەو کارە دەکەیت.

وەردی وتی: بەڵێ هەموو جارێك بچمە حەمام، لەبەر خۆم هەندێك گۆرانی خۆشی عێراقی دەڵێم!!

وەردی دەڵێ کاتێك گۆرانییەکەم بۆ پیرەژنەکە دووبارە کردەوە، وتی بەڵێ لە حەمام گوێبیستی ئەوە دەبووم. پیرەژنە بەریتانییەکەیان تێگەیاند کە ئەمە گۆرانی عێراقییە. وەردی گۆرانی دەڵێ، گریان و ناڵە نییە وەك پیرەژنەکە وێنای کردووە. پیرەژن دەڵێ بۆچی ئەو هەموو خەم و پەژارەیە لە گۆرانی ئێوە هەیە. ئایا نازانن گۆرانی داهێنراوە بۆ ئەوەی خەڵك دڵخۆش بکات، بۆچی بە گۆرانی دەگرین؟!

چەمکەکان لە نێوان بەریتانیا و عێراق ئاوەژوو دەبێتەوە. گۆرانیش ڕەنگدانەوەی ئەو ژینگەیە کە تێیدا گەشە دەکات و باس لەو چەمکە کۆمەڵایەتییانە دەکات کە کاریگەرییان بەسەر ژینگەکەوە هەیە. بۆیە گۆرانی لە بەریتانیا بانگەشە بۆ ئومێد و خۆشەویستی و کامەرانی دەکات. بەتایبەتی دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی، کۆمەڵگای بەریتانی خۆی بە سەرکەوتوو دەزانێ و دەیەوێ خۆی لە ژێر قورسایی شەش ساڵی جەنگ ڕاست بکاتەوە.

گۆرانی عێراقیش لەلایەن خۆیەوە ڕەنگدانەوەی ژینگەکەیەتی، دەسەڵاتی عەشایەری تێدا زاڵە. پاساوی ئایینی لەلایەن پیاوانی ئایینیەوە بە کارەکانی شێخی عەشیرەت و دەسەڵاتدار دەدرێت. خۆشەویستی لە کچ قەدەغە دەکرێت، هەموو شتێك بۆ پیاو ڕێگەی پێ دەدرێتن بەتایبەتی ئەگەر دەسەڵاتدار بێت. زەواجی ناچارکردن و

ژن بە ژنی، کە تێیدا زاوا دەبێت خوشکی خۆی بە برای ژنەکە بدات. یان دەبێت دایکە بێوەژنەکەی خۆی بە باوکی کچەکە بدات. جگە لەمەش زەواجی سوڵح هەیە، کە ئەمەش لەسەر فەرمانی شێخەکانی عەشیرەتە کە کێشەیەکی عەشایریان یەکلاکردۆتەوە. ئەو کەسەی تاوانبار کراوە دەبووایە خوشکەکەی یان کچەکەی وەك بەشێك لە سوڵحەکە بدات بە لایەنەکەی دیکە. یان کچێك تازە لەدایکبووە بە بنپشك دەدرێتە ئامۆزاکەی. خانمە گۆرانیبێژێکی عێراقی بە شادییەکی زۆر سەما دەکات و لە گۆرانییەکەی دەڵێ" دەچمە لای مەلا عەلی... دەڵێم مەلا عەلی... ئەو پیرە و من جاحێڵم... بە سوڵح منیان پێداوە". واتە ئەو گلەیی دەکات و دەچێتە لای مەلای گوندی، باسی چەوساندنەوەی عەشیرەتەکەی دەکات، کە ئەو کیژۆڵەیەکە بە پیاوێکی پیر دراوە، ئەمەش لە ڕێگای سوڵحی عەشایەری بووە! خۆشحاڵیە بێسنوورەکەی گۆرانیبێژەکە بە ڕووداوەکە و سەما جوانەکەی تا ڕادەیەکی زۆر بە خۆشحاڵییەکەی عەلی وەردی دەچێت کاتێك لە حەمامدا گۆرانی دەڵێ.

سەرەڕای هەموو ئەو کارەساتە کۆمەڵایەتییانە، چەوسانەوەی دەربەگەکان هەبووە کە لە بەرامبەر جووتیاران ئەنجامیان داوە. لەگەڵ چینایەتی و خزمایەتی و ڕەچەڵەکخوازی و هۆزگەرایی کە بەشێکی زۆر لە کۆمەڵگای عێراقی پێك دەهێنێت. ئەمەش بواری توێژینەوەکانی وەردی بوو..

لەم ژینگەیەدا گۆرانییەکانی وەردی دەرکەوتووە کە لە حەمام دەیچڕێ و پیرەژنی بەریتانی دڵتەنگ و خەمبار دەکات. خەریك بوو بیباتە لای پزیشکی دەروونی، کەچی هونەرمەندی حەمام بە دڵخۆشی

و گەشاوە دێتە دەرەوە. واقیعی کۆمەڵگایەك دەنوێنێ هەرچەندە لە ڕووی مـەودای زەمەنییـەوە لێـی دوور کەوتۆتـەوە، بـەڵام لـە دڵـەوە لەگەڵی دەژی.

## پێوەری شەڕەف و ڕاسپاردەیی

هێشتا قسە لەسەر ئەو پێـوەرە ئاوەژووانـە دەکـەم کـە وەردی لـە ڕۆژئاوا بینیویەتی، لەگەڵ خۆی هێناوەتەوە عێراق، بەو سیفەتەی کە زانای کۆمەڵناسـە و چارەسـەری سیحری لایـە. بـەیانی هەینییـەکی مانگی نیسان لە بەغدا یـاوەریم دەکـرد. بـەهۆی پشـوو شـەقامەکان نیمچە خاڵی بوون لە ڕێبواران. دوای ئەوەی ئۆتۆمبیلەکەم لەبەردەم ماڵەکـەی ئـەو جێهێشــت، بـە یـاوەری ئـەو بـەرەو مـاڵی دکتــۆر عەبدولحەمید هیلالی ڕۆیشتین کە مەجلیسی هەفتانـەی تێدا ئـەنجام دەدرا.

من و وەردی بەرەو مەجلیسەکە دەڕۆیشتین، لە شوێنێك کە زۆر لە ماڵەکەی وەردی دوور نەبوو، باخچەیەکی ساوایانی حکـومی هـەبوو، ئەویش وەك تەواوی دامودەزگاکانی دیکە بەهۆی پشووەوە داخرابوو. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەوەبوو یەکێك لە دراوسێیەکانی باخچـەی ساوایان سۆندەی ئاوی لە باخچەکەوە بۆ ماڵەکەی خۆی ڕاکێشابوو، بۆ ئەوەی ئاو لە باخچەی ساوایان بباتە ماڵەکەی و لەوێ تەنکییەکان بە ئاوی خۆڕایی پڕ بکات. مادامەکی باخچەکە لە پشووی هەفتانەیە.

وەردیم لەو ڕووداوە ئاگادار کـردەوە و داوام لێکـرد سـەرنج بـدات. وەردی بە دەنگی بێژەرێك کە بەیاننامەیەکی سـەربازی بخوێنێتـەوە وتی: بەڵێ ئەمە گیانی نیشـتیمانپەروەرییە کـە حکومـەت لـە نـاخی ئێمـەی چـاندووە ! دواتـر عـەلی وەردی دەسـتیکرد بـە گێڕانـەوەی

چیرۆکی پێوەری ئاوەژووی شەرەف لە لەندەن. وەردی لەوێ ژوورێکی لە ماڵی خانمێکی بەریتانی بەکرێ گرتبوو. ژنەکە نیگەران دەبێت لەوەی وەردی کڵاو بۆ ژنێکی بەساڵاچوو بەرز دەکاتەوە، کە لەسەری گەڕەکەکەیە. وەردیش سەرسام دەبێت و پرسیاری لێ دەکات: بۆچی کڵاوی بۆ بەرز نەکەمەوە؟ ئەی ئەمە دابونەریتێکی پەسەندی بەریتانییەکان نییە؟ ژنانی گەڕەك هەموویان بە جووڵەی سەر وەڵامم دەدەنەوە! بەڵێ من ناڕەزاییم تەنها لەو ژنەی سەری گەڕەك هەیە، ئەوانیتر نا، چونکە ژنەکە شەریف نییە! وەردی زەردەخەنەیەکی پڕ واتا دەکات، بەڵام ژنەکە بە هەستی ژنانەی خۆی لە نهێنیی زەردەخەکەی وەردی دەگات و دەڵێ" کاتێك فڕۆکەی نازییەکان لە جەنگی دووەمی جیهانی ئێمەی بۆردوومان دەکرد، باوەڕ دەکەی ئەو ژنە چراکانی نەدەکوژاندەوە، بۆ هەموو گەڕەکەکەی سەلماند کە ژنێکی شەریف نییە!".

وەردی تەریق دەبێتەوە، بەڵام درك بەوە دەکات پێوەرەکانی شەرەف لە نێوان عێراق و بەریتانیا ئاوەژووە. وەردی بە منی وت: دەزانی کاتێك بینیم ئەو پیاوە شەریفە ئاوی باخچەی ساوایان دەدزێ، بۆچی ژنە بەریتانییەکەم بیرکەوتەوە، ئەوەش بەسەرهاتی خۆی هەیە. ڕۆژێك ژنە بەریتانییەکە ماڵەکەی بۆ بۆیاغچی جێهێشت، وەردی سەرسام دەبێ و پرسیاری لێ دەکات چۆن ماڵەکەی بۆ پیاوێکی نەناسراو جێدەهێڵێ، لەوانەیە ماڵەکەی بدزێ؟ بۆچی لەلای ناوەستێ تا بزانێ کارەکەی چۆن دەکات، لەوانەیە لە کارەکەی شارەزا نەبێت؟ پیرەژنەکە پێدەکەنێ و پێی ڕادەگەیەنێ، پیاوەکە لەلای کۆمپانیایەك کار دەکات، ئەگەر کەسێك لە ونبوونی شتێکی

ماڵەکەی سکاڵا بکات، ئەوا کۆمپانیاکە سزا دەدرێت، ئەگەر سەلمێنرا ئەوا کرێکارەکەش زیندانی دەکرێت. سەبارەت بەوەی لە کارەکەی شارەزا نەبێت. ئەمەش مەحاڵە، چونکە موشتەرییەکانی لەدەست دەدا، کەسی بەدەستەوە نامێنێ و مایەپووچ دەبێت!

## وەردی و شەنفەڕا لە شەقامی موتەنەبی

ڕۆژێك لەگەڵ وەردی بەرەو شەقامی موتەنەبی ڕۆیشتین، لە بەغدا ئەو شەقامە بەناوبانگترین شوێنە بۆ فرۆشتنی کتێب. من ئەگەر دەرفەتم هەبووایە، لەوە ڕاهاتبووم ڕۆژانی هەینی سەردانی ئەو شەقامە بکەم، بۆئەوەی بزانم دوایین شت چییە گەیشتۆتە نەعیم شەتری خوالێخۆشبوو. کە بە مەزادکردنی کتێب ناسرابوو. ڕۆژێك وەردی پرسیاری کرد ڕۆژی هەینی بەرەو کوێ دەچم، منیش وتم موتەنەبی، وتی وەرە لەگەڵ خۆتم بەرە.

کاتێك لەگەڵ وەردی لە شەقامەکە دەڕۆیشتم، هەموو سەرنجم بۆ ئەو کتێبانەی سەر زەوی بوو، تا کتێبێکی دەگمەن یان قەدەغەکراو بدۆزمەوە. کەچی سەرنجی وەردی بەسەر دیوارەکانەوە بوو. کاتێك نەعیم شەتری لە کارەکەی تەواو بوو لەبەردەم دوکانەکەی دوو کورسی هێنا لەسەری دانیشتین. بە وەردیم وت ئەو کتێبانەم دەستنەکەوت کە پێشبینیم دەکرد دەستم بکەوێ. وەردیش وتی گاڵتەجاڕیی و بەفیڕۆدان و دەستبڵاوییمان دەسکەوت. بەڕاستی تووڕە بوو، منیش ڕووخۆش بووم لەگەڵی وتم چۆن دکتۆر؟

وتی: سەیری دیوارەکانی شەقامی موتەنەبیت کردووە، چۆن بە کەرپووچ نەخشێنراوە. وتم بەڵێ شەقامەکە کولتووری و جوان دەردەکەوێ. وەردیش وتی جا کاتی ئەوەیە؟ وتم کاتی کامە؟ وتی

عێراق بەدەست قەیرانی نیشتەجێبوون دەناڵێنێ. زۆرێك لە گەنجان کاتێك ژن دەهێنن لەگەڵ کەسوکاریان دەژین، ئەمەش زۆرێك لە کێشەی کۆمەڵایەتی دروست دەکات کە دەبێتە هۆی تەڵاق. کەچی دەوڵەت کەرپووچێکی زۆر بەهەدەر دەدات کە دەتوانێ خانوو بۆ گەنجان دروست بکات و کێشەی نیشتەجێبوون و قەیرەیی کچان چارەسەر بکات. پارە بەهەدەر دەدات بۆئەوەی شەقامەکان برازێنێتەوە و جوانی بکات بۆ ئەوەی کولتووری بێت.

وتیشی ڕۆژێك بیرت کردۆتەوە کە چەندە کەرپووچ و چیمەنتۆ، لە شەقامی موتەنەبی و شەقامەکانی دەوروبەری خەرج کراوە، ئەمە جیا لە شەقامی ڕەشید، بۆ ڕازاندنەوە تا وەك کولتووری بێت، ئایا کولتوور بە کەرپووچ نوێ دەردەکەوێ؟ گەنجان بەدەست نەبوونی دەناڵێنن (ئەو کاتەی لە قورسترین ماوەی ئابلۆوقەی ئەمریکا بوو لەسەر عێراق) شوێنێك نییە گەنجان تێیدا بژین. من لە مەدینەی سەورە چەندین ماڵی بچووك دەناسم کە چەندین خێزانی تێدا نیشتەجێیە. ئایا دەستبلاوییەکت دیوە وەك دەستبلاوی حکومەت بێت لە عێراق.

وتی شەنفەڕاش کێشەیەکی دیکەیە (شەنفەڕای ئەزدی یەکێکە لە شاعیرەکانی سەعالیك لە سەردەمی جاهیلی، ناوی ڕاستەقینەی عەمرو کوری مالیە، پێی گوتراوە شەنفەڕا چونکە لێوی ئەستوور بووە، لە ساڵی ٥٢٥ زایینی کوژراوە.)

وتم: دکتۆر شەنفەڕا چ پەیوەندییەکی بە شەقامی موتەنەبی هەیە؟

وەردی وتی: دەوڵەت بەو ئابلۆوقە کاولکارە تێدەپەڕێ. بە شێوەیەك ڕێگا نادرێ قەڵەم بە منداڵ و دەرمان بە نەخۆشان بدرێت، دەوڵەت

بێتوانایە لەوەی ئەو کێشەیە چارەسەر بکات کە دەبێتە هۆی مردنی زۆرێك لە خەڵك، کەچی هاتووە پارە خەرج دەکات بۆ ئەوەی چاپێکی دەگمەن بۆ دیوانی شەنفەڕا بکات و دواتریش بەخۆڕایی لە فیستیڤاڵی شیعری (المربد) دابەش بکرێت. پێم وایە دەبێت دەوڵەتێکی ئاوا بەردباران بکرێت لەبەر هیچ و پووچییەکەی، لە خەرجکردنی سامان بە شێوەیەکی ناماقوڵ، دەترسم ئەمەش بەئەنقەست بێت!

لەم گەشتەماندا بۆ شەقامی موتەنەبی وەردی لە شەقامەکە و لە هەدەردانی سامان تووڕە بوو، لە هەموو کتێبەکان تووڕە بوو بەتایبەتی لە شەنفەڕا. چونکە وەردی پێی وابوو چاپکردنی دیوانەکەی لەو پێداویستییانە نییە کە کۆمەڵگا لە ژێر ئابلۆوقەیەکی کوشندە پێویستی پێیەتی. لە کاتی گەڕانەوەمان بۆماڵەوە وەردی وتی حکومەتی وشیار لەگەڵ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی خۆی ناخاتە کێشەوە، تا دواتر بکەوێتە ژێر باری قورسی ئابلۆقەوە. بەڵام ئەگەر ڕوویدا ئەوا دەبێت دەستلەکار بکێشێتەوە. ئەگەر هاتوو ویستی دەستلەکار نەکێشێتەوە و ئابلۆوقەکە بەڕێوە ببات، ئەوا دەبێت ڕەچاوەی شتە گرنگەکان بکات، پێشینە بۆ ئەوان بێت. سیاسەتەکەی لەسەر ئەم بنەمایە جێبەجێ بکات تا ڕەوایەتی و متمانەی خەڵك بەدەستبهێنێ. نەوەك بەم گاڵتەجاڕییە کۆشك بۆ دەسەڵاتدار دروست بکات و بە نرخێکی زۆر مکیاژ بۆ ئەو شەقامانە بکات کە پیر و کەنەفت بوون!

## بە شەقامی (راس الحواش) تێدەپەڕێت و لە مەرقەدی کازمیە نوێژ دەکات

جاران خەڵکی بەغدا بە ماڵیان دەگوت (حۆش) هێشتا ئەو ناوە لە

وڵاتانی کەنداو بەکاردێت. ناوچەی (راس الحواش) لە ئەعزەمیەی بەغدا بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە، چونکە ماڵەکان لەوێ کۆتاییان دێت. بەڵام دوای فراوانبوونی بەغدا راس الحواش دوایین شوێنی ماڵەکان نەبوو بەڵکو ناوەڕاست بوو. لە دوایین ڕۆژانی پاشایەتی مەلیک فەیسەڵی دووەم پردی ئەئمەی کردەوە. کە دەکەوێتە کۆتایی شەقامی راس الحواش، بۆ ئەوەی ئەعزەمیە و کازمیە بەیەکەوە ببەستێتەوە. کازمیە شوێنی لەدایکبوونی وەردی بوو، ئەعزەمیەش ئەو شوێنە بوو تێیدا نیشتەجێ ببوو. ماڵەکەی دکتۆر وەردی ڕاستەوخۆ دەکەوێتە پشتی ناوچەی راس الحواش لە شەقامی حەریری لە ئەعزەمیە.

ناوچەی راس الحواش گەشەی کرد کە بە تەنیشت مەرقەدی ئیمامی ئەبوحەنیفەی نعمان بوو. لەوێ دوکانی جۆراوجۆری بازرگانی دروست بوو، ئەمەش وایکرد بازاڕێکی تێدا دروست بێت خەڵك لە هەموو ناوچەکانی بەغداوە بۆی دەهات. بە ئاوەدانی و قەرەباڵغی هەمیشەیی شەو و ڕۆژ، ناسرابوو. جیا لە بازاڕە ئاوەدانەکەی، ناوچەی بەیەکگەیشتنی کەرخ و ڕەسافە بوو.

حکومەت بۆی دەرکەوت ڕووداوی هاتووچۆ لە ئەعزەمیە زیاد بووە، بۆیە ویستی هەندێك ڕێکاریی ئەنجام بدات بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ ڕووداوەکان دابنێت. یەکێك لەو ڕێکاریانە دانانی زنجیری ئاسنین بوو کە بەدرێژایی شۆستە تەنگەکان دانرابوون، لە هەندێك شوێن دەرچەی بچووك هەبوو کە پەڕینەوە لەو دەرچانە بەهۆی نیشانەی ترافیك بوو. لەگەڵ تەنگەبەری شۆستەکان و زۆری خەڵك و کڕیاران، هەروەها بەرزی زنجیرەکان کە هەندێك جار دەگەیشتە شانی خەڵکێکی باڵا

مامناوەند، ئەوا ڕووداوەکانی کەوتنی خەڵك بەسەر شەقامەکانەوە زیاتر دەبوو، ئەمەش لە ئەنجامی قەرەباڵغی شۆستەکە بوو، بۆیە لەوانەبوو کەوتنیان تووشی مەترسی گەورەتری دەکردنەوە، کە حکومەت دەیویست کەمی بکاتەوە.

وەردی ئەگەر شەکەت بووایە، ناچار بوو بەرەو راس الحواش بچێت تا بۆ تاکسییەکان لەوێ بەرەو کازمیەی بەرن. یانیش لە زۆربەی کاتەکان بە پێ لە راس الحواش بەرەو پردی ئەعزەمیە دەڕۆیشت. لەوێ مەینەتی خەڵکی لەسەر ئەو شۆستە تەنگەبەرانە دەبینی کە بە زنجیر دەورە درابوو.

هەرچەندە ئەم پێشەکییە تۆزێك درێژ بوو، بەڵام پێویست بوو بۆ ناسینی تووڕەیی وەردی لە هەڵسوکەوتی حکومەت. جا وەردی لە ئەعزەمیەوە هاتە کازمیە بە پێ، بەدەست ئەو شۆستە تەنگەی کە لەلای پردەکە کۆتایی دێت، شەکەت بوو. بەڵام ئەو ئاراستەیەی کە لە ئەعزەمیەوە بەرەو کازمیە دەچێت لە بەرەی ڕاست داخرابوو، چونکە لەوێ باڵەخانەی هەواڵگریی سەربازی هەبوو، کە کازمیەی کردبووە زەوینەیەکی فراوانی خۆی. بۆیە ڕێبوارەکە ئەگەر بیویستایە لە ڕۆیشتنەکەی بەردەوام بێت ئەوا دەبوو بۆ بەرەی چەپ بپەڕێتەوە، یانیش سەرپێچی ڕێنماییە نووسراوەکان بکات، لەو کاتەشدا ڕووبەڕووی سەربازێکی بەدئاکار دەبۆوە و ناچاری دەکرد بپەڕێتەوە بەرەی چەپ.

وەردی وتی شەقامی راس الحواش سەرەڕای ئەوەی بەکەڵکی بەساڵاچووان نایەت، بۆ گەنج و هەرزەکارانیش زۆر ترسناکە، چونکە بەهۆی سروشتی تەمەنەکەیان بەپەلەن بۆ پەڕینەوە. هەروەها بۆ

خانمانیش زۆر ترسناکە ئەگەر بەسەر زنجیرەکان بەربینەوە. هەروەها پارەیەکی زۆری تێدا بەهەدەر دراوە. بە شێوەیەك ئەو زنجیر و بەستنەوە و بڕی ئاسنەی بەکارهاتووە، زیانە بۆ هاولاتی نەوەك سوود. لەوانەبوو ئەو سەبەبە و ئاسنە ئەگەر لە شوێنی دروستی خۆی بەکاربهاتبووایە زۆر قازانجی زیاتر دەبوو نەوەك لەو تەڵەیە خەرج بکرێت کە بە شەقام ناودەبرێت. دواتر وتی: کارەساتەکە ئەوەیە کاتێك لە نزیك پردەکە کۆتایی دێت هەست دەکەی لە دۆزەخی زنجیران نەجاتت بووە، کەچی پۆلیسێکی تووڕە هاوارت لێ دەکات بۆ ئەوەی بەنێو هاتووچۆی ئۆتۆمبیلەکانی نێوان کازمیە و ئەعزەمیە بپەڕیتەوە کە لە بەرەکەی دیکەی پردەکەیە. تووڕەبوونی وەردی زیاتر دەبێت و دەڵێ: ئەگەر ئەو زنجیرانە بۆ پاراستنی خەڵك لە ڕووداوەکان دانراوە. ئەی چۆن پۆلیسێك دادەنرێت تا داوا لە خەڵك بکات بۆئەوەی لە پردەکە بپەڕنەوە کە لەسەرووی پردەکە ئۆتۆمبیلی هاتوو نابینن کە بەخێراییەکی زۆر وەك تابووتێکی ئاسن بۆیان دێت!!

وەردیمان هێمن کردەوە، چووینە ناو مەرقەدی کازمیە، کاتێك ئێمە چووینە ژوورەوە کاتی بانگی مەغریب بوو. وەردی وتی" با بچین دەنووك بکوتین". مەبەستی ئەوە بوو بەخێرایی نوێژەکەمان بکەین. ئەمەش بەپێی ئەو فەرموودەیەیە کە پێغەمبەر نەهی لەوە کردووە، نوێژ بەخێرایی بکرێت وەك دەنووکی کەڵەشێر بێت. دوای نوێژ وەردی چووە ژووری کلیلدار، کە شێخ فازڵ شەبیبی بوو. کلیدار کەسێکی بەرپرسە لە مەرقەد. کاتێك چووینە ژوورەوە بینیمان خوالێخۆشبوو فازڵ سامەڕایی لەوێیە کە ئەو کات وەزیری ئەوقاف

بوو. بەخێرهاتنی وەردی کرد بەڵام وەردی ناڕەزایی لە بەرامبەری دەربڕی و مشتومڕی لەگەڵ کرد بە شێوازێکی تایبەت و جوان پێچەوانەی بۆچوونەکانی وەستایەوە. ئەم بابەتە بۆ بەشی سێیەمی ئەم کتێبە بەجێدەهێڵم، کە لەوێ باس لەو کەسانە دەکەم بە ئامادەبوونی من، وەردی مشتومڕی لەگەڵ کردوون!

## وەردی لە کڵێسای ئەرمەنی ئەرسۆدۆکس دەدرەوشێتەوە

کلێسای گریگۆری ئەرمنی ئەرسۆدۆکس دەکەوێتە باب شەرگی لە بەغدا. ئەو کڵێسایە بەر لەوەی باڵەخانە بەرزەکانی دەوروبەری بکرێت، بە دیمەنە جوانەکەی جیا دەکرایەوە. هەروەها ئەو کڵێسایە چالاکی تایبەتی هەبوو. لیژنەی ڕۆشنبیریی ئەو کڵێسایە بانگهێشتنامەیەکی ئاڕاستەی وەردی کردبوو، بۆئەوەی موحازەرەیەك لە کڵێسا بدات. هەروەها بانگهێشتی مامۆستا دکتۆر حوسێن عەلی مەحفووز کرابوو، لەگەڵ سەلام شەماع و شێخ جەلالی حەنەفی، منیش لە موحازەرەکە لەگەڵیان بووم.

بە ئۆتۆمبیلەکەی من گەیشتینە باڵەخانەی کڵێسا. قەشە لە پێشوازی ئێمە بوو، بە جوانترین شێوە بەخێرهاتنی کردین. چووینە نووسینگەکەی ئەو، باسمان لە چالاکییە ڕۆشنبیری و خێرخوازییەکانی کڵێسا کرد. دواتر کەسێك هات بانگهێشتی هۆڵەکەی کردین. کاتێك چووینە ژوورەوە بینیمان پڕە لە ئامادەبووان، ڕیزی پێشەوەیان بۆ ئێمە تەرخان کردبوو. ئێمە چوار کەس بووین لەگەڵ شێخ جەلالی حەنەفی و قەشە و دوو کەسی دیکە بوو کە یەکێکیان بەرپرسی ڕۆشنبیریی کڵێسا بوو. کاتێك ئاوڕمان دایەوە زۆربەی ئامادەبووانمان بینی کە زۆرینە ئافرەت بوون، یان کچانێك بوون لە

تەمەنی پێڕاگەیشتن بوون.

عەلی وەردی بۆ تەختەی وتاربێژی سەرکەوت. بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی ئەم ئافرەتە زۆرە ببێتەوە، موحازەرەیەك لەبارەی لەشفرۆشی بدات. وەردی وتی ئافرەتی لەشفرۆش ستەملێکراوە، چونکە ئێمە بۆ ئەو حاڵەتەی پێیگەیشتووە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکەین. کەچی لە خۆمان ناپرسین ئەم ژنە بۆ بەم حاڵەتە گەیشتووە. چۆن پەروەردە بووە، لە چ ژینگەیەك پێڕاگەیشتووە. لە ژیانیدا ڕێکەوتی چ هەژاری و نەداری کردووە، تا گەیشتۆتە ئەم حاڵەتە.

وەردی ڕەزامەندی لە سیماکان دۆزییەوە، هەروەها هەستی بە زەردەخەنەیەکی شاراوە کرد، لەبەر ئەو بابەتەی کە لەلای ژنان باس ناکرێت. بەڵام ئەو کات و شوێنێکی گونجاوی هەڵبژاردبوو بۆ ئەوەی لە بابەتەکە قووڵ ببێتەوە. وتی لە بەغدا قەحپەخانەیەکی ناسراو لە ناوچەی مەیدان هەبوو، بە (کلجیە) دەناسرا. ئەو لەشفرۆشانەی لەو ناوچە کاریان دەکرد دەخرانە ژێر پکشنینی پزیشکی و لەلایەن وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتییەوە چاودێری دەکران. ئەمەش بابەتێکی زۆر گرنگە، بەڵام لەبری ئەوەی حکومەتی ئەو کات سەرپەرشتیارێکی کۆمەڵایەتی دابنێت بۆ ئەوەی بەدواداچوون بۆ کێشەی ئەو ژنانە بکات، ئەوا قەحپەخانەکەی داخست، ئەمەش گەورەترین مەترسییە بۆ سەر کۆمەڵگا.

دواتر وەردی ئاوڕی لە ئامادەبووان دایەوە و ڕووی قسەکانی لە شێخ جەلال حەنەفی بوو و وتی: شێخی ئێمە جەنابت نزیك ناوچەی مەیدان نیشتەجێ بووی. ئەی وانییە، ئایا پاڵپشتی قسەکەی من ناکەی گوایە داخستنی قەحپەخانە کارێکی هەڵە بوو. شێخ جەلال

حەنەفی خوالێخۆشبوو، سەرسام بوو بەم پرسیارە لەناکاوەی وەردی کە دەنگی پێکەنینی ئامادەبووانیشی بەدوادا هات. لە وەڵامی وەردی وتی: حکومەتی ئەو کات هۆکاری ماقوڵی بەدەستەوە بوو. وەردی هەستی کرد بە پرسیارەکەی هەڵەی کردووە، هەر زوو داوای لێبوردنی کرد و وتی: شێخی ئازیزمان داوای لێبوردن دەکەم کە بەمشێوەیە پرسیارم کردووە! کەچی شێخ جەلال بە پێکەنینەوە وتی تۆ هیچت تیا نەهێشتەوە.

وەردی لە موحازەرەکەی بەردەوام بوو، تاوتوێی یەکەم پیشەی دەکرد لە مێژوودا، کە ئەویش لەشفرۆشییە. چۆن گەشەی کردووە، چەند پێویستە، چۆن دەبێت بەرەنگاری ببینەوە. جیا لە ئامۆژگاری و خوتبەی مزگەوت و کڵێساکان لەبارەی ئەخلاقەوە چ ڕێگایەکی دیکە بۆ قەڵاچۆکردنی لەشفرۆشی هەیە. جەختیشی لەسەر ئەوە کردەوە، هەرچەندە لەلایەن کڵێسا و مزگەوتەکانەوە قەدەغە بکرێت ئەوا خەڵك زیاتر هەوڵی ناسینی دەدەن و لێی نزیك دەبنەوە. وتیشی پێویستە لەسەر ئێمەی کۆمەڵناسان تاوتوێی ئەم حاڵەتە دژوارانە بکەین.

وەردی جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە زۆرێك لەو حکومەتانەی لە عێراق بەدوای یەکەوە هاتوون. هەقی زانستیان نەداوە. تەنانەت هەندێك لەو حکومەتانە درکیان بەوە نەکردووە، کەسێك خوێندوویەتی و ماندوو بووە، حکومەت پارەی لێ خەرج کردووە، دەبێت بە زانستەکەی لە پێشکەوتنی کۆمەڵگا بەشدار بێت.

موحازەرەیەکی نایاب بوو. وەردی بە چەندین نموونەی چیرۆك کە دەچووە دڵی ئامادەبووان، بابەتەکەی بەپێزتر و جوانتر کردبوو. بۆ نموونە یەکێك لە بەسەرهاتەکان ئەوە بوو: بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی

لەشفرۆشی سەردانی چەندین دەوڵەتی کردووە، ئێران یەکێك بووە لەو دەوڵەتانـە. لـەوێ لـە ناوچـەی دەروازەی قـەزوین قەحپەخانەیـەکی گشتی هەیە. ئەو شوێنە وەك کۆتاییەکانی سەردەمی پاشایەتی لـە عێراق، لەژێر چاودێری تەندروسـتی و کاروبـاری کۆمەڵایـەتی دایـە. وەردی دەڵـێ کاتێـك لـە شـوێنەکە هاتمـە دەرەوە، بینـیم چـەند عێراقییەك لەو شوێنە بوون. کاتێك گەڕامەوە عێراق جارێکیان چوومە چایخانە کەسێك ویستی بۆم هەڵبسێتەوە بۆئەوەی سڵاوم لێ بکات، کە چی برادەرەکـەی ڕێگـەی نـەدا هەڵبسـتێتەوە و وتـی" ئـەو پیـاوە بەدڕەوشـتە... لـە دەروازەی قـەزوین بینـیم لـە تـاران". برادەرەکەی وتی" دکتۆرە لـە زانکۆ لەوانەیـە بـۆ توێژینـەوە لـەوێ بێت". برادەرەکەی بە تووڕەیی وەڵامـی دایـەوە و وتـی" دەڵـێم لـە کلجیە بینیومە تۆش دەڵێـی مامۆسـتای کۆلیـژە". کلجیـە ناوچـەی لەشفرۆشان بوو لە بەغدای کۆتاییەکانی سەردەمی مەلەکی.

## وەردی لە ئەڵقەی زیکری تەکیەی کەسنەزانی

هەندێك لە برادەران تەکیەی کەسنەزانییان ناسیبوو، کە ئەڵقەیەکی زیکری سۆفیانەی بەناوبانگ بوو لە بەغدا. ئەوەی ئێستا لەبیرم بێت ئەو برادەرانە سەفا وەردی و هاوڕێکەی خوالێخۆشبوو ئەبویاس بوو. وشەی کەسنەزانی بە زمانی کوردییـە لـە عەرەبیـدا لـە بەرامبـەر (لا أدريه) دێت. جەماعەتی (لا أدريه) ی سوفیگەریی ئیسلامی بەناوبانگ بـوون، ئـەبو عـەلای عـەفیفی لـە کتێبەکـەی بـەناوی (سـۆفیگەریی ئیسلامی) بە دووروودرێژی باسی کردووە.

شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەبدولکەریمی کەسنەزانی، لـە ڕێگـای سەفا وەردییەوە داوەتی ئێمەی کردبوو، بۆئەوەی لە ئەڵقـەی زیکـر

ئامادە بین. دکتۆر عەلی وەردیش پێشوازی لە داوەتەکە کرد. چونکە لە دوو ئاراستە بە کەڵکی توێژینەوەکانی دێت، یەکەم: توێژینـەوەی پاراسـایکۆلۆژی بـۆ حاڵـەتی (وەجـد) کـە سـۆفی لـەو حاڵەتـەدا هەستەکانی خۆی لەدەست دەدا، چەقوی لێ دەدرێت خەنجەری لـە سەر دەدرێت، هەست بە ئازار و ئێش ناکات، لەوانەشە هەندێکیان بە فیشەك لێیان بدرێت، کەچی فیشەکەکە جەستەی نابڕێت. دووەمیش لە ڕووی کۆمەڵایەتی تایبەت بە سروشتی مرۆیی. کە خەڵك هەمیشـە لە کاتی قەیرانەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشـەکانیان پـەنا بـۆ هێـزە میتافیزیکییەکان دەبەن. بەتایبەتی کاتێك دەوڵەت ناتوانێ کێشەکان چارەسەر بکات.

گەیشتینە بارەگای شێخ محەمەدی کەسنەزانی لە ناوچەی خـەزرای بەغدا. بە جوانترین شێوە پێشوازیمان لێکـرا. دواتـر چـووینە ژووری دانیشتنی تایبەت بە میوانەکانی شێخ. ئەو لە چاوەڕوانی ئێمە بـوو، بەر لە ئێمە زۆرێك لە مامۆستایانی زانکۆکـانی عێـراق هـاتبوون، کـە زۆربەیان کورد بوون. دکتۆر وەردی دەرگای پرسـیارەکانی لـەبارەی فەلسەفەی کەسنەزانی کردۆتەوە. شێخ محەمەد ئاماژەی بۆ یەکێك لە مامۆستاکان کـرد وەڵامـی پرسـیارەکان بداتـەوە. دکتۆرێـك کـە وا دەردەکـەوت پسـپۆڕییەکەی لـە سـۆفیگەری بێـت، هەنـدێك ڕێبـازی سۆفیگەری ڕوونکردەوە، لەنێویاندا کەسنەزانی بوو. وتـی: ئەمـە لـە جەماعەتی لا أدریە هاتووە، بەڵام بوونی ئەو گرووپـە لـەنێو کـوردان وایکردووە ناوەکە بۆ کوردی بگۆڕێت (کەس) لە بەرامبـەر (شـخص) هاتووە، (نەزانی) لە بەرامبەر (لا أدریە) هاتووە، و (کەسنـەزانی)یش بە عەرەبیەکەی خودی فەلسەفەی لا أدریەیە.

دواتر مشتومڕەکە چڕوپڕتر دەبوو، بەڵام وەردی هەوڵی دەدا بزانێ چۆن کەسێك چەقۆ لە سکی دەدات، خوێنی لێ نایەت، کاریگەریشی نابێت. شێخ محەمەدی کەسنەزانی داوای لە مامۆستایەکی دیکە کرد وەڵامی بداتەوە. وەڵامەکەش ئەوە بوو هێشتا زانست نەگەیشتۆتە لێکدانەوەی ئەم دیاردەیە. ئەوان لە تەکیەی کەسنەزانی کەسێکیان خستۆتە بەر ئەشیعە کە چەقۆی لە سکی دابوو. لە ئەشیعە دەرکەوتووە کە چەقۆکە هەناوی بڕیوە، بەڵام کاتێك بەهێمنی چەقۆکەی دەرهێناوە، تووشی هیچ ئازارێك نەبووە... زیاتر لە کاتژمێرێك دەمەتەقێ بەردەوام بوو، دواتر داوەتیان کردین بۆ ئەوەی لە ئەڵقەیەکی زیکری تەواو ئامادەبین، بۆئەوەی بە چاوی خۆمان دیاردەکە ببینین. دانیشتنەکە کۆتایی هات، شێخ محەمەدی کەسنەزانی عەبایەکی پێشکەش بە دکتۆر وەردی کرد. بە (خەلیفە)شی لەقەڵەم دا. ئەمەش عەلی وەردی زۆر دڵخۆش کرد، بۆ دڵخۆشیش هەمیشە دەیگوت دەبێت هەمووان ڕێزی لێ بگرن، چونکە ئەو خەلیفەیە.

ئەو ڕۆژە هات کە دەبووایە بچینە ئەڵقەی زیکر، بە ئۆتۆمبیلەکەی برامان محەمەد حەسەن سەغیر چووینە ئەڵقەی زیکری کەسنەزانی. لە گەشتەکەمان شاعیری ئەردەنی نابینا، ماجد مەجالیمان لەگەڵ بوو، ئەو میوانی من بوو لە ئەردەنەوە هاتبوو. من داوەتم کرد بۆ ئەوەی یاوەرمان بێت، ئەویش ڕازی بوو. کەشەکە بەهاری بوو هەوای شەو ساردییەکی خۆشی هەیە. ئەمەش ئەو ڕۆژە کەمە فێنکانەیە کە عێراق لە کۆتاییەکانی مانگی ئۆکتۆبەر و لە سەرەتاکانی مانگی نیسان هەیەتی.

خوالێخۆشبوو محەمەد حەسەن سەغیر ئۆتۆمبیلەکەی لە نزیک کۆمەڵە گەنجێك وەستاند، کە ئاگریان هەڵگیرساندبوو، سنی مسیان لەسەر دانابوو، وەردی بە پارێزەوە بۆ بینینی ئەڵقەکە ڕۆیشت. مامۆستا محەمەد حەسەن سەغیر وتی عەباکەت پێ بدەم لەوانەیە هەواکە سارد بێت، بەتایبەتی ئەڵقەی زیکر لە گۆڕەپانێکی کراوە دەبێت. وەردی ڕەتی کردەوە خۆی بە عەباکە داپۆشێ. جا بەرەو گۆڕەپانی زیکر ڕۆیشتین.

سروودبێژەکان بە زمانی کوردی و عەرەبی سروودیان دەگوت. شێخ محەمەدی کەسنەزانی مینبەرێکی مامناوەندی لە سەرەوەی مەجلیسەکە دانابوو. ئەوانی دیکە بەپێی پلەکانیان لە ڕاست و چەپی مەجلیسەکە دانیشتبوون. دوای ئەوەی بەخێرهاتنی ئێمەیان کرد لە نزیك شێخ ئێمەیان دانا لەلای چەپی مینبەرەوە. من ئەوەی دەمبینی بۆ ماجد مەجالیم دەگێڕایەوە، بۆئەوەی بە وێنەوە لەگەڵمان بێت. دانیشتنەکەمان دە خولەکی تێپەڕ نەکرد، کاتێك وەردی وتی هەست بە سەرما دەکەم، خۆزگە بەگوێی محەمەد سەغیرم دەکرد خۆم بە عەباکە دادەپۆشت. لێرەدا چارەیەك نەبوو تەنها ئەوە نەبێت سویچی ئۆتۆمبیلەکە لە خاوەنەکەی وەربگرم و بچم عەباکە بۆ وەردی بهێنم. بەرەو ئۆتۆمبیلەکە ڕۆیشتم، بینیم گەنجەکان خەریکی ئاگر و سنییەکان بوون، بە سەرسامی سەیری سنییەکانیان دەکرد و لەبەر گەرمی سوور هەڵگەڕابوو. عەباکەم بۆ وەردی هێنا، بەڵام دیمەنە سەیرەکە هەر بەبەر چاومەوە بوو. دیمەنی سووربوونەوەی سنییەکان لە نزیك ئۆتۆمبیلەکەی محەمەد حەسەن سەغیر.

کات بەخێرایی تێدەپەڕی، وەردی خۆی بە عابەکە داپۆشتبوو.

منیش بۆ شاعیری نابینا باسی ڕووداوەکانم دەکرد. پیاوێك هاتە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە ئیزنی لە شێخ محەمەد خواست، شێخیش ئاماژەی بۆ کرد دەست پێبکات، پیاوەکە بەبەرچاوی ئێمە دەستیکرد بە شووشە خواردن. هێشتا لە شووشە خواردن تەواو نەببوو، کاتێك کەسێکی دیکە هات، سینییەکی داخکراوی هەڵگرتبوو (ئەو سینییانەی لە دەرەوە لەسەر ئاگر بوو) بینیمان بە دەم هەڵیگرتووە و بەلای چەپ و بەلای ڕاست دەیجووڵێنیێ. تا لە ئێمە نزیك بۆوە گەرمییەکەی بۆ ئێمە دەهات. شاعیری نابینا ماجد مەجالی سەرەڕای گەرمی سنییەکە کە لە دەموچاوی نزیك ببووەوە کەچی باوەڕی نەدەکرد.

دواتر پیاوێکیان هێنا و لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە دانیشت، دواتر خەنجەرێکیان هێنا، یەکێك بە هۆی چەکوشەوە، بە هێزەوە خەنجەرەکەی لە سەری پیاوەکە دەدات. بۆ ئەوەی دڵنیابینەوە کە ئەمەش سیحر و جادووی بینین نییە. پیاوەکەیان هێنایە لای ماجدی نابینا، داوایان لێکرد دەست لە خەنجەرەکە بدات کە چۆتە سەری پیاوەکەوە. هەرکە دەستی ماجد بەر سەری پیاوەکە کەوت و دەستی بە قژی کەوت، ماجد کەوتە لەرزین و خەریك بوو هەڵبەزێتەوە. وتم ماجد چیتە، چیت بینی؟ ئەو خەنجەرە منی ترساند کە تەواو چۆتە سەری پیاوەکەوە..

دوای زیکرەکە گەڕاینەوە ماڵەوە، پرسیارە سەرسامەکانم بۆ وەردی حازر بوو، چۆن لە ڕووی زانستییەوە ئەمە لێکدەدرێتەوە؟ وەردی وتی بگەڕێنەوە سەر کتێبەکەم (خوارق اللاشعور) دەبینین من چەندین حاڵەتی لەم شێوەیەم دیارکردووە، کە زانست ناتوانێ شرۆڤەی بکات.

هەندێك لەو کەسانەم بینیوە کە مێزێکی ڕیزپەڕیان هەیە، یان بە چاووزاریان هەیە کە وەردی بە (عائنیة) ناوی دەبردن.

وەردی باسی پیاوێکی لوبنانی کرد، ئەگەر بە سەرسامی سەیری شتێکی بکردایە، ئەوا دەیشکاند. بەبەرچاوی وەردی گوڵدانێکی بە چاو لەسەر مێزەکە شکاندووە، لە ناسرپە پیاوێك هەبووە توانیویەتی بەلەم لە ئاو نقوم بکات!! وەردی وتی ئەم بابەتانە میتافیزیکین ناکرێت بە دیاردە سروشتیەکان لێکدانەوەی بۆ بکرێت، وەك زانستەکان شرۆڤەی بۆ دەکەن.

## وەردی لە وەزارەتی نەوت یاریی سیاسی دەکات

وەزارەتی نەوتی عێراق دکتۆر عەلی وەردی بانگهێشت کرد بۆ ئەوەی موحازەرەیەك لەبارەی کەسێتیی تاکی عێراق بدات. ئەویش داوای لە من کرد، یان بڵێم فەرمانی کرد، چونکە هەرکە داوایەکی دەکرد دەمگوت دکتۆر فەرمانتە. جا فەرمانی کرد بەیەکەوە بچینە وەزارەتی نەوت. باڵەخانەی وەزارەتی نەوت گەورە و فراوان بوو بەر لەوەی بۆ باڵەخانەکەی دیکە بگوازرێتەوە کە نزیك پردی محەمەد قاسمە. لەگەڵ وەردی بە ئۆتۆمبیلەکەم چووینە باڵەخانەکە، ئۆتۆمبیلەکەم لەو شوێنە وەستاند کە ئۆتۆمبیلی وەزیری لێ وەستابوو. بریکاری وەزیر پێشوازی لێکردین کە هەر ئەو بوو بانگهێشتی وەردی کردبوو.

بەر لەوەی وەردی لە ئۆتۆمبیلەکە دابەزێ و تەوقە لەگەڵ پێشوازیکەرەکەی بکات. داوای لە من کرد بۆ لای وەزیری نەوت لەگەڵی نەڕۆم، بەڵکو بچمە هۆڵی تایبەت بە موحازەرە، تا سەیری ئامادەکارییەکان بکەم. منیش وتم (باشە). تێبینییەك هەیە حەز

ناکەم لێرەدا لەناو کەوانەی دابنێم. بەدرێژایی ئەو دە ساڵەی لەگەڵ وەردی ژیاوم، وشەیەك جووڵەیەکی هەڕەمەکیم نەبینیوە، کردە و شتێکی بێ واتای نەکردووە و نەگوتووە. بەڵکو هەموو ڕەفتار و گوفتاری لە کات و شوێنی خۆی مەبەستدار بوو. وەك ئەوە نییە هەندێك لە هاوڕێیان بەپێی هەڵسوکەوتی خۆیان پێوانەیان بۆ هەڵسوکەوتی عەلی وەردی کردووە بۆ جووڵەیەك، بۆیە ئەوان تێینەگەیشتوون.

فەرمانەکەی وەردیم جێبەجێ کرد، ئۆتۆمبیلەکەم لە گەراجێکی گەورەی وەزارەت وەستاند و بەرەو هۆڵەکە ڕۆیشتم. یەکێك لە پێشوازیم بوو بۆ ئەوەی من لەگەڵ وەردی بباتە نووسینگەی وەزیر، بەلام من داوای لێبوردنم کرد و پرسیارم لە هۆڵەکە کرد گوایە لەوێ چاوەڕوانی وەردی دەکەم. ئەویش هۆڵەکەی نیشان دام و یاوەریی کردم.

هۆڵەکە پڕ بوو لە خەڵك، یان بڵێین سەرەڕای گەورەییەکەی جمەی دەهات. شانۆیەکی گەورە بوو بۆ چالاکییە گەورەکان تەرخان کرابوو. کورسییەکی خاڵیم نەبینی تا لەسەری دابنیشم، لەگەڵ ئەو کەسانە وەستام کە لەبەردەرگا وەستابوون. لافیتە و ڕووناکی ئاماژە بوو بۆ ئەوەی ئامادەکارییەکی چاك بۆ موحازەرەکە کراوە. بەلام قەرەباڵغی هەناسەی دەبڕی، کات تێپەڕی و خەڵك چاوەڕوانی وەردی بوو... نیو کاتژمێر تێپەڕی وەردی نەگەیشتە هۆڵەکە.... وا لەنێو خەڵك بلاو بۆوە گوایە هێشتا نەگەیشتووە، منیش بە خەڵکم دەگوت خۆم وەردیم گەیاندۆتە وەزارەتی نەوت. تا بیروڕای پێچەوانە دروست بوو، خەڵك کەوتنە چرپە چرپ!

وەردی بۆ کوێ ون بوو. ئەگەر هەموو خەڵکەکە گومانیان لە هاتنی وەردی هەبوو، ئەوا مافی خۆیان بوو. بەڵام من چۆن باوەڕ بکەم، کە نیو کاتژمێر بەر لە ئێستا لە تەک من دانیشتبووم، دواتر بەرەو لای بریکاری وەزیر ڕۆیشت. دەنگی مایکرۆفۆنەکە چرپە و دەنگەدەنگی خەڵکی بڕی و داوای گوێگرتنی کرد..بێدەنگی بەسەر هۆڵەکە زاڵبوو، چاوەڕوانی هەواڵێك بوون لەبارەی وەردییەوە، منیش نیگەران بووم بۆ بیستنی. قسەکەرەکە وتی: داوای لێبوردن دەکەین لە بەرامبەر موحازەڕەکەی دکتۆر عەلی وەردی، چونکە نەخۆش کەوتووە، ناتوانێ بێتە هۆڵەکەوە، بۆیە داوای لێبوردن لە هەمووتان دەکات. هیوادەخوازم لە موحازەڕاتی دیکە بە ئێوە بگەمەوە و سوپاسی ئامادەبوونتان دەکەم و سەلامی خواتان لێ بێت.

کەوتمە لەرزین، ترسم لە وەردی هەبوو. کەچی ئەو گەنجەی یاوەرم بوو، بۆ دڵنیاکردنەوە وتی فەرموو وەردی سەلامەتە چاوەڕوانی تۆیە. بەرەو لای وەردی ڕۆیشتم کە لە نهۆمی چوارەمی وەزارەت بوو، یاوەرەکەشم لەگەڵ بوو. بینیم وەردی ساغ و سەلامەتە تازە لە نووسینگەی وەزیر هاتۆتە دەرەوە. وەردی یەکسەر پرسیاری کرد هۆڵە بەتاڵەکە چۆن بوو. وتم بەتاڵی چی دکتۆر، هۆڵەکە پڕ خەڵکە تەنانەت کورسییەکیش بەتاڵ نییە. ئەوان لە دەرگای سەرەکی دێنە ژوورەوە کە ڕاستەوخۆ دەچێتە سەر شەقامەکە. نەوەك لە دەرگای وەزیر و ئەو ئەسانسۆرە کە تۆ پێیدا هاتوویتە ژوورەوە. کەسانێك دەوری وەردیان دابوو. یەکێك لەوان غەمزەیەکی کرد و وتی: لەبەر نا ئامادەبوونی جەماوەرێك کە شیاوی پێگەی وەردی نییە، موحازەڕەکەمان ڕەتکردەوە. من تێبینی غەمزەی پیاوەکەم نەکرد،

ئاماژەم بۆ یاوەرەکەم کرد کە لە هۆڵەکە لەگەڵم بوو، بە سەرسامی وتم: ئەم برایە کورسییەکی نەدۆزییەوە تا لەسەری دابنیشم. وەردی پێکەنی. وتی دەی با بگەڕێینەوە ماڵەوە. بریکاری وەزیر شەرمەزار بوو تەنانەت ئارەقی لە نێوچەوانی دەهاتە خوارەوە، هەرچەندە نهۆمی وەزیر هەواکەی بەهۆی ساردکەرەوە، فێنك بوو!

کاتێك هاتینە دەرەوە، بە ئەنقەست لە هێنانی ئۆتۆمبیلەکە خۆم دواخست، وەردی لەبەردەم دەروازەکە لەگەڵ بریکاری وەزیر و بەڕێوەبەر و بەرپرسانی وەزارەتی نەوت وەستابوو، ئەمەش هەلی ڕەخساند بۆ ئەوەی خەڵکێکی زۆر وەردی لەناو وەزارەت ببینی... کاتێك وەردی بۆ ئۆتۆمبیلەکە سەرکەوت وتی پێویستە بەرەو دەرگای سەرەکی بچین کە لەوێ خەڵکەکە دەڕۆن. تا وەردی ببینن کە سەلامەتە و گەیشتۆتە وەزارەت، نەخۆشیش نییە. منیش فەرمانەکەم جێبەجێ کرد. منیش بەرەو دەروازەکە پێچم کردەوە. هەرچەندە سەرپێچی یاسام کرد، بەڵام ئەمە بە ڕەزامەندی پۆلیسەکە بوو کە سڵاوێکی لە ئێمە کرد. ئەو شاهێدحاڵی بوو لە پێشوازی و ڕۆیشتنە فەرمییەکە. خەڵکەکە وەردییان بینی و سڵاویان لێ دەکرد، لە تەندروستیان دەپرسی. دواتر بەرەو ماڵەوە گەڕاینەوە.

بە وەردیم وت چ ڕوویدا؟ وتی موحازەڕەکە بە فەرمانی سەرەوە لە دەسەڵاتی باڵاوە قەدەغە کرا. ئەمەش وەزیری تووشی شەرمەزاری کرد. بۆیە بۆ من پاساوی چۆڵی هۆڵەکە و بۆ خەڵکەکەش پاساوی نەخۆشی منیان دۆزییەوە، تا لەدەست ئەوان و من نەجاتیان بێت. من دەمزانی ڕێگری لێ دەکرێت، دوێنێ شەو پێیانگوتم لە سەرکردایەتی بیستراوە کە ڕێگە بە وەردی نەدرێت لەسەر مینبەرەکانی ئەوان قسە

بكات و ڕەخنەشیان لێ بگرێت. تۆم هەنارده هۆڵەكە تا لایەكی بابەتەكە ببینی، منیش بۆ لایەكی تر ڕۆیشتم. پەیامەكەمان بە جەماوەر گەیاند. بەوە سەرسام بووم بە دەبەنگ خۆت نیشان دا و وەڵامی بریكاری وەزیرت دایەوە كە هۆڵەكە پڕ لە خەڵكە!

## وڵاتی قەتەڕ ڕێگری لە موحازەڕەیەكی وەردی دەكات

نە لە دوور نە لە نزیك دەوڵەتی قەتەڕ پەیوەندی بەو موحازەڕەیەوە نییە كە وەردی لە باڵەخانەی یەكێتیی گشتی مێژوونووسانی عەرەب خوێندییەوە. ئەمەش لە ناوچەی صلیخ بوو لە بەغدا. موحازەڕەكە لەلایەن مستەفا عەبدولقادر نەجاڕی ئەمینداری گشتی بەڕێوە دەبرا. یەكێتییەكە لە وەرزی ڕۆشنبیری خۆیدا موحازەڕەكەی ڕێكخستبوو. باخچەكانی یەكێتییەكەی لە سەرەتای مانگی شەش كردبووە شوێنە گەرمەكەی موحازەڕەكە. وەردی یەكەم مێژوونووسی كۆمەڵایەتییە لە عێراق. بە یاوەری وەردی ڕۆیشتین دكتۆر مستەفا نەجاڕ بە باشترین شێوە پێشوازی لێكردین. دواتر لەسەر سەكۆكە دانیشت بەخێرهاتنی لە دكتۆر عەلی وەردی میوان كرد. دوای ئەوەی دوو كاغەزی لە ناساندنی وەردی خوێندەوە كە زیاتر لە دە خولەكی خایاند.

وەردی چووە سەر سەكۆكە كە دكتۆر نەجاڕیشی بەسەرەوە بوو، لەگەڵ دوو مایكرۆفۆن یەكێكیان لەبەردەم وەردی و ئەویتر لەبەردەم نەجاڕ بوو. وەردی دەستی پێكرد و باسی لە چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی تەنگژەكانی كۆمەڵگای كرد. قسەی لەسەر دیاردەی فەرهود (تاڵان) كرد، كە چۆن خەڵك كەلوپەلی جوولەكەكانیان دوای ڕاگەیاندنی دەوڵەتی ئیسرائیل دزیوە، چۆن سوپا خۆی هەڵقورتاندۆتەوە ناو بابەتەكە بۆ ئەوەی دزی و تاڵانی

بوەستێنن، کە لە عێراق بە فەرهود ناسراوە. دواتر قسەی لەسەر لافاوی دیجلە کرد کە چۆن حکومەتی ئەوسای سەردەمی پاشایەی چارەسەری کردووە. دواتر قسەی لەسەر تەنگژەی وەرگرتنەوەی خێزانە گەڕاوەکان کرد کە تازە لە زیندانی دیلبوونی ئێران گەڕابوونەوە. جەنگ کەمتر لە ساڵێك بوو وەستابوو. جەختیشی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەمە یەکێکە لە قەیرانەکانی جەنگ نەوەك هەموو قەیرانەکان.

وەردی خەریك بوو دەچووە ناو جەنگەڵەکە، لە ئاقارێکی پڕ مین دەڕۆیشت، بەڵام وەردی نەمر و بەتوانا بوو، بۆ دروستی قسەکانی ڕەزامەندی لە جەماوەرەکەی وەردەگرت، بۆیە موحازەرەکە بووە ئەو پرسیارانەی جەماوەر کە وەڵامیان گەرەك بوو، ئەویش بە شێوەیەکی گاڵتەپێکردن بە حکومەت وەڵامی دەدایەوە، دواتر کارەکانی حکومەتی هەڵدەسەنگاند، نوشستی حکومەتی ڕادەگەیاند. هەڵسەنگاندنەکەشی دەدایە پاڵ زانستەکە و دەیگوت ئەوە من نییم وا دەڵێم. نموونەی لە واقیعێکی زیندوو دەهێنایەوە، خەڵکیش پاڵپشتی بۆچوونەکەیان دەکرد.

وەردی مەزن هاتە سەر یاساکانی ئەو سەردەمە، بۆ ئامادەبووان دەرکەوت کە ڕەخنەکانی ئاڕاستەی سەرکردایەتی عێراقی دەکرێت، لەوانەش بوو توانجەکانی گەورەکانی دەگرتەوە، کە لەوانەبوو دەگەیشتە خودی سەرۆکی فەرماندە. بەڵام وەردی ڕاستەوخۆ ئەوی تۆمەتبار نەکرد، چونکە ئەمە مەترسی لەسەر ژیانی ئەو هەبوو. بەڵکو لەبری ئەوە دەستوپێوەند و ڕاوێژکارەکانی تۆمەتبار کرد، کە بە شێوەیەکی زانستی بابەتەکان بە سەرۆك ناگەیەنن. ئەمەش وا دەکات

بڕیاری شیاو نەدرێت. دواتر وتی ئەو جۆرە کەسانە لە نێوان خەڵك و سەرۆك دەوەستن، ئەوان هۆکاری کێشە گەورەکەن. ئەو پیاوانە قسەی خەڵك ناگەیننە سەرۆك، لەڕاستیدا ئەوان ڕقیان لە سەرۆکە. وتی بۆیە تکا لەو جۆرە کەسانە دەکەم، لەبری ئەوەی شیعری پڕ ستایش بنووسن، وا باشترە قسەی خەڵك بە سەرۆك بگەیەنن.

دەنگی هاوارێك لەنێو ئامادەبووان بەرزبۆوە: ئەم قسانە شیاو نییە، وەردی وتی: بۆچی شیاو نییە ئەی دکتۆر، من ئامۆژگاری دەکەم. کابرا وتی نەخێر تۆ شعووبی و شیوعی و تایفەگەری، ڕقت لە عێراق و سەرکردایەتییەکەیەتی. وەردی تەواو بە ساردوسڕی وەڵامی دایەوە: دکتۆر ئەگەر وەهام بۆ لە موحازەرەکەی من ئامادە دەبیت، بۆچی لە دژی من خەبەر نادەیتە سەرکردایەتی؟!

دکتۆر نوری حەموودی قەیسی هەڵسایەوە، کە ئەو کات ڕاگری کۆلیژی ئادابی زانکۆی بەغدا بوو. دواتر لە باخچەکە چووە دەرەوە و بەرەو نووسینگەکانی یەکێتیی مێژوونووسان ڕۆیشت لە ژوورەوە نەوەك دەرەوە. منیش بەدوای ڕۆیشتم بۆ ئەوەی بزانم بەرەو کوێ دەچێت. وەردی قسەکانی تەواو کرد و وتی کێشەی ئەم سەرکردایەتییە نموونەی ئەم جۆرە دکتۆرانەیە، کە ڕازی نین گوێ لە قسەیەکی زانستی بگرن کە کەڵکی ئەوانی هەبێت، بەڵکو ئەوە دەگوازنەوە کە خۆیان دەیانەوێ. منیش هەر سەیری دکتۆر قەیسیم دەکرد کە لەنێو نووسینگەکانی یەکێتی ون بوو. دوای چەند خولەکێك گەڕایەوە، ڕووگەش و سەرکەوتوو بەرەو سەکۆکە ڕۆیشت. دەمی بردە بەر گوێچکەی دکتۆر نەجار، کە ئەویش لەلایەن خۆیەوە مایکرۆفۆنەکەی بەرەو لای وەردی برد. بەوردی و دیقەتەوە گوێی

هەڵخست بەڵام ڕقی هەڵسابوو. قەیسی هاتە خوارەوە بە دەنگێکی بەرز وتی: دەبێت هەر ئێستا بوەستێ. دکتۆر مستەفا دەزانی کۆتایی هات، ئەگەر نەیوەستێنی ئەوا تۆ بەرپرسی.

دکتۆر مایکرۆفۆنەکەی تا کۆتایی مێزەکە دوورخستەوە و خۆی لار کردەوە تا گەیشتە گوێی وەردی و بەچرپەوە وتی: دکتۆر دەبێت هەر ئێستا موحازەرەکە بوەستێ.

دکتۆر وەردی وتی: چەند خولەکێك قسەکانم تەواو دەکەم.

دکتۆر مستەفا نەجار جارێکی دیکە بەچرپەوە: ئەو ڕێگای بەردەوام بوون نادات.

وەردی کە مایکرۆفۆنیشی لەبەردەم بوو وتی: بۆچی ڕێگە نادەی موحازەرەکەم تەواو بکەم، هەر تۆش بەناوی یەکێتیی گشتی مێژوونووسانی عەرەب داوەتت کردووم بۆ ئەوەی موحازەرە بدەم.

ژمارەیەکی زۆری ئامادەبووان ئاگاداری ئەوە بوون، بۆیە دیقەتیان دابوو بزانن بابەتەکە چییە وایکردووە مشتومڕەکە بەم شێوازە سەیرە بێت. زۆربەی ئامادەبووان لەوانە منیش، پێشتر لە موحازەرەیەکی ئەوتۆ ئامادە نەبووین کە لە ناوەڕاستەوە وەستێنرابێت. بەڵام وەردی بە شێوەیەك ئاراستەی کرد کە خۆی دەیەوێ سەرکەوتوو بێت، نەوەك لەسەری بکەوێتەوە. من بە وردی دیقەتی جووڵەی وەردیم دابوو، کە پرسیاری دەکرد کێ ڕێگەی نادات موحازەرە بدات و چۆن؟

دکتۆر نەجار چرپەی بۆ گوێچکەی وەردی کرد و وتی بابەتەکە پەیوەندی بەم نییە، بەڵکو ئەو جێبەجێکاری فەرمانەکەیە.

وەردی وتی: کەواتە کێ ڕێگریم لێ دەکات.

مستەفا نەجار وتی: بە فەرمانی ئەمینداریتیی نهێنی (قوتر)

وەردی وەڵامی دایەوە: وڵاتی قەتەڕ چ پەیوەندی بە موحازەرەکەی من هەیە.

نەچار بە دەنگێکی بەرز دووبارەی کردەوە و بە توڕەییەکی ئاشکرا: ڕێگرتنەکە لە ئەمینداریێتیی نهێنیی قوتری حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکییە.

وەردی بە مایکرۆفۆنەکەی بەردەمی دووبارەی کردەوە و وتی" ئەگەر بەمشێوەیەیە، ڕێگرتن لە ئەمینداری قوترە، ئەوا دەبێت بڕیارەکە جێبەجێ بکەین. من وامزانی وڵاتی قەتەڕە، گوتم دەوڵەتی قەتەڕ چ پەیوەندی بە موحازەرەی من هەیە. بەڵام ئەگەر ئەمینداریێتیی قوترە، مامە ئێمەش تەواوی ناکەین! سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خواتان لێ بێت.. وەردی لەنێو چەپڵەی جەماوەر و پێکەنینی بەرز و ونبوونی دکتۆر نوری قەیسی، لەسەر سەکۆکەکە هاتە خوارەوە.

بەڵێ وەك سەرەتا وتم دەوڵەتی قەتەڕ پەیوەندی بە ڕێگرتنی موحازەرەکەی وەردی نەبوو. بەڵکو ڕێگرتنەکە لەلایەن ئەمینداریێتیی قوتری حزبی بەعس هاتبوو، کە وەردی ناوی دەوڵەتی قەتەڕی هێنا، دەیویست هۆکارە ڕاستەقینەکە بۆ خەڵك ئاشکرا بکات.

لە کاتی گەڕانەوەمان بۆ ماڵەوە، وەردی لەناو ئۆتۆمبیل باسی هۆکاری هەڵچوونی نوری قەیسی کرد و وتی" دوێنێ چلەی عەدنان خەیروڵڵا بوو، نوری قەیسی قەسیدەیەکی پڕ ستایشی بۆ ئەو نووسیوە و کەسایەتیی ئەو مردووە مەزن دەکات. کاتێکیش من وتم کەسانێك هەن لەبری ئامۆژگاری قەسیدەی ستایشکردن دەنووسن، ئەوا تووڕە بوو، پەیوەندی کرد و ڕێگرتنەکەی بەدەستهێنا. (عەدنان خەیروڵڵا وەزیری بەرگریی عێراق بوو لە ١٩٨٩/٥/٤ بە ڕووداوی

کەوتنی فڕۆکە مرد.)

## لە هۆڵی ئەمینداریتیی بەغدا ترس دادەگرێ

دواجار سەدام حوسێن بڕوای بە هەندێك بۆچوونەکانی وەردی هێنا. پێشتر لە کودەتای بەعسەوە لە ساڵی ١٩٦٨ تا کۆتایی جەنگی کوێت لە ساڵی ١٩٩١ . سەدام وایدەزانی تەواوی گەل ئەویان خۆشدەوێ. ئەگەر کەسێك نەیاری بێت بە دڵنیایی یان بە گریمان دەبێت کەسێك بێت سەر بەو ڕژێمانە: فارسی مەجووس بێت، یان سەر بە ڕژێمی بەکرێگیراوی سووریا بێت، یان دەبێت زایۆنیزم و ئیمپریالی بێت. کەچی سەدام بەڕاستی تووشی شۆك بوو کاتێك بە چاوەکانی خۆی بینی چواردە پارێزگای عێراق لە دژی ئەو ڕاپەڕین، ئەمەش دوای شکستی جەنگی کوێت بوو.

حەپەسانی سەدام لە بەرامبەر گەلی عێراق زۆر گەورە بوو. بۆیە ئەو کاتە وەردی بیرکەوتەوە کە دەڵێ گەلی عێراق دڵسۆزی خۆیان بە فەرمانڕەوا نادەن. سەدام داوای لە خالید عەبدولمونعیم ڕەشید دەکات (ئەمینداری بەغدا) بۆ ئەوەی موحازەرەیەك بۆ وەردی ڕێکبخات. وەك سەلام شەماع لە خالید مونعیمی بیستبوو. سەلام شەماع لە دیمانەیەکی ڕۆژنامەوانیدا باسی ئەو موحازەرەیەی وەردی دەکات و بە بۆمبی خۆکوژیی ناوی دەبات و دەڵێ:" دوای ڕووداوەکانی ١٩٩١ موحازەرەکەی وەردی تۆقێنەر بوو، خۆشەویستانی تووشی تۆقین و ترس بوون، بۆیە ناومانناو بۆمبی خۆکوژیی وەردی! بەڵێ ئەم موحازەرەیە لە کارەساتێك دەچوو. من شاهێدحاڵی وردەکارییە ترسناکەکانی بووم. لە هۆڵەکە ئامادە بووم، چەندین لە موریدەکانی وەردیش لەوێ بوون لەوانە دکتۆر عەبدولئەمیر

وەرد و محەمەد خاقانی... وەردی لـە كۆتـایی مـانگی ئـازاری ۱۹۹۱ موحازەرەكەی لە كۆڕبەندی ئەمینداریێتیی بەغدا دا، ئـەم كۆڕبەنـدە هەمیشە لە هۆڵی نهۆمی دووەمی مۆزەخانەی بەغدا كۆڕەكانی ئەنجام دەدا. بەڵام ئەمجارە هۆڵەكە بۆ ئامادەبووان بچووك بوو چونكە لەسەر قاندرمەكان خەڵك وەستابوو. تەنانەت لە شەقامەكانی نزیكیش خەڵك وەستابوو، بۆیـە ئەمینـداری بەغـدا خوالێخۆشـبوو خالیـد مـونعیم فەرمانی كرد، ئامادەبووان بە پاس بۆ هۆڵی گـەورەی ئەمینـداریێتیی بەغـدا بگوازرێنـەوە، كـە ئـەویش سـەرەڕای گەورەییەكـەی بـۆ ئامادەبووان بچووك بوو. ئەم موحازەرەیەی وەردی ڕووداوێكی گرنگ بـوو لـەو ڕۆژگـاردا، چـونكە هاوكـات بـوو لەگـەڵ وەسـتانی جـەنگی دووەمی كوێت. لەگەڵ ئەو ڕووداوانەی كە دواتر لە پارێزگاكانی عێراق ڕوویدا، لە ڕووداوی تاڵان و توندوتیژی، كە هەموویان جەختكردنەوە بوون لەسـەر تیۆرەكـانی وەردی و شـرۆڤەكانی لـەبارەی كاریگـەری كولتووری بیاباننشینی لەسەر كەسێتیی تاكی عێراقی. لـەم كـۆڕەدا وەردی بەهێمنی تووڕەییەكەی خۆی ئاشـكرا كـرد لـە بەرامبـەر ئـەو شێوازەی ڕژێم مامەڵەی لەگەڵ دەكات كە بـە (ئـاژاوە) و (خیانـەت) ناوی دەبات. (سەرەڕای ئەمـە مامۆسـتا سـەلام ئەمـە بـە ڕاپـەرینی پیرۆزی شەعبانییە ناو نابات).

بەسەرهاتێكی خۆش ئەوەبوو، ئەمینداری بەغدا هاتە لای سەكۆكە و ئامێرێكی تۆماركردنی لەبەردەم وەردی دانا. كاتێك وەردی پرسیاری كرد بۆچی كۆڕەكە تۆمار دەكـات. ئەمینـداری بەغـدا وتـی: جـەنابی سەرۆك سـەدام حوسـێن دەیـەوێ گوێبیسـتی بێـت. لێـرەوە وەردی بەرەو ڕەخنەی توند و ڕاشكاو ڕۆیشت بۆ ئەوەی سەرۆك گوێبیسـتی

بێت. ئەوەی بەسەر زاری هات نەیگێڕایەوە، وتی" ئێمە مشك نـین، هەموو ڕۆژێك بمانخەنە تاقیکردنەوەیەکی نوێ. مانای چییە پۆلیسی ئەخلاق دادەنێت. توخوا پۆلیس ئەخلاقی هەیە؟ ئەگەر ئێوە ڕێگاتان ون کردووە، وەرنە لای ئێمە ڕێگای دروستتان بۆ حکومڕانی گەل نیشان دەدەین. دواتر بەکورتی وتی" شیاوی ئەو گەلە نییە، تـەنها (........) نموونـەی ئـەو حکومەتـە (.............) نـەبێت. وەسفەکانی کە لەنێو کەوانەمان جێهێشتووە زۆر توند و بوێرانە بوو. کاتێك وەردی نیشانەی تووڕەیی بـە نێوچـەوانی ئەمینـداری بەغدا بینـی، پاساوی هێنایـەوە و وتـی ئەمـە قسـەی مـن نییـە پێغەمبـەر محەمـەد دەفـەرموێ" ئێـوە چـۆن بـن کەسـانێك وەك خۆتـان حوکمڕانیتـان دەکـات." ئـەو قسـانە کاریگـەری بەسـەر دەروونـی ئامادەبووان هەبوو، ئەمەش لەبەر هەستیاری بارودۆخـە گشـتییەکە بـوو، کـە وڵات پێیـدا تێپـەڕ دەبـوو دوای کشـانەوەی لـە کوێـت و نەیدەتوانی ڕووبەڕووی ئەمریکا و دەوڵەتانی هاوپەیمان ببێتەوە ئەمە سەرەڕای ئەو ڕووداوانەی کە دوای کشانەوە لە باکوور و ناوەڕاست و باشوور ڕوویاندا. سەرەڕای هەموو ئەو ترسـناکیانە کەچـی ئەمـە لـە دڵسۆزی وەردی بوو بۆ ڕێباز و پرەنسیپ و کۆمەڵگاکەی... ئەمەش بوێرییەکی بێشوومار بوو لە کاتێکدا هەموو خەڵك بێـدەنگ بـوو ئـەم بوێرییە مایەی ئیرەیی بوو. تەنانەت ئەو کات زۆرێك بـە کوشکێشـی سازشیان لەسەر پرەنسیپەکانی خۆیـان دەکـرد". لێـرەدا قسـەکانی سەلام شەماع تەواو دەبێت.

لێرەدا شتێك لەبارەی ئەو قسانەی سەلام شەماع ناکەم کە لەبارەی کۆڕەکـەی وەردی کردوویـەتی، تـەنها باسـی ئـەو پەنـدە عێراقییـە

دەکەمەوە کە وەردی هێنایەوە: (تلوك هیجی رقعه علی هیج پاپوج) واتە (ئەو پینەیە شایەنی ئەم پێڵاوە پاپووچەیە) ئەمەش سەلام شەرمی کردووە باسی بکات و بە توند وەسفی دەکات. وەردی دەبووایە سڵ لەو وەسفە بکات. حکومەتی عێراقی لە ماوەیەکی کورتدا چەندین هەڵەی گەورەی ئەنجام دا. کە تا ئەم ڕۆژە کاریگەری بەسەر ناوچەکانی عەرەبەوە هەیە. کوێتی داگیرکرد دواتر ڕایگەیاند کە ناکشێتەوە زیان و قوربانییەکان هەرچەندە بێت. خودی سەدام لە تەلەفزیۆن دەرکەوت و ڕووی قسەکانی بۆ سوپا بوو وتی" ئەگەر منتان لە تەلەفزیۆن بینی، یان لە منتان بیست بڵێم لە کوێت بکشێنەوە، ئەوا باوەڕ مەکەن، ئەمە پڕوپاگەندەی ڕاگەیاندنی ئەمریکییە. ئێمە لە کوێت دەمێنینەوە هەرچەندە قوربانی زۆر بێت." کەچی دواتر بە دەنگی سەدام بڕیاری کشانەوەی بێ مەرج درا و قبوڵی هەموو مەرجەکانی هاوپەیمانان کرا.

گەل لەم سوکایەتییە تووڕە بوون، کە دەرهەق بە ڕۆڵە سەربازەکانیان کرا و ئاگاداری ڕەزامەندی عێراق نەبوو لە کشانەوەکە. هێزەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکان جۆرەها موشەکیان لە دژی ئەو سەربازانە بەکارهێنا، تا هێڵێکی درێژیان لە لاشەی کوژراو و لۆجیستیکە سووتاوەکە لەنێوان کوێت و بەسرا دروست کرد.

هەموو ئەمانە منیان نەترساند. وەردی خۆی بەرپرسیارێتی قسەکانی هەڵدەگرێت نەوەك من. ئەوەی منی ترساند ئەوە بوو کتێبی نەهجی بەلاغەی ئیمام عەلیم بە وەردی دابوو، بۆ ئەوەی فەرموودەیەکی ئیمام بخوێنێتەوە کە دەڵێ" بەسرا نقوم دەبێت و عەجەم داگیری دەکات." ئەوەی ئیمام لەبارەی بەسرا وتوویەتی

ئێستا هاتۆتە دی، بە وەردیم وت ئەمە کاتی خۆیەتی، کۆتایی جەنگ بەسرا پڕ دەبێت لە عەجەم و بیانی... هەر ئەمەش ڕوویدا.. خەڵکی ئەمەیان بینی. بەڵام کارەساتی گەورە ئەوەیە وەردی ئەگەر بیری بکەوێتەوە بابەتێك سوودی بۆ کۆڕەکەی هەیە، ئەوا بە وردەکارییەکەیەوە لەنێو خەڵك باسی دەکات. ئەم کۆڕەش بۆ سەدام حوسێن تۆمار دەکرێت. لە بەدبەختی من وەردی هاتە سەر بابەتی داگیرکردنی بەسرا بەهۆی عەجەم و بیانییانەوە!!

وەردی دەقاودەق وتی" نازانم کێ بوو کتێبێکی پێدام" سەیری سیمای جەماوەری دەکرد. منیش سەری خۆم لەپشت عەمامەی شێخێك شاردەوە کە لەپێش من دانیشتبوو. وا دەردەکەوت وەردی من و شوێن و ڕووداوەکەی بیرکەوتۆتەوە. چووە سەر وتەکەی ئیمام عەلی و لە بابەتی ئەوە دوور کەوتەوە کێ کتێبەکەی پێداوە. سوپاس بۆ خودا. لە نێوان دوو وتەکە کە دوو خولەکی نەخایاند، من تۆقیم و وێنای ئەوەم دەکرد چۆن لایەنەکەی دیکە سەیری تێڕوانینی من دەکات کە پێشبینی کارەساتەکەم کردووە. ئەگەر وەردی دەیگوت من کتێبەکەم پێداوە، پێشبینی نسکۆیەکەم کردووە کە دەگاتە داگیرکردنی بەسرا. ئەوا خەیاڵم دەکرد خۆم لەسەر تەلەفزیۆن دەدۆزییەوە بێژەری تەلەفزیۆن دەڵێ ئەمە سیخوڕی فارسی مەجووسییە و سەر بە ڕژێمی سووری بەکرێگیراو و زایۆنیزمی ئیمپریالییە. هەموو ئەم خەیاڵانە لە ماوەی کەمتر لە دوو خولەك بەبەرچاوم ڕەت دەبوو! بەڵام خوا منی پاراست.

## لەبەردەم وەردی سڵ لە زێدەڕۆیی سیاسی بکەوە

به بڕوای من هەرگیز و هەرگیز، هاوینێك لە عێراق وەك هاوینی ١٩٩١

نەبوو. چونکە کەشوهەواکە زۆر جوان بوو، هەوا بووژاوە و مەیلەو سارد بوو، خۆر بۆ چەند خولەکێك دەردەکەوت، هەر زوو بە پشت هەورەکانەوە ون دەبوو. ئەم هەورانە کە پاشماوەی سووتانی بیرە نەوتەکانی کوێت بوو لە سەرەتای بەهارەوە، هەمیشە نەوتی بەسەر خەڵك دەباراند و ماڵەکانیش بەهۆی بارانی ڕەشەوە بۆ ماوەی ساڵێکی تەواو بەرگێکی ڕەشیان پۆشیبوو. عێراق بە خراپترین قۆناغەکانی مێژووی خۆی تێدەپەڕی. چاکترین گەنجی لە بیابان هەوڵیان دەدا، لەگەڵ دێوەزمەکانی ئەمریکا بجەنگن کە لە ئاسمانەوە بۆردوومانی دەکردن، خەڵکی دەکوشت، ماڵ و پردەکانی دەڕووخاند، ئاو و کارەبای دەبڕی. ئەوکات سەرکردایەتی سەربازی و سیاسیی عێراق بە بڕیارەکانی گێرەی دەکرد، لە نێوان بەرگری و دژایەتی دوژمنی بێگانە و تاوانبارکردنی، کشانەوە و گەڕانەوەی تەکتیکی، یانیش ڕاگەیاندنی شکستیش کە پاساوهێنانەوەی نیو کاتژمێری خایاند و بە قبوڵکردنی هەموو مەرجەکانەوە... دواتر هەر زوو ئەو ڕووداوە هات کە دەوڵەتی عێراق بە ناپاکی ناوی دەبرد، ئۆپۆزیسیۆنی ئەوسای عێراقیش پێی باش بوو بە ڕاپەڕینی شەعبانییە ناوی ببات. بەمەش سوپای عێراقی ئەوەی جێمابوو یان ئەمریکا فەرامۆشی کردبوو، بۆ گێڕانەوەی کەرامەتی خۆی هەموو شتێکی سووتاند، بەمەش ئەوەی لە جەنگی دەرەوە لەدەستی دابوو، لە جەنگێکی ناهاوسەنگی ناوخۆدا بەدەستی هێنایەوە. دواجار سوپای عێراق بەسەر گەل زاڵ بوو، بۆ ئەوەی دەسەڵات بە دەستی فەرمانڕەوا بمێنێتەوە.

ئەو کاتەش تەواوی عێراق، سەرلەنوێ بەیعەت بۆ سەدام حوسێن دەکەنەوە. هەموو ڕۆژێك (سەرۆکی فەرماندە خوای لێ ڕازی بێت)

پێشوازی لە پارێزگایەکی عێراق دەکات کە بەر لە دوو هەفتە لە دژی ئەو ڕاپەڕین، ئەمەش بۆ نیشاندانی دڵسۆزییەکی نوێ بۆ سەرۆك، داوای لێبوردن لەوەی ڕوویدا.

لەو بارودۆخەدا، من دوکانێکم لە دەروازەی شاری کازمیە هەبوو. خەریك بوو دوکانم دادەخست، کە شەقامەکان بەرە بەرە لە ڕێبواران چۆڵ دەبوو، ئەمەش بۆ سەیرکردنی گەشتی هەواڵی کاتژمێر هەشت کە لە تاکە کەناڵەکەی عێراق پەخش دەکرا.. لەو کاتە بینیم وەردی مەزن هاتە دوکان و مامۆستا سەلام شەماعیشی لەدواوە بوو. ئەم ڕۆژنامەنووسەی کە دوایین هەواڵ و پڕوپاگەندەی بە ئێمە دەگەیاند کە وەردی بە سەرنج و بایەخەوە گوێی بۆ دەگرت.

سەلام وتی با بە ئۆتۆمبیلەکەت وەردی بگەیەنینەوە ماڵ. وتم بەسەرچاو، بەڵام ئایا دکتۆر حەز دەکات دوو هەواڵی سەرەتا لە تەلەفزیۆنەوە ببینین، ئینجا بڕۆین. وەردی ڕازی بوو، هەواڵەکان دەستی پێکرد. هەواڵی یەکەم لەبارەی پێشوازی سەرۆك بوو لە عەشیرەت و هۆزەکانی نەجەف، بۆ نوێکردنەوەی بەیعەت بۆ بەڕێزیان!

لێرەدا سەلام وتی: ئەمریکا ڕێگرییان لە سەدام کردووە، نابێ لە چارەگە کاتژمێرێك زیاتر لە تەلەفزیۆن قسە بکات! عەلی وەردی سەری سوڕما بە سەلامی وت چۆن و لەکوێ ئەو زانیارییەی بەدەست هێناوە؟ سەلام وای نیشان دا گوایە لە یەکێك لەو سەربازانە گوێبیستی بووە کە لەگەڵ شاندی دانوستانکار بووە، کە لە خێوەتگای سەفوان لەگەڵ ئەمریکییەکان دانیشتوون! وەردی وتی (سەیرە) بۆ دەرخستنی حاڵەتی سەرسامی ئەم وشەیەی درێژ

دەکردەوە.

وێنەکان خەڵکە نەجەفییەکەی نیشان دەدا بە هەموو چین و توێژەکانیەوە، بە عەگال بەسەر، عەمام بەسەر و ئەو ئەفەندیانەی کە کراس و پانتۆڵ و جلی ئەورووپیانەیان پۆشیبوو. هەرکە شاعیرێك کۆتایی دەهات شاعیرێکی دیکە هەڵدەسایەوە و بە دڵخۆشی بە شان و باڵی سەرۆکی هەڵدەدا، کە دوو هەفتە پێشتر کورەکانی ئەوانی کوشتبوو. لە ناوبرەی دێرەکانی شیعرەکەش هەموویان هوتافیان دەکێشا و نزای تەمەن درێژییان بۆ سەرۆك دەکرد!!

وتم دکتۆر ئەگەر چاوەڕوانی شاعیرانی پارێزگاکە بین، ئەو کات درەنگ دادێ، با بڕۆین من ئامادەم. وتی با بوەستین بۆ ئەوەی بزانین دوای چارەگە کاتژمێرێك هەواڵەکە چۆن کۆتایی دێت، وەك سەلام باسی کرد! ٢٠ خولەك تێپەڕی هێشتا سەدام قسەی نەکردووە، وەردیش بە پەستی سەیری سەلامی دەکرد... دوای زیاتر لە نیو کاتژمێر سەدام دەستیکرد بە قسەکردن لەبارەی ئەو سەرکەوتنەی لە بەرامبەر دوژمنە سێ قۆڵییەکە بەدەستهاتووە و عێراق قۆناغەکەی تێپەڕاندووە، لە قسەکانی باسی خیانەتی ڕاپەڕینەکە و دەستی دەرەوەی کرد، ئەمەش نزیکەی کاتژمێرێکی خایاند. (وەك ئەوە بوو گوێبیستی ئەو قسە و قسەلۆکە ببێت گوایە ڕێگەی پێنادرێت چارەگێك زیاتر قسە بکات.) دواتر قسەی لەسەر دەسکەوتەکانی خۆی و دەسکەوتی بەعس کرد، باسی پارێزگای نەجەفی کرد، ئەم پارێزگایەی خۆڕاگرە کە بە ئاسانی وەلائی خۆی نادات، بەڵام ئەگەر وەلائەکەی بە سەرکردایەتییەك بەخشی، ئەوا ڕاستگۆیە، سەدام بەم قسانە سوپاسی نەجەفی کرد. لێرەدا هەموو هەڵسانەوە بەدڵخۆشی

لەبەردەم جەنابی سەرۆك دەستیان كرد بە (هۆسە) هۆسە جۆرە سەمایەكی پیاوانە لە عێراق. سەرۆكیش بەخۆشحاڵییەوە هەڵسایەوە و دەستی بۆ هۆسەكەران بەرزكردەوە!

سەیری وەردیمان كرد، ئەویش دەستی لەگەڵ هۆسەكاران بەرزكردەوە، سەیری راست و چەپی دەكرد، منگە منگی بە چەند وشەیەك دەكرد كە هێشتا لەبیرم ماوە. دواتر ئاوڕی لە من دایەوە و وتی دەی مامە با بڕۆین ئەو پینەیە شایەنی ئەو پاپووچەیە! وەردی لە تیۆرە زانستییەكەی بە زمانێكی كۆمەڵایەتی توانجئامێز ڕۆشن بوو، ئەو هەمیشە دەیگوت: ئێوە چۆن بن دەسەڵاتەكەشتان وەك خۆتان دەبێت. بەڵام بەو پەندە بەغدایییەی سەرەوە دەیویست ئەو وێنەیە نیشان بدات كە نزیكەی كاتژمێر و نیوێك بەبەرچاومانەوە ڕوویدا. ئێمە هەرسێكمان. من ئەم وردەكارییە بۆیە دەگێڕمەوە تا خەڵك لە نزیكەوە كەسێتیی وەردی بناسن!

كاتێك بە خواڵێخۆشبووم وت، جوانترین وەسفی خودا لە قورئان بۆ فیرعەون ئەوەیە " **فأستخف قومه فاطاعوه، انهم كانوا قوما**...".

ڕەخنەكە بۆ قومەكە بوو كە ملكەچی فیرعەونن نەوەك بۆ خودی فیرعەون بێت كە عەقڵی بەكارهێناوە تا دەسەڵاتیان بەسەر بسەپێنێ. وەردی كەمێك بێدەنگ بوو، بە سەرسامییەك وەك ئەوەی شتێكی نوێی دۆزیبێتەوە وتی" ئەیابە" ئەمە وشەیەكی عێراقییە بۆ سەرسوڕمان بەكاردێت. دواتر وتی" بەڵێ زانستی نوێ جەخت لەسەر ئەمە دەكاتەوە، مرۆڤ هەرچەندە لە ملكەچبوونی كوێرانە ڕابێت، قبووڵی دەسەڵاتدار بكاتن ئەوا كاریگەری خۆی لە كۆمەڵگا لەدەست دەدات".

## پرسەی سێ بەرپرس

لە چوارچێوەی ڕێبازی ئیستقرایی بۆ سروشتی هەڵسوکەوتی کۆمەڵگا بەرامبەر فەرمانڕەواکان، وەردی لە سێ پرسەی بەرپرسانی سیاسی لە عێراق ئامادە دەبێت. باسی ئەو پرسانەی بۆ ئێمە کردووە، وتیشی ئەو لە ژیاننامەکەیدا بەناوی (سینەمای بەغدا) باسی لەو شتانە کردووە کە لە پرسەکان بینیویەتی. ئەو کە هەر وتارێکی بڵاودەکردەوە باسی یاداشتەکانی دەکرد، کە خوا یاربێت دوای مردنی بڵاو دەبێتەوە. کەچی لە بەدبەختی ئەو هێشتا ئەو ئاواتەی نەهاتۆتەی دی. ئەو پرسانەی وەردی تێیدا ئامادە بووە، بەپێی زنجیرەی مێژووەکانیان ئەمانەن:

١- پرسەی فاتیحە خوێندنی بۆ گیانی محەمەد کوڕی سەرۆکی پێشووی عێراق ئەحمەد حەسەن بەکر.

٢- فاتیحەخوێنی بۆ باوکی یەکێك لە بەرپرسە گەورەکانی بەعس کە وەردی ناوی نەهێنا، تەنها باسی ئەو بەسەرهاتەی کردووە کە لە پرسەکە ڕوویداوە.

٣- پرسەی دایکی تاریق عەزیز جێگری سەرۆکی پێشووی عێراق.

با بە محەمەدی کوڕی ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆکی پێشوو دەست پێبکەین، کە بە ڕووداوی هاتووچۆ لە ناوچەی بەلەد لەنێوان تکریت و بەغدا گیانی لەدەستدا. قسە و قسەڵۆك لەبارەی ئەم ڕووداوە زۆر بوو. کەسانێك هەبوون، جێگری سەرۆکیان بە ڕێکخستنی ڕووداوەکە تۆمەتبار دەکرد، کە ئەوکات سەدام حوسێن بوو. هەندێکیش دەیانگوت محەمەد شەو ئۆتۆمبیلەکەی بە خێراییەکی زۆر لێخوڕیوە، دواتر ئۆتۆمبیلەکەی خستۆتە ژێر بارهەڵگرێکی گەورە

کە بەهۆی تاریکییەوە نەیبینوە. جیا لەوەش قسەیەکی تر هەیە دەڵێ ئاگای لە خۆی نەبووە، یان دەڵێن ئۆتۆمبیلەکەی بەر پرد کەوتووە نەوەك ئۆتۆمبیلی بارهەڵگر!

وەردی دەڵێ کاتێك بیستوویەتی سەرۆکی جگەرسووتاو لە هۆڵێکی بەناوبانگی بەغدا بۆ سەرەخۆشی پێشوازی لە خەڵك دەکات، دەچێتە ئەوێ. وەردی دەبینی هەزاران کەس بۆ پرسەی سەرۆك هاتوون. خەڵکی ئەفەندی و عەمامە بەسەر و عەگال بەسەری بینیوە. جا وەسفی شوێنەکە دەکات لەسەر سەکۆی هۆڵەکە سەرۆك و کەسوکارە نزیکەکانی وەستاون. دوو قاندرمەی بەرامبەر یەکتر دەچنە سەر سەکۆکە. ئەو کەسەی سەرەخۆشی لە سەرۆك دەکات، بە قاندرمەی لای چەپ سەردەکەوێت و بە قاندرمەی ڕاست دێتە خوارەوە... وەردی دەڵێ ڕیزی خەڵکەکە زۆر درێژ بوو، لە پێشەوە وەزیر و ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی و سەرکردەکانی سوپا و ئەندامانی حکومەت و بەرپرسانی گەورە و دواتر پارێزگارەکان و بەمشێوەیە ڕیزی پرسەی سەرۆك درێژدەبێتەوە، دواتر عەوامی خەڵك دێت. بەڵام ئەم ریزە هەمیشە قابیلی سڕەبڕی بوو. کاتێك یەکێك لە وەزیرەکان دوادەکەوت ئەوە ڕیزیان بۆ چۆڵ دەکرد، تا بە هاوشانەکانی خۆی بگات، بابەتەکەش بۆ هەموو بەرپرسەکان وەها بوو.

وەردی حاجی خەیرولڵا تلفاحی بینیوە لە نزیك سەرۆك وەستاوە و خەڵك هان دەدا تا بەخێرایی سڵاو لە سەرۆك بکەن و بەخێراییش بگەڕێنەوە، ئەمەش بە بیانووی بارودۆخی تەندروستی سەرۆك. دەنگی خەیرولڵا لەنێو خەڵکدا بە ئاشکرا دەبیسترا کە داوای لە خەڵك

دەکرد پەلە بکەن، بەڵام...

لەناکاو حاجی خەیروڵڵا داوا لە ئامادەبووان دەکات گوێ بگرن، وەك ئەوەی بیەوێ وتارێك بدات. هەموو گوێبیست بوون، ئەویش ڕووی لە ئامادەبووان کرد و وتی: بەناوی سەرۆك و خێزانەکەی سوپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکات کە لە پرسەکە ئامادە بوون، بارودۆخی سەرۆکیش ناخوازێ بۆئەوەی تەوقە لەگەڵ هەموو خەڵکەکە بکات. بۆیە دەکشێتەوە و خێزانەکەی پێشوازی لە خەڵك دەکەن. بەمشێوەیە سەرۆك و خەیروڵڵا تلفاح لە دواوەی سەکۆکە دەچنە دەرەوە و ئەندامانی خێزانەکەی بەردەوام دەبن لە پێشوازی خەڵکەکە.

وەردی باس لەوە دەکات هەندێك خەڵکی بینیوە لە گوندەکانی عێراقەوە هاتوون، بۆیە پرسیار لە یەکێك لە بەرپرسە بەشداربووەکان دەکات، ئاخۆ ئەوانە خزمایەتییان لەگەڵ سەرۆك هەیە؟

بەرپرسەکە دەڵێ: نەخێر، تەنانەت سەرۆك زۆربەیان ناناسێ.

وەردی دەڵێ: کەواتە بۆچی ئەو خەرجییەیان کردووە و هاتوونەتە بەغدا؟

بەرپرسەکە دەڵێ: ئەوان هاتوونەتە ئێرە لەبەر ناسینی سەرۆك نییە، هەموو عێراقییەکان سەرۆکی خۆیان دەناسن، بەڵام ئەوانە هاتوون بۆ ئەوەی پارێزگاری شارەکەی خۆیان بیانبینێ. لەوانەیە زۆرتر بایەخ بەوە بدەن سڵاو لە پارێزگار بکەن نەوەك سەرۆك!!

وەردی دەڵێ: بۆچی؟

بەرپرسەکە دەڵێ: ئامادەبوون لە پرسەیەك کە تایبەتە بە سەرۆکی دەوڵەت، بەبەرچاوی پارێزگار پێگەیەك بە کەسەکە دەدات. پارێزگار

ناتوانێ پرسیار بکات پەیوەندی ئەم هاووڵاتییە بە سەرۆک چییە. لەوانەیە سەرۆک بزانێ ئەمە هاووڵاتییەکە، بەڵام نایناسێ. بەڵام پارێزگار سەرسام دەبێت بەو پیاوەی کە لە پرسەی سەرۆک بینیویەتی، ناتوانێ هۆکاری ئامادەبوونەکەشی بزانێ. ئەو پیاوەش دوای ئەوەی پارێزگار لە پرسەی سەرۆک دەیبینێ، دەتوانێ کارەکانی پێشکەشی پارێزگا بکات. سەردانی پارێزگار دەکات و ئەوەی بیر دەخاتەوە کە لە پرسەی کوڕی سەرۆک لە بەغدا یەکتریان بینیوە. ئەم ڕستە ناڕۆشنانەش زۆرێك مانا لەخۆ دەگرن.

وەردی جارێکی دیکە پرسیار دەکات، ئەمە سەبارەت بەوانەی لە پارێزگاکانن، ئەی چی لەبارەی لادێییەکان. کە لەوانەیە موختاری گوندەکەی نەتوانێ بگاتە پرسەکە، ئەم پیاوە لادێییە مەبەستی لە ئامادەبوونەکە چییە؟

بەرپرسەکە وەڵام دەداتەوە: سەبارەت بەم پیاوە لادێییەی هاتۆتە پرسەکە. چاوی بڕیوەتە یەکەم دانیشتن کە موختاری گوند ئەنجامی دەدات، تا لەوێ بەسەرهاتەکانی بەغدا بگێڕێتەوە، کە لە پرسەی کوڕی سەرۆک ئامادە بووە. بەمەش پێشەنگ دەبێت، شان و شکۆی لەنێو هەموو خەڵکی گوندەکە دەبێت. بەتایبەتی ئەگەر چیرۆکە واقیعی و خەیاڵییەکانی لە پرسەکە زێدەڕۆیی تێدا نەبێت و تۆزێك ناڕۆشن بێت.

ئەمە بەسەرهاتی فاتیحەخوێنی بۆ گیانی محەمەدی کوڕی سەرۆک بەکر، وەك خۆی دەیگێڕایەوە. هەرچەندە من بڕوام وایە دەمەتەقێی وەردی لەگەڵ بەرپرسەکە خەیاڵییە، وەردی لەو میانەیەدا ویستوویەتی ڕۆشنایی بخاتە سەر لایەنێکی گرنگ لە هەڵسوکەوتی

شەخسیی مرۆڤ.

پرسەی دووەم: فاتیحەخوێنی بۆ یەکێك لە بەرپرسەکان کە وەردی ناوی نەهێناوە.

وەردی دەڵێ تاکسییەکم گرت و بەرەو شوێنی پرسەکە ڕۆیشتم. شوفێری تاکسییەکە تا نزیکترین شوێنی ڕێگەپێدراو بە وەستان منی نزیك کردەوە، کرێیەکەی وەرگرت و ڕۆیشت. کاتێك گەیشتمە دەروازەی هۆڵەکە بینیم بۆ دوو هۆڵی گەورە دابەشکراوە. پۆلیسەکان لەبەر هەردوو دەرگا وەستابوون. پۆلیسێکیش خەڵکەکەی دابەش دەکرد، هۆڵی یەکەم بۆ گەورە پیاوان بوو، هۆڵەکەی دیکە بۆ پیاوانی بچووك بوو لە عەوامی خەڵك و ئەو کەسوکارە نزیکانەی خوالێخۆشبوو کە پێگە و ناویان نەبوو.

وەردی دەڵێ لە نزیکەوە چاودێرییم دەکرد بۆئەوەی بزانم چی ڕوودەدا، تا ئەو کاتە گوێم لە یەکێك بوو بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد: مامۆستاکەم دکتۆر وەردی. ماقوڵە...! وەردی دەڵێ بۆ دەنگەکە ئاوڕم دایەوە، دەنگەکە هی ئەو پۆلیسە بوو کە خەڵکی بۆ گەورە و بچووك دابەش دەکرد. بەجۆش و خرۆشەوە پۆلیسەکە سڵاوی لە من کرد. وتی: دکتۆر لەوانەیە منت بیر نەکەوێتەوە، بەڵام من فڵانە ساڵ لە کۆلیژی ئاداب قوتابی تۆ بووم... دواتر دەستی منی گرت و منی گەیاندە هۆڵی گەورەکان و وتی: فەرموو دکتۆر، منیش چوومە ژوورەوە...

هۆڵەکە پڕ بوو لە گەورە پیاوانی دەوڵەت، بەگوێرەی ئاستی حکومییان لە ڕیزێك دانیشتبوون. دەنگی ئەوان تێکەڵ بە دەنگی قورئانخوێنەکە ببوو. هەرکە چوومە ژوورەوە و سڵاوم کرد و وتم

فاتیحە. بێدەنگی بۆ خوێندنی فاتیحە زاڵبوو. هۆڵەکە بەردەوام بوو لە بێدەنگی وەك ئەوەی ئەوان گێژ بووبن. منگە منگی دەنگە ناشازەکە ئەما کاتێك لە یەکەم چرکەساتی چوونە ژوورەوەم هەبوو.

سەیری ڕاست و چەپی هۆڵەکەم کرد، هەموویان بە پەستی سەیری منیان دەکرد، منیش هەمان نیگام بۆ ئەوان هەبوو. دوای چەند خولەکێك هەستم کرد لەو هۆڵەدا لەنێویان پەسەند نیم. بۆ مەبەستی ڕۆیشتن دووبارە فاتیحەم خوێندەوە. سڵاوم لە کەسوکاری مردووەکە کرد و لە هۆڵەکە هاتمە دەرەوە، هەستم کرد هۆڵەکە بە هاتنە دەرەوەی من هەناسەی ئاسوودەیی هەڵکێشا.

چوومە لای پۆلیسەکە ئەو قوتابیە نەجیبزادەیەی کە پێی وابوو مامۆستای زانکۆ لە عێراقی نوێ پێگەی لەنێو پیاوانی گەورە هەیە. ئەو لەم بۆچوونەی هەڵە بوو. پێم گوت بۆچی منت خستە ئەو هۆڵە هەستم کرد ئەوان زۆر لە من پەست ببوون. پۆلیسەکە وتی بەڵێ دکتۆر ئەوانیش بە منیان گوت، بۆچی ئەوت بۆ لای ئێمە خستە ژوورەوە !

پرسەی سێیەم: بۆ دایکی تاریق عەزیز جێگری سەرۆك وەزیران

وەردی دەڵێ تاریق عەزیز یەکێك بوو لە قوتابیەکانی لە کۆلیژی ئادابی زانکۆی بەغدا. ئەو پیاوە جێگری سەرۆك وەزیرانە و ساڵێك یان دووان لێی دەپرسی. دکتۆر گوێبیستی هەواڵی مردنی دایکی تاریق عەزیز دەبێت. بۆیە دەچێتە کڵێسا کە لەوێ تاریق عەزیز پێشوازی لە میوانەکان دەکات.

وەردی باس لەوە دەکات، تاکسییەك ئەوی گەیاندۆتە بەردەم دەرگای کڵێسا. لەوێ پیاوی ڕێوڕەسمی پێشوازیکردن وەستاوە،

ڕێگای چوونە ژوورەوە و دانیشتن بە خەڵکەکە نیشان دەدات. ئەم پرسەیەش لە دوو هۆڵ بوو یەکێك بۆ پیاوانی گەورە و ئەویتر بۆ پیاوانی بچووك. هەرکە پێشوازیکەرەکە وەردی دەبینی لە تاکسی دابەزیوە، ئەوا وەردی بەرەو هۆڵی پیاوانی بچووك ڕەوانە دەکات. وەردی دەڵێ هەندێك هەرزەکارم بینی، لە ئۆتۆمبیلە گرانبەهاکانیان دادەبەزین، تەنها لەبەر ئەوەی ئۆتۆمبیل و شوفێریان هەبوو بەرەو هۆڵە گەورەکە ڕەوان دەکران. ئەمە زۆر کاری لە دەروونم کرد، بەڵام ئەزموونێکی زانستییە دەبێت تا کۆتایی تەواو بکرێت.

وەردی دەچێتە هۆڵەکە و کڵاوی فەیسەڵییەی بەسەرەوە دەبێت، ئەمەش سەرنجی ئامادەبووە زۆرەکە ڕادەکێشێ. وەردی دەبینێ هۆڵەکە تێکەڵە لە پیاوان و ژنان، لەوەش دڵنیا دەبێتەوە کە زۆرێك لە ئامادەبووان کەسوکاری مردووەکەن. دوای ئەوەی وەردی لە شوێنێك دادەنیشێ و دەنگی بەرز دەکاتەوە و دەڵێ: الفاتحە. ئامادەبووانیش دەست بە کێشانی خاچ و نزا بۆ مردووەکە دەکەن. وەردیش ئایەتێکی شیاو بۆ ڕووداوەکە دەخوێنێتەوە، دەڵێ: (تبت یدآ أبی لهب وتب). ئەو سوڕەتەی لەهەب دوایین سوڕەت بوو کە من بە دەنگی وەردیم بیست. خۆزگە دەمتوانی بە دەنگی خۆی تۆمارم دەکرد.

## ئەنجامدانی ڕێکەوتنێک لە مەجلیسی خاقانی لە نێوان وەردی و نەیارەکانی

مۆفەق عومەڕیی پارێزەر پرۆگرامێکی بۆ خۆی دانابوو، وەردی دەچووە هەر شوێنێك بەدوای دەچوو، بۆ ئەوەی پێچەوانەی قسەکانی بوەستێتەوە و پێی بڵێ تۆ سیخوڕی و ماسۆنی و شعووبی. دواتر لەم تۆمەتانە مامۆستا ئەنوەری سامەڕایی پارێزەریش بووە هاوبەش. کە

زۆرجار لە عومەڕیی تووڕەتر و کەللەڕەقتر بوو، کە خەریك بوو هەندێك جار دەگەیشتە ئاستی دەبەنگ، دوور لە ڕووی ئەو، بەڵام هەندێك وشەی دەهاتە سەر زار شیاو نەبوو، هەندێك هەڵسوکەوتی نەخوازراوی ئەنجام دەدا.

مامۆستا سەلام شەماع لە گێڕانەوەکانی لەبارەی وەردییەوە، باس لەوە دەکات وەردی چۆن وەڵامی ئەم دوو کەسە دەداتەوە. بەتایبەتی ئەو کاتەی سامەڕایی، وەردی بەوە تۆمەتبار دەکات کە سیخوڕی دەوڵەتە. وەردی لە وەڵامی سامەڕایی دەڵێ: خەتای تۆ نییە، خەتای حکومەتە کە سیخوڕەکانی لە بەرامبەر پیاوی وەك تۆ ئاشکرا دەکات!

یەکێکی دیکە کە بنەمای فیکری تایفی هەبوو خودا لێی خۆش بێت، ئێستا ئەو کەسە وا خۆی نیشان دەدات مێژووی خەباتێکی مەزنی هەیە، هاتە ڕیزی دوو کەسەکەی دیکە بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر وەردی. لە بەدبەختی ئەو تایفەکەی خۆشی ئابڕوویان برد. بە دەنگێکی بەرز ناڕەزایی دەربڕی. ئەمەش لە چلەی ماتەمینی زانای گەورەی زمانەوانی مامۆستا مەهدی مەخزوومی بوو. من داوام لەم پیاوە تایفییە کرد هێمنی بپارێزێ، بەڵام وتی مەخزوومی کاتی خۆی لە سەردەمی شیوعییەکان و قاسم ڕازی بوو ببێتە ڕاگری کۆلیژی ئاداب. ئێستا ماڵی پیاوێکی ئایینی (مەبەستی شێخ عیسای باوکم بوو) بۆنە بۆ کەسێك ساز دەکەن کە لەگەڵ شیوعییەکان بووە!!

یەکسەر وەڵامم دایەوە و وتم تۆ بەر لە سێ هەفتە بۆ دکتۆر فلان ئاهەنگت سازکردبوو، ئەویش لە سەردەمی شیوعییەکان بینراوە، گوریسێکی ئەستووری بە دەستەوە بوو کە قەومییەکانی لەسەر زەوی

بە گوریسەکە ڕاکێشاوە، ئایا ئەمە دەزانی یان نا؟ وتی بەڵێ، بەلام ئەو لە کارەکەی خۆی پەشیمان بۆتەوە. وتم چۆن ڕێگە بەخۆت دەدەی مامۆستایەکی وەکو مەخزوومی تۆمەتبار بکەیت، تەنها قبووڵی ڕاگرێتی کۆلێژی ئادابی کردووە، ئەمەش پۆستێکی زانستییە بە کەسێك دراوە کە شایەنیەتی. کەچی پاساو بۆ کەسێك دەهێنیتەوە کە خەڵکی لەسەر شەقامەکان بە گوریس ڕاکێشاوە. ئەو بێدەنگ بوو، من بێدەنگ نەبووم، وتم دەزانی بۆ؟ چونکە تۆ کەسێکی تایفەگەرییت تا سەر ئێسقان. ئەوەی ئێمە ئامەنگی بۆ دەکەین عەرەبی مەخزوومە، ئەوەی تر عەرەبی بەنی قەیسە (ئەمە بۆ نموونە) ئەگەر بۆنەکەشت بەدڵ نییە، ئەوا ئێمە بە بوونی کەسێکی تایفی لەنێوماندا شەرەفمەند نابین. دەستیکرد بە هەڕەشە و گوڕەشە، بەلام چووە دەرەوە!

ئەم ڕووداوە وایکرد مامۆستا عومەڕیی و سامەڕایی لە مەجلیسی خاقانی سڵ لەوە بکەنەوە هێرش بکەنە سەر وەردی. بەتایبەتی مامۆستا ئەنوەر وەك پاڵپشتییەك بۆ کەسە تایفییەکە کە لە مەجلیس دەرکرابوو، ماوەیەکی زۆر نەهاتەوە مەجلیسەکەمان. لە دوای ئەوان وەردی زۆر دڵگران بوو، سەرەڕای ئەوەی ئەوان لە بەرامبەر وەردی سنووریان دەبەزاند، کەچی لە زۆربەی کاتەکان ئەم دووانە عومەڕیی و سامەڕایی جووڵەیان دەخستە مەجلیسەکەوە!

لە جەژنێکدا، کە سێیەم ڕۆژی دەکەوتە سێشەممە، سەردانی ئال محێدینم کرد بۆ ئەوەی پیرۆزبایی لە مەجلیسە دێرینەکەیان بکەم. عومەڕیی و سامەڕاییم لەوێ بینی، بە گلەیی دەستمان بە گفتوگۆ کرد. جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە، گوایە من سەرزەنشتی ئەو

کەسانە دەکەم کە مشتومڕ لەگەڵ وەردی دەکەن. داوام لێکردن بگەڕێنەوە مەجلیس و بۆ ئەوەی ئاشتبوونەوەیەك لەگەڵ وەردی ئەنجام بدەن. یەکسەر ڕازی بوون. هەرچۆنێك بووایە وەردی کەسێکی پەسەندکرا و خۆشەویست بوو. دکتۆر زوهێر محێدین و مامۆستا ئەوس محێدین پیرۆزباییان لەو ڕێکەوتنە کرد کە لە مەجلیسی ئال محێدین ئەنجام درا.

پیاوە تایفییەکە هەڵسایەوە چەند مەرجێکی بۆ گەڕانەوەی مەجلیسەکە دانا. تا لەگەڵ دووەکەی دیکە بگەڕێتەوە. بۆ خۆهەڵقورتاندنەکەی سوپاسم کرد و بە دەنگێکی ڕوون وتم: مەرجەکانت جێی قبووڵکردن نین. ئەگەر دەتەوێ لە مەجلیسی ئێمە ئامادەبیت ئەوا دەبێت پەیوەست بیت بە مەرجەکانی ئێمە، لەوەی نابێ دووبەرەکی بخەیتە ناو خەڵك. ئەو سێ مەرجەم بۆ باسکرد کە مامۆستای دانا و زانا حوسێن مەحفووز دایناب‌وو. دڵنیاشم کردەوە بانگهێشتی گەڕانەوە بۆ مەجلیس ئەو ناگرێتەوە، بەڵکو ئەم بانگهێشتە تایبەتە بە عومەڕیی و سامەڕایی. دەستی کرد بە هەڵەشەیی و باسی خەباتی نەتەوەیی خۆی بۆ من کرد. داوام لێکرد ئەم بەیاننامەیە بۆ کەسانی دیکە بخوێنێتەوە، نەوەك من. ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێ: من لە خانەوادەیەکی عەرەبی ڕەسەنم، کە ئەویش خەباتی کردووە. هەرچەندە باوەڕم بەوە هەیە (عەرەب و عەجەم هیچیان لەسەرووی ئەویتریان نییە تەنها بە خوداپەرستی نەبێت) تا ئەمڕۆ پەیوەندیم بەم پیاوە نەماوە، مەجلیسەکەمان بەدەست ئەو پیاوە و تایفەگەرییەکەی حەسایەوە.

ڕۆژی دیارکراو، عومەڕیی و سامەڕایی هاتن لەگەڵ وەردی دانیشتن.

ڕاستیەکە ئەوە بوو سامەڕایی لە هەموو قسەکان پاشکۆی عومەڕیی بوو. عومەڕیی وتی وەردی لە کتێبێکی سەبارەت بە سەردەمی پاشایەتی باسی باوکی ئەوی کردووە. ئەمەش دڵی شکاندووە. وەردی وتی ڕاستە بەڵام من باسم لە قسەی خەڵك کردووە. باوکی مامۆستا مۆفەق لە سەردەمی پاشایەتی سەرۆك وەزیران بوو. (مستەفا مەحموود عومەڕیی لە ١٨٩٤ لە موسڵ لەدایك بووە، لە ١٩٦٠ لە لەندەن مردووە. لە سەردەمی پاشایەتی شەش جار وەزیری ناوخۆ بوو. لە ساڵی ١٩٥٢ بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران هەڵبژێردرا. لە دوای شۆڕشی ١٩٥٨ لەماڵەکەی خۆی گۆشەگیر بوو.)

وەك دەردەکەوێ وەردی لەسەر زاری هەندێك کەسەوە نووسیویەتی وەزیری ناوخۆ بەرتیلخۆر بووە. ئەمەش وایکردووە عومەڕیی دڵی لە وەردی بشکێ. چەندین ساڵ هەوڵی داوە بەڵگەیەکی دەستبکەوێ بۆ ئەوەی لە تۆمەتەکانی دژی وەردی بەکاری بهێنێ، بەڵام وەردی لە هەموو تۆمەتەکاندا شەرمەزاری دەکرد. تەنانەت وەردی ڕۆژێکیان لەبارەی خۆیەوە وتی، گوێی لە کەسێك بووە وتوویەتی بەعسییەکان هەموو ئیسلامی و قەومییەکان و ئیخوان و پیاوانی دەعوە و ماسۆنی و بەهاییەکانیان دادگایی کردووە. سەدان کەسیان بە تۆمەتی سیخوڕی لەسێدارە داوە. کەچی وەردی ماوەتەوە تۆمەتیان بۆ نەدۆزیوەتەوە. وەردی دەڵێ یەکێك وەڵامی ئەو کەسە دەداتەوە و دەڵێ: چونکە وەردی لە هەموویان ترسناکترە بۆیە هەتا ئێستا دەستگیریان نەکردووە.

لە کۆتایی شەوی ئاشتبوونەوەکە وەردی ئاوڕی لە من دایەوە وتی بەیانی کاتژمێر ٧ وەرە دوام بۆ ئەوەی بچینە مەجلیسی ئال محێدین.

وتم فەرمانتە دکتۆر. وتی پەیوەندییت پێوە ناکەم. وتم باشە لەبیرمە ئینشائللا دێمە لات. وەردی وتی: تەلەفۆنی ماڵەوە لەکار کەوتووە. وەستا هاتووە کە فەرمانبەری فەرمانگەی گەیاندنە. بۆ چاککردنەوەی هێڵەکە داوای ٢٥٠ دینار دەکات. خەیاڵ بکە ئەو ٢٥٠ دینار بەرتیلی دەوێ بۆ ئەوەی هێڵەکە چاکبکاتەوە. منیش وتم پێت نادەم، تەلەفۆنم ناوێ. سەرۆك وەزیران لە سەردەمی ئێمە پەنجا دیناری بەرتیل وەردەگرت، تۆش کارەباچی ٢٥٠ دینارت دەوێ. هەموو پێکەنین!

## ناڕەزایی وەردی لە فەتوایەکی خومەینی

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران، فەتوایەك لەلایەن خومەینی ڕابەری شۆڕش درا. لە فەتوایەکە ڕێگە دەدا دەست بۆ خاوەندارێتیی هزری ببرێت، بە بیانووی ئەوەی بیرمەندەکە هزری خۆی بۆ خەڵك دەرخستووە و بەشی خۆی پارەی بردووە. بۆیە دەکرێت دووبارە بەرهەمەکانی چاپ و بڵاوبکرێتەوە، بێ ئەوەی ئاگادار بکرێتەوە یان زێدەتر مافی پێ بدرێت لەوەی کە لە چاپی یەکەم وەریگرتووە.

ڕاستییەکەی دەڵێم وەردی لە دەزگاکانی چاپ ڕازی نەبوو، کە لە ئێران سەدان چاپیان بۆ کتێبەکەی ئەو کردووە، بێئەوەی بۆچوونی وەربگرن و یان هیچ پاداشتێکی ماددی پێ بدەن، بەو شێوەیەی کە لە هەموو دونیا کاری پێ دەکرێت. کاتێك ناوەڕۆکی فەتواکە و بەڵگە فیقهییەکەم بۆ وەردی ڕوون دەکردەوە، وەردی بە گاڵتەوە وتی" ئەم بێسەروبەرییە چییە".

بۆ زانینی بنەمای فەتواکە لەبارەی خاوەنداریتیی هزری،

گفتوگۆیەکەم لە ئینتەرنێت دۆزیوەتەوە. ئەبوقاسم گورجی مامۆستای بنەما و بابەتە فیقهییەکان لە حەوزەی زانستیی قوم، لە دیمانەکەدا بۆچوونی جیاوازی فیقهناسەکان لەبارەی مافی خاوەندارێتیی فیکری ڕوون دەکاتەوە. دەڵێ: لە شەریعەت تێکستێکی ڕاستەوخۆ یان ئاماژەیەکیش لەم بارەیەوە نییە. بۆ نموونە ئایەتی (احل الله البيع) یان ئایەتی (اوفوا بالعقود)، بە بڕوای ئەو فیقهناسانە نە لە ڕووی مامەڵەوە نە لە ڕووی گرێبەستەوە بابەتی هزری ناگرێتەوە. واتە ناکرێت نووسەر مافی نووسین بفرۆشێت، چونکە ئەو بابەتە دەچێتە بواری گومانکردن لە میسداقیەت. واتە ئێمە گومان لەوە دەکەین فرۆشتنی مافی واتایی بۆ هەر کارێکی هونەریی بە مامەڵە دادەنرێت یان نا. تا دواتر بزانین ئایەتەکەی لەسەر جێبەجێ دەبێت کە خودای گەورە فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە، یان گرێبەستی لەبارەوە بکرێت، تا پابەند بین بە گرێبەستەکەوە. لە تێڕوانینی ئەم فیقهناسانەوە لە کاتی گومانکردن لە میسداقیەت ناکرێت بە شێوەیەکی گشتی دەست بە بابەتەکەوە بگیرێت. بەپێی ئەم بەڵگەهێنانەوە، بەهیچ شێوەیەك ناکرێت دان بە مافی خاوەندارێتیی فیکری بهێندرێ. بێگومان فیقهناسان ئەم بۆچوونەیان لەسەر بنەمای ئیجتهادکردن و تێڕوانینی پسپۆڕێتیان گەڵاڵە کردووە.

بەڵگەکانی بێبەریکردن و ڕێگەدان، کە لە بەڵگە شەرعییەکانەوە هاتووە نموونەی (خودا هەموو شتێکی لەسەر زەوی حەڵاڵ کردووە.) یان بەڵگە عەقڵییەکان لە نموونەی (دزێوی ئەنجام بێ ئاشکراکردن) ئەم بەڵگانە لە بابەتی موڵکدارێتیی هزری لە حاڵەتی گومانـاوی پشتیان پێ دەبەسترێت. ئەو کاتەش زۆر بە ئاسانی دەستی بەسەردا

دەگیرێت. گرنگ بڕیاری دانراوە، نەوەك شەرعی، ئەگەر هاتوو مافی خاوەنداریێتیی فیکری بفرۆشرێت، ئایا ئەمە دەچێتە خانەی موڵکەکانی کڕیار، تەنها لە بەرامبەر کەمێك پارە؟ ئایا دەتوانێ خاوەنەکەی وەك موڵکەکانی دیکە مامەڵە بەو خاوەنداریێتییە فیکرییە بکات کە کڕیویەتی؟ ئەگەر کەسێك ویستی مامەڵەی پێوە بکات، ئەوا مامەڵەکردنەکەی شێوەیەکی یاسایی وەردەگرێت!

ئەمە ناوەڕۆکی فەتواکە و هۆکارەکەیەتی، دەبێت کەسی زەرەرمەند بچێتە لای فیقهناسێکی دیکە.

## زاراوەکانی عەلی وەردی

دکتۆر عەلی وەردی زاراوەی تایبەت بە خۆی هەبوو. هەندێك لەوانە بەخۆی دروستی کردبوو، هەندێکی دیکە لە مێژووی وەرگرتبوو. بەهای ئەو زاراوانە تەنها لە جوانییەکەیان نییە، بەڵکو لە شێوازی دەربڕینیەتی. وەردی بە شێوەیەکی تایبەت ئەو زاراوانەی گۆ دەکرد، کەسێك نەبوو لە خەڵك لاسایی بکاتەوە. ئەو لەسەر وشەکەی دەوەستا، تا بزانێ گوێگر تێیگەیشتووە. لەوانەبوو هەر کەسێك پرسیاری لەبارەی زاراوەکە بکردبووایە ئەوا وەردی شیکردنەوەی بۆ دەکرد. بەداخەوە تۆمارێکی دەنگی وەردیم نییە، کە کەس ناتوانێت لاسایی بکاتەوە. یەکێك لە مامۆستاکان کاریگەر بوو بە شێوازی وەردی و سەرسام بوو بە وەردی. هەمیشە دەیویست وەك ئەو بڕوات و وەك ئەو قسە بکات، بەڵام لەگەڵ ڕێزی زۆرم بۆ ئەم پیاوە، کە ئێستا ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە، شێوازەکەی کرچ و کاڵ بوو، لە هیچ شتێك لە وەردی نەدەچوو. تەنانەت ڕۆیشتنەکەی خۆشی لەبیرکرد.

## ( پەە پەە چی )

بەناوبانگترین زاراوەکانی وەردی (پەھ پەھ چی) بوو. وەردی ئەم ناوەی لە کۆمەڵە گەنجێکی کازمیە نابوو، کە بەدوای چالاکییەکانی بوون، لە هەموو کۆڕەکانی ئامادە دەبوون، بۆ هەر کوێیەك دەچوو بەدواوەی بوون. بێگومان من یەکێك بووم لەوان. مامۆستا سەلام شەماع و باسل خەزرەجی و عەبدولموتەڵیب مەهدی عەبود، بەناوبانگترین پەهپەهچییەکانی وەردی بوون.

وشەکە تورکییە بە مانای (لایەنگرەکان) دێت. وەك دەردەکەوێت ئەم وشەیە لە سەردەمی عوسمانییەکان هاتۆتە عێراق، کاتێك تورك بە قسەیەك سەرسام بووایە ئەوا دەیگوت (پەھ پەھ) عەرەبی کۆن لە کاتی سەرسام بوون دەیگوت (بەخ بەخ). ئەم وشەیە لە سەردەمێکی درەنگی دەوڵەتی عوسمانی کەوتە چایخانەکانی عێراق. کاتێك یەکێك هەقایەتێکی لە نموونەی ئەبوزەیدی هیلالی بۆ ئامادەبووان دەگێڕایەوە، جا کاتێك چیرۆکەکە دەگەیشتە پاڵەوانێتییەکانی ئەبوزەید، ئامادەبووان دەیانگوت"پەھ پەھ" ئەم وشەیە دواتر بۆ جەماوەری گۆرانیبێژان و هونەرمەندان گوێزرایەوە، ئەوان گوێبیستی گۆرانییەکان دەبوون و (پەھ پەھ)یان دەکرد تا جەماوەرەکە بەجۆش و خرۆشتر دەبوو.

## دکتۆر ساقوڵ

وەردی بە ئێمەی دەگوت پەهپەهچی کەچی مامۆستا مەحفووز بە (ئەحاسن) ناوی دەبردین کە بە واتەی باشترینەکان دێت. وەردی بەم ناوە هەرگیز مەبەستی بچووككردنەوەی لایەنگرەکانی نەبوو. تەنانەت زاراوەیەکیشی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو، واتای خۆی هەبوو. کاتێك بە

ئێمەی دەگوت پەهپەهچی بە خۆشی دەگوت (دکتۆر ساقولّ). ساقولّ بە زمانی خەڵکی عەوامی خەڵك بە کەسێك دەگوترێت کە زۆر شت دووبارە بکاتەوە، بۆیە دەگوترێت فلانە کەس ساقوڵە واتە زۆر شت دووبارە دەکاتەوە و ترش و خوێی دەکات. لەبەر ئەوەی وەردی هەر لە ناوەڕاستی چلەکانەوە تا ناوەڕاستی نۆهەدەکان کە ئەو کاتە بوو کۆچی دوایی کرد، بەدرێژایی نزیکەی نیو سەدە قسەی لەسەر کۆمەڵگای عێراقی دەکرد، بۆیە زۆربەی جار قسەکانی دووبارە دەکردەوە و ترش و خوێی دەکرد.

کاتێك دکتۆر ساقولّ گەیشتە تەمەنی هەشتا ساڵی، داوای شتێکی گرنگی لە پەهپەهچییەکان کرد. ئەویش ئەوە بوو چاودێری قسەکانی دکتۆر بکەن کاتێك لە کۆڕەکان قسەی دەکرد. ئەگەر ناچار بوو نموونەیەك بهێنێتەوە و وەڵامی پرسیارێك بداتەوە، دواتر لەبیری کرد لە موحازەرەکەی گەیشتۆتە کوێ و قسەی لەسەر چی دەکرد، ئەمەش بەهۆی تەمەن بوو، چونکە لە ڕۆژانی کۆتایی تەمەنی کەمێك زەینی پەرتەوازە دەبوو. ئەو کاتە ئاماژەی بۆ پەهپەهچییەکانی دەکرد و دەیگوت"وین کنا" واتە گەیشتینە کوێ؟ ئێمەش یەکسەر وەڵامی دکتۆر ساقوڵمان دەدایەوە، لەبەر دووبارەکردنەوە هەموومان ئەزبەر کردبوو، لەوانەش بوو هەندێك جار شەرمەزارمان دەکرد و هەڵەمان دەکرد، ئەویش دەیگوت **"لاحول ولا قوة إلا بالله"** **"استغفرالله"** بە نیگایەکی تووڕە سەیری دەکردین و دەگەڕایەوە سەر موحازەرەکەی.

## مرازت حاسڵ ناکەم

یەکێك لە بەناوبانگترین چیرۆکەکانی وەردی کە لە کتێبی

(چاوپێداخشـانێکی کۆمەڵایـەتی بـە مێـژووی نـوێی عێـراق) باسـی کردووە، ئەو چیرۆکەیە کە بە عەرەبی (ما انفه لك) ناسراوە. تەنانەت ئەم وشەیە بۆتە پەندێکی عێراقی، واتاکەی من مرازت حاسڵ ناکـەم دەدات. ئەمـــەش یـــەکێك لـــە زاراوە تراژیـــدیاکانی وەردی بـــوو. دەگێڕێتەوە کە شەقاوەیەکی خۆهەڵکێش لە بەغدا هـەبووە، هیـوای خواستووە پۆلیس دەستگیری بکات بۆ ئەوەی لـەنێو خـەڵك ناسـراو بێت و لێی بترسن، بزانن دەرچووی زیندانە. بەمەش پارە لـە خـەڵك وەردەگرێ. ئەو پیاوە ئەو کات مەرجەکانی شەقاوەیی تێدا نەبووە. بۆیە هەرکە بیستوویەتی لە شوێنێك دزی کراوە، ئەوا بەر لە پۆلیس خۆی گەیاندۆتە ئەم شوێنە و پێڵاوەکەی لـەوێ فڕێداوە. دواتـریش دەچێتە بنکەی پۆلیس و پرسیار لە دزییەکە دەکات، ئـاخۆ پـۆلیس دزەکەی دەسگیر کردووە. ئەفسەری پۆلیس پێی دەڵێ" کڵاشەکەی تۆمان دۆزیوەتەوە. هەڵیگرە و بڕۆماڵەوە، من هەرگیز ئەو مـرازەت حاسڵ ناکەم، دەتەوێ لەسەر حسێبی من بەناوبانگ بیت.

ڕۆژێکیان دوای ئەم کۆڕەی کە لە ساڵی ١٩٩١ بۆ جەماوەر ئەنجامی دابوو، سەلام شەماع نـاوی نـاوە بۆمبـەکانی وەردی. مـن پرسـیاری ئەوەم لە وەردی کرد ئایا لە ستەمی ڕژێم ناترسێ بەمشێوەیە قسەیان لەسەر دەکات، ڕەخنە لە سیاسەتیان دەگرێت. وەردی بـە منـی وت من لە دەروازەی هەشتا ساڵم. سوپاس بۆ خوا هێندە سەرکەوتنم لە ژیانم بەدەستهێناوە لە ژماردن نایەت. من کاتێك بەم توندییە ڕەخنە لە ڕژێم دەگرم، دەمەوێ کۆتاییەکی تراژیدیم هـەبێت. لەلایـەك ئـەم کۆتاییە لەنێو خەڵك نەمرم دەکات، لەلایەکی دیکەش بەدرێژایی مێژوو ئەم کارە ڕیسـواکردنی ڕژێـم دەبێـت. بـەڵام وەك دەردەکـەوێ ڕژێـم

هەستی بە پلانەکەی من کردووە، نایەوێ ئەم مرازەم حاسڵ بکات!!

## لە جەژنی لەدایکبوونیدا: سوپاسی ستایشکەران دەکەم

مەبەستم بوو بە بۆنەی جەژنی لەدایکبوونی وەردی ئاهەنگێك ساز بکەین. لەبارەی ڕۆژی لەدایکبوونی وەردی، پرسیارم لە دکتۆر حوسێن عەلی مەحفووز کرد. لە وەڵامدا وتی ئەو نازانێ بە مێژووی زایینی کەی لەدایك بووە، بەڵام دڵنیایە کە ڕۆژی جەژنی قوربان لە مانگی کۆچی لەدایك بووە. سوپاسم کرد و کەلوپەلم ئامادەکرد و کێکی لەدایکبوونم کڕی. تەنها هەواڵەکەم بە چەند کەسێکی ئازیز دا، ئاگاداریشم کردنەوە کە ئەمە بەنهێنی بێت، نەوەك وەردی ڕازی نەبێت. چونکە ئەو بەتەواوی ڕەتی دەکردەوە جەژنی لەدایکبوونی بۆ بکرێت. داوام لە مامۆستایانی گەورە کرد بەم بۆنەیەوە وتار ئامادە بکەن. وتەیەکی مامۆستا مەحفووز هەبوو، وتەیەکی مامۆستایان عەبدولباقی نەجاڕ و عەباس عەلی مەندەلاوی هەبوو، لەگەڵ شیعرێکی شاعیری گەورە ڕازی مەهدی و وتەیەکی منیش هەبوو.

وەك دەرکەوت یەکێکیان نهێنییەکەی لای دکتۆر وەردی درکاندبوو، ئەویش ئامادە نەبوو، بە تەلەفۆن پەیوەندی کرد و وتی تەندروستی هاوکاری نابێت بۆ ئامادەبوون. دوای هێنان و بردنێك، وتی بە بۆنەکەی زانیوە، بەم هۆیەش ئامادە نابێت. منیش ڕازیم کرد وتم ڕۆژی جەژنە، خەڵك بۆ جەژنانە سەردانی مەجلیسەکە دەکات، ئێمەش نامانەوێ خەڵك بە کۆڕ خەریك بکەین، تەنها توێژینەوەیەکی کورت لەسەر فەیلەسووفی فەڕەنسی دیکارت پێشکەش دەکەم. (ڕینیە دیکارت فەیلەسووف و زانای ماتماتیك بوو لە ساڵی ١٥٩٦ لەدایك بووە، لە ساڵی ١٦٥٠ کۆچی دوایی کردووە، بە باوکی فەلسەفەی نوێ

دادەنرێت) دواتر کەمێك قسە لەبارەی فەلسەفە دەکەین، لەوانەیە هەندێك قسەی خۆش لەبارەی جەژنی لەدایکبوونی تۆ بکەین. بە درۆ سوێندم خوارد کە قسەکانم ڕاستە. ئەو زانی سوێندەکەم ناشەرعیە و لەوانەیە پابەند نەبم بە سوێندەکە، وتم وا دێمە لات. وتی دەی وەرە، بەڵام بەمەرج، ئەو گێرە و کێشەیەی جەژنی لەدایکبوون نەبێت. وتم باشە ڕێککەوتین، وا بەڕێگاوەم.

لەگەڵ برایانم ئەوانەی سەرپەرشتی مەجلیس دەکەن، لەوانە عەبدولموتەڵیب مەهدی و سادق جەزائیری و باسل خەزرەجی ڕێکەوتین خۆیان بۆ هێنانە ژوورەوەی کێکەکە ئامادە بکەن، ئەو کاتەی من لە وتەکەم باسی ڕۆژی لەدایکبوونی وەردی دەکەم، بۆئەوەی لەناکاو بێت و دواتر وتە و شیعرەکان دەخوێنرێنەوە. بەڵام دەبێت ئاگاداربین وەردی تووڕە نەکەین. لەگەڵ خۆم کوڕەکانم عەلی و عیسام برد کە ئەو کات زۆر بچووك بوون بۆ ئەوەی هاوکاری وەردی بکەن لە بڕینی کێکی جەژنی لەدایکبوون.

کاتێك چووینە ماڵەکەی وەردی هەستی بە کەشوهەوای ئاهەنگگێڕان کرد، وتی ئەمە چییە؟ وتم جەژنە. ئێمە هەموو ساڵێك بە بۆنەی جەژن ئاهەنگ دەگێڕین. وەردی خۆی مەڵاس دابوو وەڵامی سڵاوی ئامادەبووانی دەدایەوە. منیش لەسەر سەکۆکە دانیشتم و ناوی خوام هێنا و سەڵەواتم لێدا و پیرۆزبایی جەژنم لە ئامادەبووان کرد. دواتر وتم بە بۆنەی جەژنەوە وامان بەچاك زانیوە کۆڕەکان ڕەت بکەینەوە، ئەمڕۆ تەنها باس لە توێژینەوەیەکی کورت دەکەین کە لەلایەن منەوە پێشکەش دەکرێت لەبارەی دیکارت و فەلسەفەکەی. هەستم کرد وەردی واز لە خۆمەڵاسدان دەهێنێ و لەسەر کورسییەکەی ئاسوودە

دەبێت. ماوەی پێنج خولەك قسەم لەسەر دیکارت کرد. دواتر وتم فەڕەنسا بە بۆنەی دیکارتی فەیلەسووفەوە ئاهەنگێکی جیهانی گێڕا، سەیری وەردیشم دەکرد. بینیم لەگەڵ بۆچوونی منە دیکارت شایەنی ئاهەنگگێڕانە. لە پاش ئەمە وتم هەرچەندە ئیبن عەرەبی فەیلەسووف لە دیمەشق نێژراوە، کەچی قاهیرە بە بۆنەی ٨٠٠ ساڵەی لەدایکبوونی ئیبن عەرەبی ئاهەنگی گێڕا، ئەمەش بۆ دەرخستنی چاکەی ئەو بیرمەندە گەورەیە. هێشتا وەردی لەگەڵ بۆچوونەکانی من کۆك بوو.

دواتر کەمێك قسەم لەسەر فەلسەفەی ئیبن عەرەبی کرد، کە چۆن لە سەردەمی خۆی و دواتریش خەڵك درکیان بە فەلسەفەکەی نەکردووە. ئینجا وتم مافی بەغدایە ئاهەنگ بۆ زانا و مەزنەکانی خۆی ساز بکات. ئەمڕۆش ڕێکەوتە لەگەڵ هەشتا ساڵەی لەدایکبوونی دکتۆر عەلی وەردی وەك چۆن قاهیرە دوای هەشت سەدە جەژنی لەدایکبوونی بۆ ئیبن عەرەبی سازکرد، بەغداش بە بۆنەی هەشتا ساڵەی لەدایکبوونی وەردی ئاهەنگ دەگێڕێت. وەك پێشتر ڕێکەوتبووین کێك هاتە ژوورەوە و منداڵەکانم عەلی و عیسا چەقۆیان هەڵگرتبوو بۆ ئەوەی وەردی کێکەکە ببڕێت!

وەردی چەقۆکەی بە دەستەوە گرت لە دوولا سووڕاندییەوە و زەردەخەنەی بە ڕووی منداڵەکان کرد و وتی ئێستا چی بکەم. هەموومان دەورمان دا و وتمان کێکەکە ببڕە، وتی لە کامە لا، وتمان بیکە دوو بەش. چەقۆکەی بە کێکەکە داهێنا و بەمشێوەیە وەردی لە تەمەنی هەشتا ساڵی یەکەم کێکی لەدایکبوونی بڕی، خودا لێی خۆشبێت. هەموو چەپڵەمان لێدا. کێکی دیکەی بچووك هات، وەردی وتی:"ئەمە چییە". گوتمان ئەو کێکە تایبەتە بە تۆ مامۆستا

مـەحفووز هێناویـەتی. بـە زمـانی بەغـدایی سوپاسـی کـرد و دواتـر وتی:"ئەیابـە.. عیـد مـیلاد". واتـە " ئـەی هـاوار .... جـەژنی لەدایکبوون".

وەردی وایزانی بە بڕینی کێکەکە ئاهەنگەکە کۆتایی هاتووە. منـیش جارێکی دیکە دانیشتمەوە بۆ ئەوەی مامۆستا مـەحفووز پێشـکەش بکەم، کە قسە لەسەر وەردی دەکات. بەمشێوەیە ئاهەنگەکە دەست پێدەکات و وەردیش ناچار بوو گـوێبگرێ. ئـەوان قسـەیان لـەبارەی وەردی دەکرد و بـە شـیعر و پەخشـان ستایشـیان دەکـرد، ئـەمیش دەمی بۆ لای ڕاست و چەپ دەجووڵاند و بە دەنگێکی بەرز دەیگوت" ئەدی، ڕاستە". گاڵتەی بە قسەکەرەکان دەکرد. مامۆستا مـەحفووز قسەی لەسەر ئەوە کرد بۆچوونەکانی وەردی چ دەنگدانەوەیەکی لە کۆمەڵگا دروست کردووە، و کاردانەوەشی بەدواوە هاتووە. بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بـە ڕەخنـەی شـیعر و ئەدەبەوە هەیـە. مامۆسـتا عەباس عەلی قسەی لەسەر بیری وەردی و تێزەکانی کـرد. مامۆسـتا عەبدولباقی نەجار قسەی لە سـەر جووڵانـەوەی وەردی کـرد لەگـەڵ کاریگەرییەکانی بەسەر توێژی قوتابیان. ڕازی مەهدی قەسیدەیەکی خوێندەوە. محەمەد خاقانی باسی لە هەندێك تێزەکانی وەردی کرد، بەراوردی کرد بەو تێزانەی کە فەیلەسووفانی فـارس لەسـەر ئـەویان گەلاڵـە کـردووە. ئێوارەکـە کۆتـایی هـات، بـەڵام وەردی داوای کـرد سوپاسی هەموان بکات، بۆیە مایکرۆفۆنی پێدرا.

وەردی وتی لەڕاستیدا بۆ من دانیشتنێکی لەناکاو بوو، من چاوەڕوانی نەبووم. قسەتان لەسەر هەندێك شت کرد، دڵخۆش بووم لـە ئێـوەی دەبیستم. زانیومە دکتۆر مەحفووز ئەو مێژووی لەدایکبوونی منی بە

ڕۆژمێری کۆچی بە ئێوە وتووە کە ئەمەش دەکاتە ڕێکەوتی ٨٤ ساڵی کۆچی و ٨٠ ساڵی زایینی. بەم بۆنەیەوە من سوپاسی ستایشکەران دەکەم. مامۆستا مەحفووز هێندە پێکەنی تا چاوی ئاوی کرد. ئێوارەکە کۆتایی هات. بە مامۆستا مەحفووزمان وت چی تۆی هێنایە پێکەنین، لە وەڵامدا وتی"وەردی لە کۆتایی ئاهەنگەکە جنێوی بە هەمووموان دا". وتمان "چۆن؟" وتی"کاتێک وتی سوپاسی ستایشکەران دەکەم، ئاماژەی بۆ فەرموودەیەکی پێغەمبەر کرد کە دەفەرموێ خۆڵ بە چاوی ستایشکەران بکەن!" .

## حەڵاڵکردنی سەما و ژن و مەینۆشی لە تێکەڵە مەزهەبێک

ئەندازیار جەعفەر عەلی وەردی، کوڕی دکتۆر عەلی وەردی لەبارەی باوکییەوە لە یادەوەرییەکانیدا کە لە یەکێك لە ڕۆژنامەکان بڵاوکراوەتەوە دەڵێ باوکی زۆر سەفەری کردووە... هاوینی لە ئەسکەندەریە بەسەر بردووە، حەزیشی دەکرد زستان لە بولگاریا بەسەر ببات. منیش ڕۆژێك مامۆستای ئینسکلۆپیدی عەبدولجەبار مەتڵەبیم بینی، خوالێخۆشبوو مامۆستای زمان بوو، ماوەیەك لە ناوەڕاستی شەستەکان ڕاوێژکاری ڕۆشنبیری کۆماری عێراق بوو لە باڵوێزخانە لە قاهیرە. پرسیاری ئەوەم لێکرد هیچ پەیوەندی بە وەردی هەبووە. بە ئەرێنی وەڵامی دایەوە و باسی ئەوەی کرد هاوینان وەردی بینیوە کاتێك سەردانی میسری کردووە. کاتێك دەگەیشت دەهاتە باڵوێزخانە، دواتر ون دەبوو تا ڕۆژی گەڕانەوە بە سەلامەتی خواحافیزی دەکرد. مەتڵەبی وتیشی: بە پێچەوانەی زۆربەی ئەدیب و ڕۆشنبیران بوو، چونکە بوونی ئەوان لە قاهیرە بارگرانی بوو، بۆ ئێمە، ئەمەش لەبەر زۆری کێشە و داواکارییان.

وەردی بۆی گێڕامـەوە یـەکێك لـە هاوڕێکـانی کـە لـە نێوەنـدی ڕۆشنبیریدایە، لە میسرِ ناسیویەتی، (عەوامـە)یان لـە ئەسـکەندەریە هـەبووە، هاوینـان بـەکرێیان گرتـووە، لـە میسـرِ بـە هـاوڕێ ڕۆشـنبیرەکانیان دەگـەن. عەوامـە خانووێکـە لەسـەر دەریـا لـە دار دروست دەکرێت. هەتا ئێستاش ئەسکەندەریە بەشێك لەو عەوامانەی تێدا ماوە. وەردی دەڵێ ڕۆژێك لە ئەسکەندەریە یـەکێك لـە هاوڕێیـە دیندارەکانم بینی، قسە و دەمەتـەقێمان کـرد. هاوڕێیەکـەم داوەتـی کردم تا سەردانی عەوامەکەی بکەم، بۆ ئەوەی لەو کەشوهەوایە بێمە دەرەوە کە تێیدا دەژیم! ! منیش بڕیارم دا سەردانی بکەم، بۆ ئەوەی ببینم کە چۆن ئەو کەشوهەوایەم دەگۆڕی کە من تێیـدا دەژیـم. جـا کاتێکمان بۆ سەردانەکەی دیارکرد.

چوومە عەوامەی هاوڕێیەکەم (ئاوینەپەروەرە و پابەندە بە ئایینەوە.) بینـیم ئاهـەنگێکی سـازکردووە، زیـاتر لـە ئاهـەنگێکی بێئابڕوویانـە دەچێت. سەما و گۆرانی، خـانمێکیش لـەژێر باڵیـەتی! ! منـیش بـە سەرسـامی دانیشـتم. لـە بەرامبـەر کەشـی هاوڕێیـە دیندارەکـەم حەپەسام. هاوڕێیەکەم هەستی بە سەرسامی من کرد و وتی" دکتۆر چیتە؟".

منیش وتم: بەڕاستی من لە بەرامبەر ئەم بارودۆخە سەرسامم.

وتی: بۆ سەرسامی؟

وتم: ئاهەنگی سەماکردن و تۆش دینداری، ئەی چۆن سەما دەکەیت؟

وتی: مەزهەبی شافیعی ڕێگەی داوە ئەگەر سەماکە زۆر لارولەنجـەی تێدانەبێت. جووڵەیەکی سووك و جوانی تێدابێت. نەوەوی ڕەحمەتـی خوای لێبێت کە گەورەترین فیقهناسی شافعییە. لە کتێبی (ڕەوزەی

تاڵبین) لە بەرگی ١١ لە لاپەڕە ٢٢٩ دەڵێ، لە قسەکانیشی پشت بە فەرموودەیەکی خاتوو عایشە دەبەستێت کە فەرموویەتی: حەبەشییەکان لە ڕۆژی جەژن هاتن لە مزگەوت سەما و یارییان دەکرد. پێغەمبەر بانگی کردم و منیش سەرم خستە سەر شانی ئەو، سەیری یاریی ئەوانم دەکرد، تەنانەت من چاوم لێ وەردەگێڕان. ئەمەش بەڵگەی ڕێگەدانی پێغەمبەرە بە کاری ئەوان. بەڵگەی ئەم پیاوە لە ڕووی عەقڵیەوە ئەوە بوو کە سەما تەنها جووڵەی وەستان و لاربوونەوەیە. بۆیە بەپێی بەڵگەی نەقڵی و عەقڵی، شافعیەت پێی وایە سەما حەرام نییە، بەڵکو بەڕوونی ڕێگەپێدراوە. ئەوەتا تۆ دەبینی سەمای من سەنگینە، تەنها جووڵەیەکی سووك و لاربوونەوەیەکی جوانی تێدایە.

وەردی دەڵێ هیچم بەدەستەوە نەما. بەڵام ئەمجارەیان پرسیارم لەبارەی ژنەکەوە کرد، کە چووبووە ژێر باڵییەوە، بە ناز و مەکرەوە قۆڵی گرتبوو. وەك دەزانم ئەمە هاوسەری نییە.

پیاوەکە وتی: بەڵێ ئەمەش هاوسەرم نییە، بەڵکو زەواجی موتعەم لەگەڵ کردووە. لە حەڵاڵبوونی موتعەش پشتی بە بەڵگەیەك بەست کە لە سەحیحی موسلیم بەرگی دووەم لاپەڕە ١٠٢٣ هاتووە، کە فەرموودەیەکی سەحیحی بە سەنەدێکەوە لە ئەبو زوبێری دەگێڕێتەوە" وتوویەتی گوێم لە جابری کوڕی عەبدوڵلا بوو، دەیگوت بە چەپۆکێك خورما و ئارد لە سەردەمی پێغەمبەر و ئەبوبەکر موتعەمان دەکرد. تا ئەو کاتەی عومەر لەبەر ڕووداوەکەی عەمرو کوڕی حەریس نەهی لەو کارە کرد" بە سەنەدێکی دیکە لە سەحیحی موسلیم هاتووە، کە لە عەتای دەگێڕێتەوە" دەڵێ: جابری کوڕی

عەبدوڵڵا پیاوێکی پیری هێنا، ئێمەش چووینە ماڵەکەی، خەڵکەکە لەبارەی چەندین شتەوە پرسیاریان لێکرد، دواتر باسی موتعەیان کرد. وتی: بەڵێ لە سەردەمی پێغەمبەر و ئەبوبەکر و عومەر موتعەمان کردووە. بە سەنەدێکی دیکە لە ئەبونزرەوە دەڵێ: لەلای جابری کوڕی عەبدوڵڵا بووم یەکێك هات وتی: ئیبن عەباس و ئیبن زوبێر لەسەر دوو (موتعة)[1] ناکۆکن. جابر وتی: لە سەردەمی پێغەمبەر هەردووکیانمان ئەنجام داوە، بەڵام عومەر نەهی لێکرد. جا بەمەش ئەوە هاوسەری منە بە ئاشکراش کە هیچ پێچ و پەنای تێدا نییە، لەلایەن پێغەمبەرەوە ڕێگەی پێدراوە.

وەردی دەڵێ ئەم پیاوە بە ئامادەیی بۆ وەڵامدانەوە سەرسامی کردم. وتم دەبێت ئەو بەرەنگاربوونەوە سەرسەختەی ئەو بۆ دۆزینەوەی بەڵگە بۆ هەڵوێستەکانی کۆتایی پێ بهێنم. بە پرسیارێك لەبارەی ئەو مەشرووبەی دەیخواردەوە تێکم شکاند، وتم لە شێوە و بۆنی ئاشکرایە، ئایا ئەمەش حەڵاڵە؟

وەڵامی دایەوە وتی: بەڵێ حەڵاڵە، ئەمەش شەڕابە، حوکمی شەڕابیش لەلای حەنەفییەکان حەڵاڵە.

وتم: لەکوێ فەرموودەیەکت لەبارەی حەڵاڵبوونی مەشرووبەوە هێناوە؟

وەڵامی دایەوە: سەرچاوەی من بۆ تۆ (الجامع لأحكام القرآن)ی قورتبییە، بەرگی سێیەم، لاپەڕە پەنجا هاتووە" لە ئەحەوەسەوە لە ئیسحاقەوە، لە عومەری کوڕی مەیمونەوە دەڵێ: عومەر فەرموویەتی

[1] مەبەست لەو دوو موتعەیە کە بە موتعەی زەواج و موتعەی حەج ناسراون – وەرگێڕ

ئێمە ئەو شەڕابە خەستە دەخۆینەوە بۆ ئەوەی نەهێڵێ گۆشتی وشتر لە سکمان ئازارمان بدات. هەروەها ئەبوحەنیفە و ئیبن ئەبولەیلا، ئیبن شبرمە و کۆمەڵێك لە فیقهناسان دەڵێن: ئەگەر یەکێك سەرخۆش بوو، بێئەوەی بەئەنقەست بگاتە ئاستی مەستی، ئەوا حەدی بۆ نییە".

هەروەها لە (سونەنی ئەبوداود) هاتووە لە بەرگی دووەم لاپەڕە ٣٠٥" لە هومامی کوڕی حارسەوە کە وتوویەتی: عومەر شەڕابی مێوژی هێنا، لێی خواردەوە. لە ئیبن عەونەوە وتوویەتی: عومەر خەڵکێکی لە سەقیف هێنا، خواردنیان ئامادەکرد. فەرمووی: بەر لە گۆشتەکە سەرید بخۆن، ئەوا شوێنی ترشی پڕ دەکاتەوە. ئەگەر شەڕابەکەتان خەست بوو ئەوا بە ئاوی ڕوونی بکەنەوە. مەیدەن بە ئەعڕابیەکان". بەمە بێت کێشە لە خواردنەوەی شەڕاب نییە، کە بەبەرچاوتەوە دەیبینی، ڕێگەی پێدراوە!

منیش وتم: کەواتە تۆ تەنها مەزهەبێك پەیڕەو ناکەیت؟

وتی: من سەر بە تێکەڵە مەزهەبم (مەزهەبی تەلفیقی). هەڵدەستم بە تێکەڵکردنی حوکمی مەزهەبەکان، کامیان بۆ من گونجاو بێت ئەویان وەردەگرم، هەموو حوکمەکان لە کتێب و سوننەت هاتووە. ئەگەر گوناهێك هەبێت، ئەوا بەرپرسیارێتی لە ئەستۆی فیقهناسەکانە نەوەك من.

## گاڵتەوگەپی مەجلیس

لێرەدا سێ بەسەرهاتی وەردی دەگێڕمەوە، زیاتر بۆ پەند وەرگرتنە سەرەڕای گاڵتەوگەپ. یەکەمیان یادێکی جوانە کە وەردی مەزن لە دڵی ئێمەی جێهێشتووە. دووەمیان هیوایەکی وەردی بوو کە لە چینی

ڕۆشنبیری دەخواست لەو کاتەی کە عێراق بە تەنگژەی سیاسی تێپەڕ دەبوو. سێیەمیان خوازیار بوو ئەو کەسەی وەك مرۆڤ لە نزیك ئەو دەژیت هێمن و بێلایەن بێت، زێدەڕۆیی لە بابەتەکان نەکات، چونکە ڕۆژێك دێ ئاشکرا دەبێت.

## وەردی و عەباکەی باوکم

دکتۆر عەلی وەردی بە سروشتی خۆی سەرمابردوو بوو. بەرگەی سەرمای نەدەگرت و لە سەرمای سڵ دەکردەوە. بە شنەبایەکی فێنك لە گەرمای هاوین سەرمای دەبوو، ئەمە جگە لە سەرماوسۆڵەی زستان. ئەو بارودۆخەی ئەو خەمباری کردم و پرسیارم لە هۆکارەکە کرد. بەتایبەتی ئەو لە ژینگەیەك دەژی لە زستانان پلەی گەرما لە دە دانابەزێ و لە هاوینیش دەگاتە پەنجا. لە وەڵامدا وتی هۆکارەکەی دایکی خوالێخۆشبوومە. لە ترسی سەرمابوون لە زستانان جلی قورسی بە من دەپۆشی و لە هاوینیش دایدەپۆشتم. ئەو لە کوڕە تاقانەکەی ترساوە کە بەتەنیا لە دوای منداڵەکان ماوەتەوە، بۆیە ئێسقانی لە گەرمی هەمیشەیی ڕاهاتووە.

هەر لەبەر ئەم هۆکارە لە مەجلیس لەگەڵ وەردی کێشەمان لە هاوین زیاتر بوو نەوەك لە زستان. لە هاوین پلەی گەرمای عێراق دەگاتە پەنجا. سەرەڕای ئەم گەرمایە نەماندەتوانی فێنککەرەوە و موبەڕیدە، تەنانەت هەندێك جار پانکەش پێبکەین، چونکە وەردی سەرمای دەبوو. کەچی کەسانی دیکە لە ئامادەبووان لە گەرما دەتوانەوە.

لەپێناو دۆزینەوەی چارەیەکی مامناوەندی بۆ ئەم کێشەیەی گەشتی هاوینە و زستانەی نێوان وەردی و خەڵك و خەڵك و وەردی، ڕۆژێك بیرم کەوتەوە باوکم عەبا زستانییەکەی لە عێراق بەجێهێشتووە و بۆ

ئیمارات سەفەری کردووە. بڕیارم دا بە وەردی تاقی بکەمەوە تا کەمێك گەرم بێتەوە و ئێمەش کەمێك هەوای فێنککەرەوەمان بەرکەوێت. عەباکەم هێنایە لای وەردی، وتم دکتۆر ئەمە لەسەر شانت دابنێ، هێنا و بردی و هەڵگێڕ و وەرگێڕی کرد و وتی بەڵێ عەبای شێخ چارەیە. جا هەرکە دەچووینە مەجلیسەوە و فێنککەرەوەکان کاریان دەکرد، بە تیلەی چاو سەیری دەکردم، منیش بەپەلە عەبای شێخم بۆ دەهێنا و دامدەپۆشت. ئەو هێور بۆوە، ئێمەش ئاسوودە بووین. لە وێنەکانی ئەم کتێبە دەبینن من وەردی بە عەبای شێخ دادەپۆشم.

## فدعە و حوسێن

یەکێك لە ئازیزان، بەڕێوەبەری مەجلیسێکی بەغدایی دێرین بوو، هەمیشە داوای لە من دەکرد، وەردی لەگەڵ خۆم بەرمە مەجلیسەکەیان. زیاتر لە جارێك ئەم داوایەم بە وەردی گەیاند. بەلام دوای دەخست بە بیانووی دووری مەوداکە و ناچاربوونی تا کۆتایی مەجلیسەکە بمێنێتەوە. شەوێکیان وەردی پەیوەندی بە من کرد، وتی ئەمشەو دیدارێکت هەیە؟ وتم بەڵێ دەمەوێ بچمە فلانە مەجلیس، ئەمە ئەو مەجلیسەیە بانگهێشتت دەکەن و بەپیر داواکەیان ناچی. وتی: چییان هەیە، بابەتەکە گرنگ و سەرنجڕاکێشە. وتم نازانم بابەتەکە چییە، ڕۆیشتنەکەم تەنها وەك ئەرکێکە، جا بابەتەکە هەرچییەك بێت، باش دەبێت. ئەو مەجلیسە بەوە ناسرابوو کۆڕگێڕەکانی بە دیقەتەوە هەڵدەبژارد. وەردی وتی: وەرە دوام بەیەکەوە دەچینە مەجلیسەکە.

ڕۆیشتین، خۆزگە نەدەڕۆیشتین. کۆڕەکە بۆ شاعیرێکی میللی گەورە

بوو. لە کۆڕەکەی باسی شیعری فدعەی کچی سوێحی دەکرد کە لە ڕۆژگاری شێخ حەمد حەموود لە بادیەی سەماوە ژیاوە، ئەمە نزیکەی ساڵی ١٧٥٠ زایینی بووە، حوسێنی برای ئەو ژنە کوژراوە، ئەویش لاوانەوەیەکی خەمباری بۆ کردووە. ئەم شیعرە بەلای ئەو کەسانەی شیعری میللی دەخوێننەوە، بەناوبانگە. لە بەناوبانگترین دێڕەکانی:

**اخوي الثلاثة مرافجاته		الكرم و المراجل و الصماتة**

**اخوي حسين جاراته خواته		اخويه العبد و الضيف اغاته**

شاعیرە شەعبییەکە قەسیدەکانی بە زاری عێراقی دەخوێندەوە کە زیاتر لە دووسەد ساڵ دەبێت گوتراوە. دواتر بۆ ئامادەبووان واتای دێڕە جوان و ناسك و بەسۆزەکانی فدعەی ژنە شاعیر لێك دەدایەوە. بەخوا من لەگەڵ کۆڕەکە گونجا بووم، ئەمەش لەبەر خۆشەویستی و پەرۆشیم بوو بۆ شیعری میللی عێراقی، کە نموونەی لە جیهان دەگمەنە لەبەر ئەو وێنانەی کە لەخۆیەوە دەگرێت.

لەناکاو هەستم کرد، دەستێك بەهێزەوە نوقرچکە لە قاچم دەدات. بەڵێ وەردی بوو. بە دەنگێکی بەرز وتی محەمەد کاتی منت بە شتێکی نەشیاو بەفیڕۆ دا. وتم بەڵێ دکتۆر، دەزانم حەزت لە شیعر نییە. بەڵام با کۆڕەکە تەواو بێت خوا یار بێت دەڕۆین.

جارێکی دیکە دووبارەی کردەوە و بە دەنگێکی بیستراو وتی: ئێمە لە چ بارودۆخێکین، ئابلۆقە و جەنگ. ئەوانەش قسە لەسەر ژنە شاعیرێك دەکەن ٣٠٠ ساڵە مردووە. مەبەستی ئەوە بوو ئێمە لە سەردەمی ئابلۆقەی ئەمریکا بووین کە بەسەر عێراقی سەپاندبوو. هەڕەشەی جەنگی دیکە هەبوو، کەچی ئەوانە قسە لەسەر شاعیرێکی مردوو دەکەن. بەڕاستی هەڵوێستەکە لەگەڵ خاوەنی مەجلیسەکە جێگەی شەرمەزاری بوو. وتم دکتۆر ئەگەر فەرمانی گەڕانەوە بۆماڵەوە

دەکەیت من ئامادەم.

وتی: شیاو نییە. هاتووینەتە مەجلیسەکە، ناکرێت بەر لە تەواوبوونی کۆڕەکە بچینە دەرەوە.

وتم: دکتۆر هاوڕاتم.

وتی: هیوام دەخواست ئەم کۆمەڵە ڕۆشنبیرە کۆببوونەوە بۆ ئەوەی تاوتوێی بارودۆخی کۆمەڵگا بکەن لە دوای ئەو داڕووخانەی لە ئەنجامی جەنگی دووەمی کەنداو تووشی بووە.

وتم: دکتۆر تۆ لەسەر هەقی، بەڵام ئێمەش لە مەجلیسی خاقانی دەرفەتێکی ڕۆشنبیری بە ئەدەب و شیعر دەدەین.

وتی: بەڵێ، ئاگادارم دەکەنەوە، ئامادە نابم و ئاسوودەم. بەڵام ئەگەر ناچاری ئامادەبوون بم ئەوا کێشەیە.

ئەم دەمەتەقێیە پچڕ پچڕەی نێوان من و وەردی بەردەوام بوو، تا کۆڕەکە کۆتایی هات. منیش ڕووخسەتم لە ئامادەبووان خواست لەوەی ناتوانین لە کاتی مشتومڕەکانی دوای کۆڕەکە ئامادەبین، ئەمەش بەهۆی بارودۆخی تەندروستی وەردی. هەرچەندە نەخۆشە بەڵام وەك ڕێزێك بۆ مەجلیسەکە ئامادەبووە. سوپاس بۆ خوا وەردی پاڵپشتی ئەو قسانەی کرد. بەمەش کۆڕەکە کۆتایی هات کە لەگەڵ وەردی تێیدا ئامادە بووم وەك سزایەك وابوو، گەڕاینەوە.

## مەعروف چەلەبی و هاوڕێیەکی خۆهەڵکێش

مامۆستا مەعروف چەلەبی چەندین بەهرە و شارەزایی تایبەتی هەیە لە پاراسایکۆلۆژی و توێژینەوەی دەروونی، ئەمە جیا لە خوێندنەکەی کە لە بواری پیشەسازی سەربازییە. چەلەبی لە مەجلیسی خاقانی کۆڕێکی نایابی پێشکەش کرد بەناوی ڕەهەندی شەشەم. لە

کۆڕەکەیدا بۆ دەرووونی مرۆیی ڕەهەندی شەشەمی دیارکرد. ئەمە جیا لە سێ ڕەهەندە بینراو و نەبینراوەکە، ئەو ڕەهەندی پێنجەم و شەشەمیشی ئاشکرا کردووە. لەگەڵ هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی ئەم تیۆرە شەشەمینە لەسەر هەموو شێوە و شتەکان.

کۆڕێکی بەپێز بوو، بەڵام لە ڕووی پراکتیزەکردنەوە، لە ڕووی عەقڵییەوە باوەڕپێکراو نەبوو. هێشتا کێشەی ڕەهەندی سێیەم (قووڵایی) کێشەیەکە هەیە. ئەی چۆن کەسێك بۆ ئێمە ڕاستەوخۆ بەدوای ڕەهەندی شەشەم دەگەڕێت. کەچی وەردی زۆر چێژی لە کۆڕەکە وەرگرت و سەرسام بوو بە شێوازی پێشکەشکردنی کۆڕەکە. بەتایبەتی چەلەبیش یەکە یەکەی ئامادەبووانی لە مشتومڕەکانی بەشدار دەکرد.

دوای تەواوبوونی کۆڕەکە و ڕۆیشتنی زۆربەی ئامادەبووان. وەردی مامۆستا چەلەبی خستە ژێر چەندین تاقیکردنەوە، بۆ ئەوەی بزانێ توانا تایبەتەکەی لە بواری پاراسایکۆلۆژی چییە. بە هەندێك لە تواناکانی ڕازی بوو، بەڵام قەناعەتی بە هەندێکی دیکە نەهات. چەلەبی پێی ڕاگەیاند ئەو دەست و چاو دەخوێنێتەوە، دەتوانێ کەسێك لە ڕێگای ئیمزاکەی بناسێت. هەر لە میانەی ئیمزاشەوە دەتوانێ توانای خودی و سێکسی کەسێك جیا بکاتەوە. وەردی بە دوایین برگەی قسەکانی چەلەبی سەرسام بوو، بە شێوازەکەی خۆی بە عەرەبی وتی"ئەیابە". ئەمەش مانای ئەوە بوو وەردی لە زەینی خۆی شتێکی هەیە و نایەوێ ئێستا ئاشکرای بکات.

وەردی یەکێکی هەڵبژارد کە هاوڕێ و موریدی بوو. داوای لێکرد کاغەزێك ئیمزا بکات و بە چەلەبی بدات. دواتر بیری کەوتەوە و وتی

ئێوەش کاغەز ئیمزا بکەن بۆ ئەوەی توانای خودی و سێکسی ئێوە بخوێنێتەوە ! دانیشتنەکە تایبەت بوو بەو کەسانەی کۆڵەگەی مەجلیسەکە بوون. هەموو ئامادەبووان دوای کۆڕەکە ڕۆیشتبوون. چەلەبی دەستیکرد بە خوێندنەوەی ئیمزاکان و هەموویان لە ڕووی سێکسییەوە ئاسایی بوون. هیچ یەکێك لاواز نەبوو، یان توانای سێکسی لەڕادەبەدەر بێت. لێرەدا وەردی بە چەلەبی وت: ئایا دیقەتت لە ئیمزای فلان نەکردووە. بۆچوونێکی وردم لەبارەی توانای سێکسی ئەو پێ بڵێ!

چەلەبی وتی: ئەو هیچ تایبەتمەندییەکی نییە. تەنانەت لەوانەیە توانای لەوانی دیکەش کەمتر بێت!

وەردی وتی: ئەو بۆ من باس لە کردە سێکسییەکانی دەکات، کە لەوانەیە ڕۆژانە ١٣ جار تێپەڕ بکات. بەڕاستی سەرسامی کردم، تۆش دەڵێی لەوانەیە توانای کەمتر بێ.

چەلەبی وتی: لە ئیمزاکەی وا دەردەکەوێت کە وتم. خوا لە هەموومان زاناترە.

دەموچاوی ئەو هاوڕێیەمان لە تووڕەیی و شەرمان سوور هەڵگەڕابوو. ئاگای لە خۆی نەمابوو. زوو خۆی بیرکەوتەوە و بە وەردی وت: من وتم ڕۆژانێك وا بووم، نەمگوتووە ئێستا وەهام.

وەردی وتی: بەڵێ ئێستا زانیم. دوێنێ قسەت لەسەر کردنی ١٣ دەکرد، هێشتا ڕۆژێکی تەواو بەسەر تاقیکردنەوەکەت تێنەپەڕیوە. نکۆڵی لێ مەکە. دەبووایە ئەم هاوڕێیە خۆهەڵکێشەم لە بەرامبەر هێرشی وەردی دەرباز بکەم. بە نوکتەیەك خۆم هەڵقورتاندە نێو بابەتەکەوە، بۆ ئەوەی بابەتەکە بگۆڕم. وتم ژمارە ١٣ لەلای

ڕۆژئاواییەکان شوومە. ئەوەتا ئەمەش سەلمێنرا لە ڕێگای نەگبەتی ئەم هاوڕێیەمەوە. پرسیارم لە وەردی کرد دکتۆر تۆ بڕوات بە نەگبەتی ژمارەکان هەیە؟

گفتوگۆکە کەوتە سەر نەگبەتی ژمارەکان. بابەتی هاوڕێیە خۆهەڵکێشەکەمان تێپەڕاند. کەچی وەردی تا ماوەیەکی زۆر مکوڕ بوو بە هاوڕێیەکەمان بڵێت (ئەبو ١٣).

ڕۆژێکیان لە وەردیم پرسی، بۆچی بەم شێوازە فشار دەخاتە یەکێك لە خۆشەویستان و موریدەکانی، هەردەم و لە هەموو شوێنێك پێی دەڵێ (١٣). وتی پیاوەکە خۆهەڵکێشە، قسە لەسەر ئەو کردە سێکسییانەی خۆی ناکات، تەنها ئەگەر کێشەیەکی سێکسی دیارکراوی نەبێت. ئەگینا ئەم بابەتانە لە نێوان مرۆڤ و خوداکەی بە نهێنیی دەمێنێتەوە. بۆچی خۆی هەڵدەکێشێ و ژمارەی گەردوونی دەڵێ کە لەگەڵ تەمەنی یەکناگرێتەوە. دەبوو فێری بکەم. تکام وایە دوای کۆڕەکەی چەلەبی و ڕۆژگارەکانی دواتر شتێك فێربووبێ.

ئەم سێ گاڵتەوگەپە، بەشێکە لە سەدان کە وەردی لە مەجلیسەکەی ئەنجامی داوە بۆ ئەوەی کەشێکی خۆش بە مەجلیسەکە بدات. ئەمەی هەڵدەقۆستەوە بۆ گەیاندنی بیرۆکە زانستییەکانی، ئەمەش شێوازێك بوو وەردی دایهێنابوو. کەچی هەندێك لەوانەی کە لەبارەی وەردییەوە دەینووسن، وا لەو بەسەرهاتانە گەیشتوون کە تەنها گاڵتەوگەپ و نوکتە بێت!



# بەشی سێیەم

**کتێبەکانی وەردی، ئەو زانایانەی کاریگەرییان بەسەر وەردی هەبوو، میتۆدی توێژینەوەکانی، کاریگەرییە هزریەکەی، دوایین مشتومڕەکانی وەردی.**

## هزری وەردی لە میانەی کتێبەکانی:

لێکۆڵینەوەیەك لە کەسێتیی تاکی عێراقی ١٩٥١

کارە ناناساکانی نەست، یان نهێنیی کەسێتی سەرکەوتوو ١٩٥٢

واعیزەکانی سوڵتان ١٩٥٤

گاڵتەجاڕیی عەقڵی مرۆڤ ١٩٥٥

ئەفسانەی ئەدەبی باڵا ١٩٥٧

خەونەکان لەنێوان بیروباوەڕ و زانستدا ١٩٥٩

لۆژیکی ئیبن خەلدون ١٩٦٢

لێکۆڵینەوەیەك لە سروشتی کۆمەڵگای عێراقی ١٩٦٥

چاوپێداخشانێکی کۆمەڵایەتییانە بە مێژووی نوێی عێراق لە ٦ بەرگ لە نێوان ١٩٦٩ – ١٩٧٩

**بەر لە پسپۆڕی کاریگەر بوو بەم کەسانە:**

هەبەتودینی شەهرستانی

مستەفا جەواد

مەلیك فەیسەڵی یەکەم

سەلامە موسا

**لە ڕووی هزرییەوە کاریگەر بوو بەو کەسانە:**

ئیبن خەلدون

ولیام سیمنەر

تۆینبی

دیل کارنگی

**لە توێژینەوەی سیاسی و کۆمەلایەتی کاریگەر بوو بەو کەسانە:**

ستیوارت میل

میکیاڤیللی

**کاریگەر بوو بە میتۆدی توێژینەوەی ئەم کەسانە:**

تالکۆت بارسۆنز

ئەمیل دۆرکهایم

کارڵ مانهایم

**ڕەخنەی لە هزری ئەو کەسانە گرت:**

کارڵ مارکس

**بە وەردی کاریگەر بوون:**

شێخ مورتەزای موتەهەری

دکتۆر عەلی شەریعەتی

**لە مەجلیسی خاقانی مشتومڕیان لەگەڵ کرد:**

عەبدولڕەزاق حەسەنی

حوسێن عەلی مەحفووز

شێخ عیسای خاقانی

شێخ عەلی تەهرانی

عەبدوڵلا فازڵ وەزیری هەرە پێشووی ئەوقاف لە عێراق
هەندێك لەو سەرچاوە بیانییانەی پشتیان بە تیۆرەکانی وەردی بەستووە

## هزری وەردی

ئەوەی لەم پێشەکییە کورتە، باسی دەکەم، بەڵگە نییە بۆ شارەزاییەکی تەواو لە هزری دکتۆر عەلی وەردی. بەڵکو هەوڵێکە بۆ کۆکردنەوەی هەندێك بیرکردنەوە سەرەکییەکانی وەردی ئەگەر ئەم گوزارشتەمان دروست بێت، بۆئەوەی خوێنەر لە میانەی کتێبەکانی وەردییەوە، کورتیەکی پوختی لەبارەی وەردیەوە هەبێت. شتێك کە زۆر هانی دام بۆ نووسینی ئەم کورتەیە ئەوەبوو، یەکێك لە هاوڕێیان کتێبێکی لەبارەی وەردییەوە نووسیوە، لە کاتێکدا هیچ یەکێك لە کتێبەکانی وەردی نەخوێندۆتەوە. لەوانەیە تەنها بە هۆکاری هاوڕێیەتی کتێبەکەی منی خوێندۆتەوە، ئەو پوختانەی بینیوە و سوودی لێ وەرگرتووە. تکا لە خوێنەری پسپۆڕ دەکەم لێم ببوورێ ئەگەر هاتوو ئەم پوختەیە تێروتەسەل نەبێت. چونکە من هەوڵم داوە بیرۆکەکە دوور لە نموونە مێژووییەکان باس بکەم، پوختەیەك بێت بێ وردەکارییەکان. هەر بۆیەش بە ناوەکەی ڕا دیارە کە تەنها پوختەیەکن، جا نابێت خوێنەر پێشبینی ئەوە بکات تەواو کتێبەکانی لەبەردەستی دابنرێت.

وەردی دوو کتێبی گرنگی لەبارەی مێژووی کۆمەڵایەتی عێراق نووسیوە. یەکەمیان (لێکۆڵینەوەیەك لە سروشتی کۆمەڵگای عێراقی) و دووەمیان (چاوپێداخشانێکی کۆمەڵایەتییانە بە مێژووی نوێی

عێراق) لە شەش بەرگدا. ئەمە جگە لە نامیلکەیەك کە یەکەم بڵاوکراوەی ئەو بوو لە ساڵی ١٩٥١ دا، بە ناونیشانی (لێکۆڵینەوە لە کەسێتیی تاکی عێراقی). سەرەڕای ئەمانە وەردی دوو کتێبی سەرنجڕاکێشی لەبارەی کۆمەڵگا نووسیوە: (واعیزەکانی سوڵتان) و (گاڵتەجاڕیی عەقڵی مرۆڤ). تێڕوانینەکانی خۆشی لەبارەی ئەدەب و شیعر و پەخشان و زمان لە کتێبە نەمرەکەی نووسیوە بەناوی (ئەفسانەی ئەدەبی باڵا) کە گوزارشتێك بوو لەو مشتومڕانەی لەنێوان وەردی و دکتۆر عەبدولڕەزاق محێدین. وەردی لەبارەی پاراسایکۆلۆژی و خەونی نووسیوە، بەمەش یەکەم عەرەب دەبێت لەسەر ئەم دوو بابەتە دەنووسێ لە هەردوو کتێبەکەی (کارە نائاساکانی نەست و خەونەکان لەنێوان بیروباوەڕ و زانستدا). هەروەها دەبینین وەردی چی لە لۆژیکی ئیبن خەلدون بردووە، چ تێبینی لەسەر ئەم لۆژیکە هەیە، ئەمەش لە میانەی کورتەیەك دەردەکەوێت لە کتێبەکەیدا بەناوی (لۆژیکی ئیبن خەلدون).

ڕۆژێکیان شێوازی بەدواداچوونی هزری وەردیم بینی، کە لەگەڵ یەکێك لە دروستکەری ڕووداوێکی مێژووی عێراقی هاوچەرخ ئەنجامی دا. ئەمیش خوالێخۆشبوو حاجی عەبوود جەواهیری بوو" لە بنەماڵەی جەواهیری بوو لە کازمیە: نەوەی حاجی محەمەدی کازم جەواهیری بوو کە لە ساڵی ١٨٠٥ لە کازمیە نیشتەجێن. خانەوادەی عەبوود جەواهیری شمشێرساز و بنەمای زێڕینگەر عەبد نەبی جەواهیری و ڕەزا جەواهیری بوو؛ ئەمانە خێزانێکی ناسراو بوون لە کازمیە". حاجی عەبوود لەو ئاژاوەیە بەشدار بوو کە لە نێوان خەڵکی نەجەف و کازمیە لە کەربەلا ڕوویدابوو. وەردی بەوە دڵخۆش بوو کەسێك

دەبینی لە ئاژاوەکە بەشدار بووە. زیاتر لەوەش ئەوەی دڵخۆشی کرد ئەوەبوو حاجی عەبوود جەواهیری تەواو هەڕەمەکی قسەی لەسەر بابەتەکە دەکرد. وەردی داوای لێکرد بەسەرهاتەکە دووبارە بکاتەوە، دواتر کاغەز و قەڵەمێکی هێنا هەموو وردەکارییەکانی نووسیەوە. داوای لە هەمووان کرد بێدەنگ بن و قسەکانی پێ نەبڕن. دواتر پرسیاری لەو شتانە دەکرد کە لە بەسەرهاتەکەدا بەلایەوە ناڕۆشن بوو. سەیر ئەوە بوو وەردی لە گێڕانەوەکە و زنجیرەی ڕووداوەکان ناڕەزایی دەرنەبڕی بۆئەوەی دەرفەتێك بە خاوەن بەسەرهاتەکە نەدا لە قسەکانی پاشگەزبێتەوە. بەڵکو وازی لێهێنا لەسەرخۆ بەسەرهاتەکە بگێڕێتەوە و کاتێکیش تەواو بوو، حاجی عەبوودی دایە بەر ڕێژنەی پرسیاران، حاجی عەبدویش وەڵامی دەدایەوە بۆ ئەوەی هەڵوێستەکە لەبەردەم وەردی ڕوون بێت.

جەمال حەمدان یەکەم میسری بوو کەسێتیی تاکی میسری بخاتە چوارچێوەی ڕەخنە و شرۆڤەکردنەوە. وەردی دوو ساڵ بەر لە حەمدان لێکۆڵینەوەی لەبارەی کەسێتیی تاکی عێراقی کردبوو. (جەمال حەمدان ١٩٢٨ – ١٩٩٣ ، یەکێك لە زانا جوگرافیناسەکانی میسرە، چەندین کتێبی هەیە، بەناوبانگترینیان: ئینسکلۆپیدیای تاکی میسر: توێژینەوە لەبارەی بلیمەتی شوێن. لە چوار بەرگدا). جەمال حەمدان جەخت لەسەر لایەنە پۆزەتیڤەکانی کەسێتیی میسری دەکاتەوە، بە بلیمەتی شوێن وەسفی دەکات، کەچی وەردی جەخت لەسەر لایەنە نێگەتیڤەکانی کەسێتیی عێراقی دەکاتەوە، تاوتوێی خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی دەکات. لە میانەی توێژینەوەیەکی زانستی و میتۆدی دەگاتە ئەو ئەنجامەی کەسێتیی عێراقی دووفاقییە

لە پێوەر و بەهاکان. ئاماژەش بۆ نەخۆشییەکانی کۆمەڵگا دەکات لە میانەی پاشماوەی داب و نەریت و کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکان. دواجار جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کۆمەڵگاکە پێویستی بە چارەسەرکردنە.

لەم بەشەدا لە میانەی ئەو کەسایەتی و زانایانەی پێیان کاریگەر بووە، پێکهاتەی هزری وەردی دەبینین. بەتایبەت کاریگەری زانایانی گەورەی کۆمەڵناسی لە جیهاندا، ئەوانەی وەردی تیۆرەکانیانی لەسەر کۆمەڵگای عێراقی پراکتیزە کردووە. لە دانەپاڵی هەر تیۆرێك بۆ خاوەنەکانیان ڕاستگۆ بووە. کاتێك تیۆری خۆی داناوە وتی ئەمە گریمانەیەکە شیاوی ڕەتکردنەوە و قسە لەسەرکردنە. دواتریش وازی لە نێوەندی ڕۆشنبیری و پسپۆڕانی کۆمەڵناسی هێنا تا جیاوازی خۆیان لەسەر تیۆرەکە دەربڕن، هەندێك بە گریمانەیان دانا، هەندێك بە بژاردەیەکیان دانا، هەندێك بەڕاستیان زانی و هەندێکیش بەدرۆی خستەوە.

لە کۆمەڵناسیدا وەردی بە هزری ڕۆژئاوا کاریگەر بوو. ئەو توێژینەوەی میتۆدی لە ڕێبازی ویلایەتە یەکگرتووەکان وەرگرتبوو. کە ئەمیش لە ڕووی مێژووییەوە لە لووتکەدا بوو. وەردی میتۆدێکی ئەکادیمی تایبەت بە خۆی داهێنا، کە لە هاوزاکانی خۆی جیای دەکردەوە. ئەمەش وایکرد ببێتە قیبلەیەك بۆ قوتابیانی سەرجەم بەش و کۆلیژ و زانکۆکانی عێراق. جیا لەمەش سەپاندنی بابەتی مێژووی کۆمەڵایەتی وەك ماددەیەکی خوێندن لە چوارچێوەی سەرجەم پسپۆڕییەکانی زانکۆ. چەندین ئاسۆی نوێی لەبەردەم وەردی کردەوە بۆ ئەوەی میتۆدێکی تایبەت بە خۆی دابڕێژێت.

توێژەر دەتوانێ کاریگەری هەندێك بیرمەند و فەیلەسووفی ڕۆژئاوایی بەسەر بۆچوونەکانی وەردییەوە ببینی (جیا لە ئیبن خەلدون، کە ڕۆژهەلاتییە). هەروەها هەر توێژەرێ لە فیکری وەردی درك بەوە دەکات، کە چەندین میتۆد و میکانیزمی توێژینەوەی و شرۆڤەکردنی دیاردەکان، سەرچاوەی توێژینەوە زانستیەکانی لە شێوازی میتۆدەکانی توێژینەوەی ڕۆژئاوای وەرگرتووە، چونکە زانستیشی لەوێ وەرگرتووە. هەروەها ڕەخنەی لە هەندێك بیرمەندان گرتووە و دواتر بۆچوونەکانی لەبارەی ئەوان چاککردۆتەوە. هەروەها بۆ پاڵپشتیکردنی بیرۆکەکانی زۆر سوودی لە بیروڕای بیرمەندانی ڕۆژئاوایی وەرگرتووە. بێگومان هەر سەرچاوەیەك وەردی پشتی پێ بەستووە وەك بیرۆکەیەك کە وەری گرتووە، یان میتۆدێك پەیڕەوی کردووە، ئەو وەك توێژەرێکی زانستی بە سەرچاوەی زانستی پشتگیری بۆچوونەکانی دەکات. لە میانەی ئەم نمایشەوە دەتوانین جووڵانەوەی زانستی وەردی بۆ سەر سێ ئاڕاستەی سەرەکی دابەش بکەین:

ئاڕاستەی یەکەم: ئەو بیرمەندانەی کە لە ڕووی هزرییەوە کاریگەریان لەسەر وەردی هەبووە.

ئاڕاستەی دووەم: ئەو بیرمەندانەی کە وەردی کاریگەر بووە بە میتۆدی لێکۆڵینەوەیان.

ئاڕاستەی سێیەم: ئەو بیرمەندانەی ڕەخنەی لە هزری ئەوان گرتووە. یان باوەڕی خۆی بە هزری ئەوان گۆڕیوە.

لەبارەی ئەوانەی بە دکتۆر عەلی وەردی کاریگەر بوون، بەتایبەتی لە کۆمەڵگای ئیسلامی، من دوو بیرمەندم هەڵبژاردووە. کە هەردووکیان

ڕۆڵیان لە جووڵاندنی کۆمەڵگاکەی خۆیان هەبووە کە ئێرانە، ئەوانیش شێخ مورتەزای موتەهەری و دکتۆر عەلی شەریعەتییە. دواتر باسی هەندێك لەو مشتومڕانە دەکەم کە بە ئامادەبوونی من لە نێوان وەردی و هەندێك بیرمەند ڕوویداوە، جا لە مەجلیسی خاقانی یان لە مەجلیسێکی تایبەت بە بارودۆخی سیاسی ئەوکاتی عێراق بووبێت.

گرنگترین خاڵ کە ئەم بەشە جیا دەکاتەوە، ئەو توێژینەوە زانستییەیە کە ئاسۆیەك لەبەردەم ئەو کەسانە دەکاتەوە کە لە قۆناغەکانی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی دەیانەوێ تاوتوێی هزری وەردی بکەن. ئەمەش وا دەکات سەرچاوەی توێژینەوەیان بۆ فەراهەم بکات و باری قورسی توێژینەوەی دوورودرێژیان سووك بکات. سەرەڕای ئەمەش توێژەر دەبینی بە بێلایەنی هەق بە هەر زانایەکی ڕۆژئاوایی دراوە کە بەشێك بووە لە پێکهاتەی هزری وەردی لە ڕووی مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە.

## کەسێتیی تاکی عێراقی ١٩٥١

**توێژینەوەیەك لە سایکۆلۆژی تاکی عێراقی لەژێر ڕۆشنایی کۆمەڵناسیی نوێ** لە کاتی نووسینی یەکەم توێژینەوە و چاپکردنی، وەردی وای نیشاندا: زیاتر لە وتارێکی ئەدەبی دەچێ نەوەك توێژینەوەیەکی زانستی. وتی پاساوم ئەوەیە: موحازەرەیەکە بۆ ئەوە نووسراوە لە کۆڕێکی گشتیدا بخوێنرێتەوە. لە سەرەتادا ئامانج چاپکردن و بڵاوکردنەوەی نەبوو بۆ خوێنەران کە بەم شێوەیە هەیە. ئەو نامیلکەیە بە شێوەی چەند بەشێك یان ئەڵقەیەکی یەك لەدوای یەك نووسراوە کە یەکتر تەواو دەکەن. ئەمەش بەگوێرەی خواستی ڕیزبەندی لۆژیکییە. لەوانەیە خوێنەر لە دووتوێی چەندین بیرۆکەدا ون

بێت، کە سیستەمێکی یەکگرتوو کۆیان ناکاتەوە.

بەهەرحاڵ، خوێنەری دوای تەواوکردنی ئەم موحازەرەیە بۆی روون دەبێتەوە کە بەسەر دوو بەشی سەرەکی دابەش دەبێت. بەشی یەکەم مەبەستم توێژینەوەیە لە کەسێتی بە شێوەیەکی گشتی. کەچی بەشی دووەم تایبەت کراوە بە توێژینەوە لە کەسێتیی تاکی عێراقی. بۆیە خوێنەر دەبینی بەشی یەکەم درێژە و خاڵی نییە لە دەرچوون لە بابەتەکە. ئەمەش مەسەلەیەکە پۆزشی بۆ ناهێنمەوە لەوانەیە بەئەنقەست و مکوڕ بوون وام کردبێت. من پێم وابوو ناتوانم توێژینەوە بۆ کەسێتیی تاکی عێراقی بکەم، ئەگەر بە شێوەیەکی وردتر تاوتوێی کەسێتیی مرۆیی نەکەم. سەرەڕای ئەمەش: بابەتی کەسێتی بە شێوەیەکی گشتی لە زمانی عەرەبیدا توێژینەوەیەکی تێروتەسەلی بۆ نەکراوە. زۆرینەی ئەوانەی توێژینەوەیان لەم بوارە کردووە، یان وەرگێڕانیان کردووە، پسپۆڕییان دەروونناسی بووە. ئەمەش مانای ئەوەیە کەسایەتی تەنها لە ڕووی تاکەکەسییەوە توێژینەوەی بۆ کراوە، بایەخی بە لایەنی کۆمەڵایەتی نەدراوە، کەمێك نەبێت.

بۆ ئێمە ئاسان نییە، کەسێتی دەستنیشان بکەین، یان پێناسەیەکی تێروتەسەلی بۆ بکەین، چونکە کەسێتی وەك کارەبا و ماددەی ئەسیر و موگناتیسە. تەنها بە شوێنەوارەکانی دەناسرێت. شرۆڤەکردنی کەسێتی قورسە تەنها لە ڕێگای ڕەگەزە سەرەتاییەکانی نەبێت. ئەگەر هاتوو ڕەگەزەکانی شی بکرێتەوە و لەیەکتر جیا بکرێتەوە، ئەوا پەیوەندی ئۆرگانییان لەدەست دەدەن و بەهای گشتیان نامێنێ. کەواتە من وەك ئاوێتەیەکی کیمیاییم، کە خەسڵەتە تایبەتەکانی

جیاوازە لە خەسڵەتی ئەو ڕەگەزانەی لێی پێکهاتووە. بەهەرحاڵ دەتوانین بەکورتی پێناسەی کەسێتی بکرێت و بگوترێت بریتییە لە کۆمەڵەیەکی سیستەماتیکی بیرۆکە و ڕاز و نیاز و ئارەزوو و نەریت، کە کەسێك لە کەسانی دیکە جیا دەکاتەوە.

مرۆڤ کە لەدایك دەبێت هەندێك ئارەزوو و پاڵنەری ئاژەڵانەی چاکنەکراوی وەرگرتووە. ئەم پاڵنەرە توندانە دەخرێتە ژێر کاریگەری بەهاکانی شارستانیەت و کۆت و بەندە کۆمەڵایەتییەکان. بە شێوەیەك منداڵ هەوڵ دەدات گونجانێك دروست بکات لە نێوان ئارەزووی پێداویستیە کاتییەکان، لەگەڵ ئەوەی کۆمەڵگا بەسەری دەسەپێنێ لە چاککردن و لەبەرچاوگرتن و بەهاکان. ئەمەش ململانێی بەردەوامی نێوان دوو هێزی دژ بەیەکترە: هێزێکی ئاژەڵیانە لە کۆت و بەند تێناگات و درك بە واتاکان ناکات، لەگەڵ هێزێکی دیکەی کۆمەڵایەتی هەوڵ دەدات بە سەر ئەو هێزە زۆردارە زاڵ بێت و بیخاتە قاڵبی شارستانی پەسەندکراو. وەك فرۆید دەڵێ: کەسێتی بریتییە لە ململانێی خود، یەکێکیان نزم، ئەویتریان بەرز. کەسانێك هەن لە ئاشتکردنەوە و گونجانی نێوان ئەم دوو هێزە ڕکابەرە سەرکەوتوو دەبن، بەمەش دەبنە کەسێکی ئاسایی. کەسانێکیش هەن، سەرکەوتوو نابن، بۆیە دەبنە شێت، یان تاوانبار، یان گۆشەگیر، ئابڕووبەر، زۆردار و قین لەدڵ.

سەرەڕای ئەمە پێشینان پێیان وابوو، مرۆڤ سەرپشکە لەوەی دەتوانێ هەر بژاردەیەك دروست بکات. وەك ئەوەی دەتوانێ کەسێتی پێك بهێنێت، بەخواستی خۆی دروستی بکات و لە قاڵبی بدات. بەپێی تێگەیشتنی ئەوان مرۆڤ دەتوانێ هەموو خەسڵەتە چاکەکان بۆ خۆی

بیات و خەسڵەتە خراپەکانیش لە خۆی بەدوور بخاتەوە. وەك ئەوەی کەسێتی بریتی بێت لە پارچە مۆمێك مرۆڤ بە خواستی خۆی شتی لێ دروست بکات. بۆ ئاگابوون لەوەی کەسێتی بەپێی کۆمەڵێك ڕێسا دروست دەبێت و پێدەگات، کە تێگەیشتن لەو ڕێسایانە ئاسان نییە. کەسێتی بەگوێرەی کارلێکردنی سروشت و کۆمەڵگا بە ڕێگایەکی کێشراو دەڕوات، جا واعیزەکان خوتبە بخوێنن یان نا، بیرمەندان ئامۆژگاری بکەن یان نا.

وەردی توێژینەوەیەکی مەیدانی لەبارەی کەسێتیی عێراقی کردووە، چەمکە زانستییەکانی لەسەر پراکتیزە کردووە، کە بەمەش بوو سەلماندی بەهای بیاباننشینی و بەهای شارستانی دوو بەهای دژ بەیەکترن. ئەم دوو بەهایەش بەگوێرەی جوگرافیای عێراق گەشەیان کردووە، کە تێیدا لەلایەك ڕووبار هەیە گەشەکردن و سەوزایی و سەقامگیری لەخۆ دەگرێت. لەلایەکی دیکە بە بیابان دەگات کە کۆچکردن و ناسەقامگیری و داگیرکاریی هەیە. لێرەوە کەسێتیی عێراقی دووفاقییە، لەلایەك بانگەشە بۆ بەهاکانی بیابان دەکات لە زاڵبوون و سەرکەوتن و شانازیکردن بە هۆز و ڕەچەڵەك و ئاڵەنگاری. لەلایەکی دیکە لەگەڵ شارنشینی و شارستانیەت دایە خۆشەویستی بۆ سەقامگیری و مەدەنیەت هەیە. وەردی بەم وتەیە ئەم حاڵەتەی کورت کردۆتەوە کە دەڵێ" تاکی عێراقی وەك ڕۆمیۆ عاشق دەبێت و وەك مەلا علێوی ژن دەهێنێ". وەردی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەو شارستانیەتەی لە عێراق لەلایەن خەڵکی شار بونیاد نراوە، هەمیشە لەلایەن خەڵکی بیابانەوە بە هێرشە یەك لە دوای یەکەکانیانەوە ڕووخێنراوە.

زۆرێـك لـــە توێــژەران بـــە عێــراق و بێگانـــەوە، هـــەوڵیان داوە خەسڵەتەکانی ئەم کۆمەڵگایە بدۆزنەوە. هەریەکەیان لەم پێناوەدا هاتووە بۆچوونێکی هەیە، لە بۆچوونی ئەوانیتر جیاوازە. هـەموویان هاتوون وەك پزیشك دەردی ئەم نەخۆشە دەستنیشان بکەن، بـەڵام بەداخـــەوە، لـــەم شـــێوازە ســـەرکەوتوو نـــەبوون کـــە نیشـــانەی نەخۆشـەکەیان پێـوە دەپشـکنی. ئـەوان ئـەدیب و مێـژوونووس و گەشتیار و ڕۆژهەڵاتناس بوون. کەسانێکی کەم لەوان هەوڵی داوە لە ژێر ڕۆشنایی دەروونناسی و کۆمەڵناسی و شارستانناسی تـاوتوێی دەردەکە بکەن، بۆیە وەك کەسانێك بـوون کـە نـەخۆش دەپشـکنن بێئەوەی لە زانستی پزیشکی شتێك بزانن.

وەردی دەڵـێ: ئـەم موحازەرەیـە، سـەرەڕای ئـەوەی لـە ڕووی زانستییەوە کەموکورییەکی زەقی هەیە، کەچی تاکە هەوڵێکە لەپێناو پشکنینی کۆمەڵگای عێراق و چۆنیەتی گەشەکردنی کەسێتـی لـەم کۆمەڵگایەدا ئەمەش لەژێر ڕۆشنایی کۆمەڵناسیی نوێ. چەندین ئازارم بەدەست ئامادەکردنی بینیوە، کە ناکرێت بـە سـووك بزانرێـت. لـەو ڕێگایەی هەوڵم دەدا پێیدا تێپەڕیم، ئاماژەیەکم نەبینی ڕێبەریم بکات، وەك ئەوە بوو من بە ڕێگایەکی نوێ بڕۆم پێشتر پێیەك هەنگاوی لێ نەهاوێشتبێ. بەهەرحاڵ، هەوڵێکی مەبدەئیانەی خوێنەر ئەوەیـە لـە ڕەخنـەی تونـد بگـات، وەك گومانکـەرێك سـەیری بکـات. لەوانەیـە زێدەڕۆیی نەکەم ئەگەر بڵێم ئەوا یەکەم هەوڵە لەم ڕێگایە بەم شێوەیە دراوە. مەبەستیشم ئەوە نییـە ئەمـە هـەوڵێکی شـیاو بێـت لـە ڕووی زانستییەوە قبووڵ بێت. کێشەی مرۆڤ ئەوەیـە ناتوانێـت ڕاسـتەوخۆ بگاتە ڕاسـتی، بۆیـە دەتوانرێـت بگوترێـت: ڕێگـای ڕاسـت بـە هەڵـە

دەردەکەوێت.

کەواتە ئەوەی لەم هەوڵە مەبەستمە، هاندانی کەسانی دیکەیە بۆ توێژینەوە لەم بابەتە گرنگە، ورووژاندنی هەندێك لە بیرمەندانمانە بۆ ئەوەی کەمێك لە کۆشکە بلوورینەکانیان دابەزن، وەك توێژەر و لێکۆڵەر تاوتوێی کۆمەڵگای عێراق بکەن، بە شێوەیەك خۆیان لە دەردەکانی بەدوور نەگرن و ڕقیشیان لە شتە هیچ و پووچەکانی نەبێتەوە.

## کارە نائاساکانی نەست ، یان نهێنیی کەسێتیی سەرکەوتوو ١٩٥٢

وەردی یەکەم عەرەبی بوو قسەی لەسەر پاراسایکۆلۆژی کردووە و بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی زانستێکە ڕێسای خۆی هەیە. باسکردنی ئەم زانستە لەلایەن کەسێکەوە بانگەشە بۆ زاڵبوونی زانست دەکات بەسەر هزرەوە، لە کۆمەڵگایەك کە باوەڕی بە خورافات هەیە، ئەم کارە وەك ڕۆیشتنە بەسەر پەتێك لە نمایشی سێرکێکی ترسێنەر و جەماوەرێکی چاوەڕوان. تۆ لەلایەکەوە بانگەشە بۆ زانستێکی ئەزموونی – هەستی، بەرجەستەکراو دەکەیت، لەلایەکی دیکەشەوە تیۆریزەی زانستێك دەکەیت کە لە جەوهەری مرۆڤەوە تێپەڕ دەکات، نەوەك ڕواڵەتی، بۆ ناوەخنی مرۆڤ دەچێت و لەگەڵ ئەو توانایانەی لەسەرووی هەستپێکراوەکانن. چۆن وەردی توانی تەباییەك لە نێوان پێشنیارکردن و باوەڕەکە، لە نێوان بیرۆکە و دژەکەی دروست بکات.

وەردی ڕۆشنایی خستە سەر نەست بەو پێودانگەی نەست گەورەترین هۆکارە لە پێکهێنانی کەسێتیی مرۆیی. ئەمەشی بە نموونە شاخێکی سەهۆڵ هێنایەوە. بە شێوەیەك ئاماژەی بۆ ئەوە

کرد چاو تەنها دەتوانێ لە ١٠٪ ی شاخەکە ببینێ بەسەر ئاوەوە، کەچی ٩٠٪ ی دیکە، لەژێر ئاوە. هەستی مرۆڤیش ١٠٪ درکەوتووە، کە مامەڵە لەگەڵ جیهان دەکات، بەڵام هەستەکەی پشت بە سەدا ٩٠٪ ی دیکە دەبەستێت کە لە قووڵایی دەریاکە ڕۆچووە.

دکتۆر عەلی وەردی هۆکارەکانی سەرکەوتن و نوشستی بۆ لۆژیکی ڕووچوو لە نەست گێڕایەوە. بۆیە وتی مرۆڤ بە سروشتی خۆی تاوتوێی ئەزموونە سەرکەوتووەکان دەکات وا دەزانێ ئەم ئەزموونانە ڕۆژێك بەرەو سەرکەوتنی دەبات، چونکە دەبێت مرۆڤ ئەزموونی سەرکەوتن و ژێرکەوتن تاوتوێ بکات کە لە خۆی نزیکە، بۆئەوەی بزانێ بۆچی ئەو ئەزموونانە شکستیان هێناوە.

دکتۆر عەلی وەردی پێی وابوو عەقڵی مرۆیی بە سروشتەکەی خۆی، لایەندارە. ئەمەش بەهۆی ئەو هۆکارە نەستیانەی بەڕێوەی دەبەن، وەك کاریگەری کۆمەڵایەتی، بەرژەوەندی تایبەت و سۆز. شرۆڤەکانیشی جەختکردنەوە بوو دەربارەی ئەو سێ خاڵە. مرۆڤ ناتوانێ پێچەوانەی ئەو شتانە بێت کە بە میرات لە کۆمەڵگاکەی بۆی ماوەتەوە، بەڵکو لایەنگری دەکات، ئەم لایەنگرییەش بەپێی هۆشیاریی مرۆڤەکە گەورە و بچووك دەبێتەوە. هەندێك لایەنگیری بۆ مرۆڤایەتی، هەندێکی دیکەش بۆ نیشتیمان، بۆ گوند، بۆ گەڕەك، بۆ هۆز، بۆ عەشیرەت، بۆ ڕەچەڵەك. جیا لەوەش بەرژەوەندی تایبەتی کەسی هەیە، کە ناکرێت لە دژی کار بکات، تەنانەت ئەگەر ئەم کارە لە بەرژەوەندی مرۆڤایەتیش بێت. لە کاتی بەریەککەوتنی بەرژەوەندی تایبەت لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی، سروشتی نەست وا دەکات بەرژەوەندی کەسی لەلای تاکێکەوە زاڵ بێت، بێئەوەی هەست

بکات. هەر بۆ ئەمەشە دادوەریی چارەسەری بۆ ئەو کێشەیە دۆزیوەتەوە ڕێگری لە هەر دادەوەرێك دەکات، کە پەیوەندی بە بابەتی سکاڵاکەوە هەبێت، چونکە سۆزی لە ڕووی نەستەوە وا دەکات پاڵپشتی لەو کەسانە بکات کە پەیوەندی لەگەڵیان هەیە.

وەردی پێی وایە پەیوەندی عەقڵی ناوەخن، بە عەقڵی ڕواڵەتییەوە، پێوەندییەکی دژەیەکترە. وەردی هەموو پیرۆزییەکی لە عەقڵ داماڵیوە، بە شێوەیەك زۆرێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتن دەداتە پاڵ ئیلهام وەرگرتن لە نەست و گوێگرتن لەو سروشانەی لە عەقڵی ناوەخنەوە دێت، وەك فایزەر دەڵێ" نەست کانگای زێڕ و تەپۆڵەی پێشینەکانە". هەروەها وەردیش پێی وایە، عەقڵ پابەندە بە ئارەزوویی بزێویی، کۆمەڵایەتی، سێکسی. بۆیە ئەو عەقڵ بە سێ کۆتوبەندی سەرەکی دەبەستێتەوە ئەوانیش دەروونی و کۆمەڵایەتی و شارستانیین. هەرچەندە مرۆڤیش پابەند بێت بەو کۆتوبەندانەوە ئەوا تواناکانی زیاتر ئیفلیج دەبێت.

وەردی پێی وایە ویست بەتەنها بەس نییە بۆ دروستکردنی سەرکەوتن، بەڵکو ویست لەم پێناوەدا کۆسپ دەبێت ئەگەر هاتوو پێچەوانەی ئارەزوو و بەهرە تایبەتەکان بێت. کاتێك تۆ بڕوات بە شتێك هەیە، ئەوا قەناعەتت پێی هێناوە، ئەگەر هاتوو کەسێك سەرکەوتوو نەبوو بەهۆی ئەو بلیمەتیەی کە لە عەقڵی ناوەخنی هەیەتی، ئەوا خەڵك بە بەخت ناوی دەبەن.

## واعیزەکانی سوڵتان ١٩٥٤

وەردی کتێبی واعیزەکانی سوڵتانی تایبەت بۆ هەندێك واعیز و پیاوانی ئایینی داناوە، بەوە تۆمەتباریان دەکات کە لەگەڵ

دەسەڵاتداران دەوەستن و بەرژەوەندییەکانی نەتەوە بۆ بەرژەوەندییە تەسکەکانی خۆیان فەرامۆش دەکەن، سازش لەسەر ئەرکە ئاینییەکانیان دەکەن. جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئیسلام لەسەرووی ئارەزووی دەروون و بەرژەوەندییەکانە، کەچی هەندێك لە واعیزەکان وەك ئەو ناویان دەبات، بەدوای ئارەزووەکانیان کەوتوون دوور لە ڕوحی ئیسلامی ڕەسەن. هەروەها وەردی بانگەشە بۆ ڕیشەکێشکردنی ململانێی تایفەگەریی نێوان شیعە و سوننە دەکات، بابەتی ململانێ لە شوێنگرتنەوەی پێغەمبەر بووە لە دوای مردنی، ئەمەش ناکۆکییەکی مێژووییە، زەمەنی تێپەڕاندووە. دەبێت ناکۆکییەکە لە مشتومڕی خەڵکی عەوام دەربچێت و بگەڕێتەوە لای پسپۆڕان، ئەوانەی دەتوانن بۆچوونی خۆیان لەبارەوە بڵێن و یەکلایی بکەنەوە. بەتایبەتیش مێژوو بە ڕۆشنی بۆچوونی خۆی لەبارەی ڕووداوەکان وتووە. جا پێویستی بەوە نییە دەمارگیرێك دەمارگیرییەکانی خۆی هەڵ بدات و مێژوو بە شێوەیەکی ڕەخنەئامێز بخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی خۆی بڕیار لەسەر ڕووداوەکان بدات. ئەگەر هاتوو مشتومڕەکان بە هەمان شێوازی هەزار ساڵ لەمەوبەر بەردەوام بوو، ئەمە بەڵگەیە کە عەقڵەکان هەزار ساڵە چەقیان بەستووە. بەڵام وەردی بواری بە قەڵەمەکەی دا بۆ ئەوەی باسی ناکۆکییەکانی خەلافەتی ڕاشیدییەکان و ململانێی نێوان خەلافەتە ئیسلامییەکانی دوای کۆچکردنی پێغەمبەر بکات.

وەردی ڕەخنەی لە هەڵوێستی قوڕەیش گرت، لەو ڕووداوانەی دوای کوشتنی خەلیفەی سێیەم عوسمانی کوڕی عەفان ڕوویان دا، ململانێی نێوان عەلی کوڕی ئەبوتاڵب و معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان هاوکات بوو

لەگەڵ کوشتنی عوسمان. لەگەڵ ململانێی نێوان شیعە و سوننە کە تا ئێستا لەسەر ئەم بابەتە بەردەوامە. وەردی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە نە شیعەکان لە سەرەتادا ڕافزی بوون و نە سوننەکانیش ناسبی بوون، بەڵکو توندڕەوی بەهۆی کەڵەکەبوونی هزرییەوە ئەو ناوەی لێیان ناوە، ئەمەش دەرئەنجامێکی خەمباری لێکەوتەوە. دواتر وەردی ڕەخنە لە دەوڵەتی ئەمەوی دەگرێت و لەسەرووی دەوڵەتیشەوە ڕەخنە لە معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان دەگرێت. وەردی دەوڵەتی ئەمەوی بە دەوڵەتی عروبە ناودەبات کە ستەمی کۆمەڵایەتی و ڕەگەزپەرستی تێدا بڵاوبۆتەوە. هەر لەم دەوڵەتەدا واقیعێك هاتۆتە ئاراوە کە دەربازبوونی بۆ نییە، بە شێوەیەك میری موسڵمانان تێیدا جیاوازی لەگەڵ میری کافران نییە لە ڕووی ڕواڵەت و ڕێوڕەسمی ڕواڵەتییەوە. دەبینی خەلیفە شەونوێژ دەکات و ڕەکات و سوژدە دەبات، زۆر دەگری و دەکڕوزێتەوە، بەڵام هەموو ئەم بابەتە ڕوواڵەتیانە بەهیچ شتێك ناگەنەوە گەوهەری واقیعی ژیان، بۆیە خەزنەدار هەر خەزنەدارە، جەللاد هەر جەللادە، نابینی سروشتی ئەو کەسانە بگۆڕێت. خەلیفە لەلایەکەوە خودا دەپەرستی و لەلایەکی دیکەشەوە بەندەکانی خودا تاڵان دەکات.

وەردی بە تەواوی جەخت لەسەر گوتاری وەعزخوێنی دەکاتەوە، دەشڵێ توێژینەوەکان سەلماندوویانە وەعز ئەنجامەکانی پێچەوانەی مەبەستی خوازراو دەبێت، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو کۆمەڵگاکە وەك کۆمەڵگای عێراق دووچاری نەخۆشی دووفاقی کەسێتی بووبێتەوە. وەردی نموونەی شەڕی کەربەلا دەهێنێتەوە کە لەنێوان خەڵکی نەجەف و خەڵکی کازمیە ڕوویدا، ئەمەش لە کاتی یادی چلەی

حوسێن کوڕی عەلی بوو. کە بە زیارەتی چلە ناسراوە. هەردوو لا لە کەربەلا بوون بۆ ئەوەی گیانی فیداکاری و قوربانیدانی ئیمام حوسێن زیندوو بکەنەوە، کەچی لەنێو خۆیان کەوتنە جەنگ، یەکێك لە نەجەفییەکان کوژرا. ئەگەر دانایی زانایانی نەجەف نەدەبوو لەوەی رایانگەیاند کە حورمەتی مانەوە لە کەربەلا بگیرێت و نێردراوەکانیان کێشایەوە، ئەوا ڕووداوەکە ئەنجامێکی نەخوازراوی دەبوو.

وەردی هەندێك دژبەیەکەکانی کۆمەڵگای ئیسلامی دەستنیشان کرد بۆ ئەوەی ڕۆشناییان بخاتە سەر. واعیزەکانی بەوە تۆمەتبار کرد کە تەنها ڕوو لە کۆمەڵگا دەکەن. ئەم خاڵانەش کە ئەو باسی کردووە خاڵی نییە لە جوانی بەتایبەتی بەو شێوازە سادەییەی وەردی باسی کردووە، لەوانە: وەعزخوێنی بۆتە پیشەیەك پارە بۆ خاوەنەکەی دەهێنێ. پێگەیەکی کۆمەڵایەتیشی پێ دەدا کە خراپ نییە. هەر کەسێك لە بەدەستهێنانی پیشەی دیکە سەرنەکەوت ئەوا وەعزخوێنی دەکاتە پیشەی خۆی. بەهەرحاڵ ئەمە پیشەیەکی ئاسانە، تەنها پێویستی بە ئەزبەرکردنی چەند ئایەت و حەدیسێك هەیە. لەگەڵ پۆشینی جلوبەرگێکی کەشوفش کە چاو فریو بدات، پێویستە واعیز ریشێکی گەورە و چڕوپڕی هەبێت لەگەڵ عەمامەیەکی قیت! دەست بکات بە هەڕوگیف لە خەڵك و بگری خەڵك بهێنێتە گریان، خەڵکیش کاتێك لەلای ئەو دێنە دەرەوە متمانەیان بەوە هەبێت خودا لێیان ڕازییە و کۆشکی گەورەی لە بەهەشت پێداون. ئینجا خۆشگوزەران و دەوڵەمەند و دەسەڵاتداران دێن، پارەی بەسەردا دەبارێنن وەك خۆیان خۆشگوزەران و دڵشادی دەکەن.

فیقهناسەکان لەو شتە شارەزان کە بە (حیلەی شەرعی) ناودەبرێت.

ئەوان دەتوانن پاساوێکی شەرعی بۆ هەر کارێك بدۆزنەوە هەرچەندە کارەکە چەپەڵ بێت، سوڵتانی ستەمکاریش کارێك ناکات تەنها دوای کۆبوونەوە نەبێت لەگەڵ فیقهناسەکان، بابەتەکەیان بۆ باس دەکات و ئەوانیش ئەو کاتە سەیری سوڵتان دەکەن، ئەگەر بینیان سوڵتان مکوڕە لەسەر ئەنجامدانی کارەکە ئەوا لە هەمبانەی خۆیان چەندین ئایەت و حەدیسی دژ بەیەکتری دەخەنە بەردەم تا ئەوەیان هەڵبژێرێ کە لەگەڵی گونجاوە، لە هەموو حاڵەتەکانیش خودا بەبەزەیی و لێبوردەیە.

سەیر ئەوەیە دەبینین واعیزەکانی سوڵتان هەموو تووڕەیی خودا دەخەنە سەری هەژارەکانەوە ئەگەر هاتوو ئەو هەژارە غەزەلخوانی لەگەڵ کەنیزەیەك کرد، کەچی پیرۆزبایی لە دەوڵەمەندەکان دەکەن کە ئەم کەنیزانەی بە پارەی خۆی لە بازاڕ کڕیوە. بە تێڕوانینی ئەوان جیاوازی لە نێوان حەلاڵ و حەرام جیاوازی بوون و نەبوونی پارەیە. واعیزەکان بایەخ بەوە نادەن ئەگەر گۆرانیبێژێك گۆرانی بۆ خەلیفە بچڕێت و لەگەڵ دەنگی ئەو کەنیزەکان سکیان بلەرزێنن. کەچی ڕووت و ڕەجاڵێك تۆمەتبار دەکەن ئەگەر هاتوو گۆرانی بۆ خۆی وت یان گۆرانی بۆ کەسە هەژار و بەستەزمانەکانی گوندەکەی وت.

ئەگەر هەژارێك لە ڕێگادا غەمزەی بۆ ئافرەتێك کرد، دونیای بەسەر وێران دەکەن. کەچی ئەگەر دەوڵەمەندێك سەدان کەنیزەی بکڕێ بە غەمزە و مەمزە تێری کردن، ئەوا بۆ ئەو پیاوە حەلاڵ و جوانە. ئەگەر ستەمکارێك لە ڕێنماییەکانی ئایین دەرچوو، ئەوا دەڵێن: ئەم پیاوە موجتەهیدە، ئەگەر هەڵە لە ئیجتیهادەکەی بکات ئەوا چاکەیەکی هەیە. بەڵام کاتێك هەژارێك بوو ئەوا بۆچوونێکی دیکەیان هەیە دەڵێن:

زندیقه. فەرمان دەکەن بە قەدی دارخورماوە لە خاچ بدرێت. پێم وایە ئەمە خووی واعیزەکانی ئێمەیە، ئەوان واز لە ستەمکار و خۆشگوزەرانەکان دەهێنن بە خواستی خۆیان هەڵسوکەوت بکەن، هەموو بایەخەکانیان دەخەنە سەر هەژارەکان بەدوای هەڵەکانیان دەگەڕێن و بژێویان زەحمەت دەکەن، بە هەڕەشە و گوڕەشە لە دونیا و ڕۆژی دوایی ئاگاداریان دەکەنەوە.

بە بڕوای من ئەم لایەنگیرییە لە وەعزخوێنی ئەوەیە: لە ڕابردوودا بە ئێستاشەوە وەعزخوێنەکان لەسەر پاشماوەی خوانی دەوڵەمەند و ستەمکارەکان دەژین. بژێویان لەسەر ڕەزامەندی کاربەدەستانەوە وەستاوە. بۆیە دەبینی چاو لە ستەم و تالآن و خۆشگوزەرانی ئەوان دەنوقێنن و دواتریش نزای تەمەندرێژیان بۆ دەکەن.

وەردی ڕەخنە توندەکەی بۆ واعیزەکانی سوڵتان بەم شێوەیە کۆتایی پێدەهێنێ: دەتوانرێت بگوترێت هەرچەندە ستەمی کۆمەلآیەتی توندتر بێت، ئەوا دروستکردنی مزگەوت و هاندانی وەعزخوێنی زیاد دەبێت. ئەگەر ستەمکارێکی زۆردار مزگەوتێکی دروستکرد، خودا کۆشکێکی گەورەی لە بەهەشت بۆ دروست دەکات، ئەگەر سامان بەسەر وەعزخوێنەکان ببارێنێ ئەوا خودا حۆری و دوو غولامی شۆخیان پێ دەدات ، ئەمەش وەك قەرەبووکردنەوەی ئەو کەنیزە غولامانەی لە دونیا لەدەستی داوە.

جا خەڵك بەو ڕێگا دووفاقییە تێدەپەڕێت، هەتا ئێستاش لەسەری دەڕۆن. شایانی باسە ئەم دووفاقییە لە ناوەندە ئایینییەکان توندترە لە شوێنەکانی دیکە. لە کۆمەڵگایەك کە وەعیزخوێن و فیقهناسی تێدا زۆر بێت، ئەوا خەڵك دوو ڕوویان دەبێت، لە کارەکانیان وەك تەواوی

خەڵكانی دیكەن، بەڵام لەلایەكی دیكە بەوە جیا دەكرێنەوە كە زۆر وەعز بۆ یەكتر دەخوێنن و یەكتر بە هەڕەشە و گوڕەشەی ئایینی دەتۆقێنن.

پێم وایە ئەم كۆتاییە، نایابترین قسەكانی وەردییە لە ئامۆژگاری كردنی واعیزەكان.

## گاڵتەجاڕیی عەقڵی مرۆڤ ـ ١٩٥٥

دكتۆر عەلی وەردی بەر لە بیرمەندانی دیكەی عەرەب تاوتوێی عەقڵی دەستەجەمعی عەرەبی كردووە و ڕەخنەی ئاڕاستە كردووە. ئەمەش لە میانەی ئەو میراتەی عەقڵی جەدەلی بنیادنراو لەسەر لۆژیكی ئەرستۆ و فەلسەفە، ئەمە لەبری ئەوەی لەسەر زانستی نوێ بونیاد بنرێت كە چەندین ئامراز و شێواز و میتۆدی فەراهەم كردووە، بۆ دۆزینەوەی چارەسەری كێشە كۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و فەلسەفییەكان. هەروەها بەرەو ئاڕاستەیەكی تەواوكاری زانستی و گونجانی ئامرازەكانی دەڕوات.

وەردی ئاماژەی بۆ ئەوە كردووە، كتێبی گاڵتەجاڕیی عەقڵی مرۆڤ وەك وەڵامێك نووسراوە لە بەرامبەر ئەو پەرچەكردارانەی كە لە واعیزەكانی سوڵتان كەوتۆتەوە، بەڵام نكۆڵیشی لەوە كرد بتوانێ بیرۆكەكانی بگەینێتە ئەو كەسانەی كە پێچەوانەی ئەون و لە مشتومڕەكانیان لە لۆژیكی ئەرستۆ ڕاهاتوون، وەك خۆی دەڵێ ئەوان لە دۆڵێك دەنووسن و منیش لە دۆڵێكی دیكە، بۆیە بڕیاردان لەسەر جیاوازییەكانمان لەم سەردەمەدا كارێكی ئەستەمە، دەبێت بۆ مێژوو جێی بهێڵین.

وەردی دەڵێ بە واعیزەکانی سوڵتانم وتووە، لادانی سێکسی لەنێو خەڵك زیاد دەكات هەرچەندە جیاکردنەوەی دوو ڕەگەزەکە لەنێو خەڵك توندتر بکرێت. ئەو برایانە لەم قسەیە تێنەگەیشتن، بۆیە گاڵتەیان پێکرد. بەڵگەیان ئەوە بوو لادان لە هەموو وڵاتان هەیە بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە، دواتر نموونەیان لەسەر بوونی لادانی سێکسی هێنایەوە لەو کۆمەڵگایانەی کە جیاکردنەوەی ڕەگەزەکانی تێدا نییە، باسی ئەوەیان کرد لە هەموو پایتەختەکانی ئەورووپا یانە و کۆمەڵەی تایبەت بە هاوڕەگەزبازەکان هەیە. دکتۆر وەردی سەرنجی خۆی لەبارەی بەڵگەی ئەو نەیارانەی دەدات و دەڵێ" بەڵگەی ئەوان لە بنەڕەتەوە لاوازە. من نەموتووە لادانی سێکسی لەو وڵاتانە بوونی نییە کە جیاکردنەوەی ڕەگەزی تێدا نییە. بەڵکو وتوومە لەم وڵاتانە کەمترە. ئەمەش بابەتێکە زانایان توێژینەوەیان لەسەر کردووە و بە کۆمەڵێك ئەنجام گەیشتوون کە نزیکە یەکلاکەرەوە بن. ناکرێت هیچ کۆمەڵگایەك بەدەست لادانی سێکسیەوە نەجاتی بێت، جا ئەو کۆمەڵگایە هەرچییەك بێت. مامۆستا هافلۆك کە پسپۆڕ بوو لە بواری توێژینەوە سێکسیەکان دەڵێ: ڕێژەی ٢٪ ی خەڵك بە سروشتی خۆیان نەوەك وەرگرتن، تووشی لادانی سێکسی دەبن. هۆکارەکەشی بوونی کەموکورییەکە لە پێکهاتەی بایۆلۆژییان، ئەمەش وا دەکات لەخۆیانەوە بە سروشتی خۆیان مەیلیان بۆ لادانی سێکسی هەبێت. تەنانەت ئەگەر لە هەرزەکارییەوە خرابنە ناو پۆلێك کیژۆڵەوە و دابنرێن.

دواتر وەردی دەچێتە سەر تاوتوێکردنی فەلسەفەی کۆن و دەڵێ: ناکرێت نکۆڵی لەوە بکەین فەلسەفەی کۆن چاکەی بەسەر

پێشکەوتنی هزری مرۆیی هەیە، بەڵام ئەم دانپێنانەمان ڕێگریمان لێ ناکات لەوەی بەپێی زەمەنی نوێ پەرە بە بیرکردنەوەمان بدەین. دکتۆر وەردی وەها پێناسەی نوێکردنەوە دەکات، کە مانای ئەوە نییە هەندێك زاراوەی نوێ لەسەر زارمان بێت، بەڵکو دروست نوێکردنەوە گۆڕانێکی گشتییە لەو پێوەرە زەینییانەی کە مرۆڤ لە بیرکردنەوەدا بەکاریان دەهێنێ.

وەردی وێنەی ئیفلیجی بیرکردنەوەی عەرەبی دەکێشێ لە مامەڵەکردن لەگەڵ دەقە قورئانییەکاندا. ئەم کەمتوانابیە فیکرییەش بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە پشت بە فەلسەفەی کۆن و لۆژیکی ئەرستۆ دەبەسترێت. وەردی دەڵێ: ئەوەی لە دەقی قورئانی وردبێتەوە، دەبینی بە لۆژیکی سوودگەرایی مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵێك بابەتی کارا و هەستیار دەکات، لەوانە بابەتی مەینۆشین (**يسألونك عن الخمر والميسر قل فيهما إثم كبير ومنافع للناس**). یان بابەتی خوداپەرستی (**أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَالا يَنفَعُكُمْ شَيْئًا وَلا يَضُرُّكُمْ**). ئەمەش بەدیارکراوی مەبەستی لۆژیکی نوێیە، بەڵام وا دەردەکەوێت بنەماکانی عەقڵی عەرەبی خۆی بەسەر لۆژیکی نوێ سەپاندووە، هەر توێژەرێك دەتوانێ ڕواڵەتی ڕێژەگەرایی لە دەقی قورئانی بدۆزێتەوە، ئەمەش لە میانەی چیرۆکی ململانێی هێزی نێوان موسای پێغەمبەر و بەندە پیاوچاکەکە هەیە. وەك دەزانرێت موسا پێغەمبەر بیرکردنەوەیەکی پەیامخوازی خودایی و بێ هەڵەی هەیە، لە کاتێکدا دەقی قورئانییەکە بە مەبەست شوناس و ئینتیمای لە بەندە پیاوچاکەکە داماڵیوە. کەچی ئەنجامی ململانێی نێوان دوو بیرکردنەوە بۆ کەسێتییە نەناسراوەکە دەبێت، بەو پێودانگەی کە

تێزەکەی شیاوترە لە پێشخستنی بەرژەوەندییەکان لە کاتی خۆیدا. لەبری ئەوەی موسڵمانان بە شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ ئەم دوو دەقە و چەندین دەقی دیکە بکەن، بە شێوەیەك کە بتوانن ببێتە هۆی دامەزراندنی بونیادێکی تیۆری مەعریفەیەکی پێشکەوتوو و کارا، کەچی بنەماکانی عەقڵی عەرەبی ئامادە و زاڵبوو، بەمشێوەیە ئەم تێکستانەی بەرەو ئەفسانە برد. یانیش لە دەریای فەلسەفەدا تەوژمەکان دەبڕن، لۆژیکی ئەرستۆیان کردۆتە چارۆگەی کەشتیی هزر، بۆ ئەوەی بگەن بە کەنارەکانی ڕەها. ناشزانن ئەوان بە ئاڕاستەی وەهم و ون بوون دەڕۆن. لە کۆتایی کتێبەکەی وەردی پێی وایە دیاردە کۆمەلایەتییەکان بوونیان هەیە جا چاویان لێ بپۆشرێت یان نا، گۆڕانکاریش لە عەقڵیەتی ڕۆژهەلاتی دێت، ناکرێت بابەتە عەقڵییەکان کە لە باپیران ماونەتەوە، هەتا هەتایە وەك خۆیان بمێننەوە.

خودی خۆم باوەڕم وایە ئەم داوایەی وەردی لە هزری عەرەبی و ئیسلامی کردووە، کە دەبێت مامەڵە لەگەڵ ئەو ئامرازانە بکات، بۆئەوەی توانست هەبێت تێکستێك بهێنێتە بەرهەم دامەزرێنەری تیۆری مەعریفیی پێشکەوتوو و کارا بێت. لە سەردەمی خۆی نەبووە. ئەو زانایە کە دەزانێ فیکری ئیسلامی ملکەچی بەڕێوەبەردنی دەسەلاتی خەلافەت بوو تا کۆتایی سەردەمی عەباسی دواتر بەرەو دەوڵەتۆکە ڕۆیشتووە و ئینجا بەرەو سەدە تاریکەکان. ئەوەی وەردی داوای کردووە لەگەڵ پێشنەکەوتنی هزری کۆمەڵگا، شیاو دەرناکەوێ.

## ئەفسانەی ئەدەبی بالا ١٩٥٧

کتێبی ئەفسانەی ئەدەبی باڵا، بریتییە لە کۆمەڵێك وتار، وەردی لە

ڕۆژنامەکان بڵاوی کردۆتەوە، تێیدا ڕەخنە لە دەستگرتن بە شێوازی کۆنی زمان دەگرێت لە گەیاندنی بیرۆکەکان بە خەڵك. زمانناسی بەناوبانگ دکتۆر عەبدولڕەزاق محیّدین وەڵامی دایەوە (دکتۆر عەبدولڕەزاق محیّدین، ١٩١٠ – ١٩٨٣، لە خێزانێکی زانستپەروەر و ئایینی لەدایك بووە، لە لوبنان هاتۆتە نەجەف، لە سەردەمی عەبدولسەلام عارف وەزیر بووە، مەجلیسێکی ئەدەبی بەناوبانگی لە بەغدا هەبوو، چەندین کتێبی هەیە کە یەکێك لەوان بە هاوبەشی لەگەڵ وەردی بڵاوی کردۆتەوە.) دکتۆر عەبدولڕەزاق وەڵامەکانی لە ڕۆژنامەکان بڵاو دەکاتەوە، وەردی هەموو وتارەکانی بە وەڵامەکانی دکتۆر عەبدولڕەزاقیشەوە لە کتێبێکدا کۆکردۆتەوە، ناوی ناوە ئەفسانەی ئەدەبی باڵا.

ڕەخنەکەی وەردی سەبارەت بە گوتاری ئەدەبی بوو، چونکە ئەو وتارە لەگەڵ زەمەن پێشنەکەوتووە تا ئاڕاستەی مرۆڤێکی ئاسایی بکرێت. بەڵکو ئامرازەکانی ئەستەم بووە گوایە دەبێت ئەدەب لەپێناوی ئەدەب بێت. ئەمەش وایکردووە ئەدەب تایبەت بێت بە کەسانی تایبەتەوە، کەسێکیش سەرکەوتوو نابێت، تەنها بە لاسایی کردنەوەی ئەدەبی کۆن نەبێت. وەردی دەڵێ تەنانەت منیش لە گەنجێتی هەوڵم دەدا لە شێوازی نووسین لاسایی زەیات بکەمەوە، خودی زەیاتیش هەوڵی دەدا لاسایی جاحیز و ئەبوحەیانی تەوحیدی بکاتەوە. وەردی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە شێوازی جاحیز مەزن بووە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە ئێمە لەو سەردەمەمان دا لاسایی بکەینەوە. شتێك کە لە زەمەنێکی دیارکراو گونجاوە، لە زەمەنێکی دیکە بێ کەڵك دەبێت.

بە تێڕوانینی وەردی نووسەری سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە خوێنەر لە کاتی خوێندنەوە لەگەڵ نووسەر بیر دەکاتەوە، بۆیە هەرکە دەست بە خوێندنەوەی ڕستەی یەکەم دەکات هەست دەکات خوێندنەوە ڕایدەکێشێ. کاتێکیش لە کتێبەکە تەواو دەبێت بەداخ دەبێت و هیوا دەخوازێ کتێبەکە درێژتر بووایە. نووسینی نوێ هونەرێکی زۆر ئەستەمە کەس ناتوانێ تێیدا سەرکەوتوو بێت تەنها ئەوانە نەبێت کە بەهرەی پێویستیان هەیە.

وەردی پێی وایە ڕەوانبێژیی عەرەبی چەمکێکی بۆ نووسین دیارکردەوە لەگەڵ هەموو زەمەنێك دەگونجێت (چاکترین قسە ئەوەیە کورت و بەمانا بێت) ئەمەش لە سەرەتای ئیسلام عەرەب پەیڕەویان کردووە. ئەم شێوازەش نزیکە لە شێوازی تەلەگرافی کە ئەمڕۆ بەکاردێت. نووسەر هەوڵ دەدا وشەکان بەپێی واتاکان دابنێت، نە زیاد نە کەم. ئەمەش شێوازێکی باوە لە شارستانیەتی نوێدا.

وەردی دەکاتە ئەو دەرئەنجامەی، ئەو زمانەی کە لەگەڵ سەردەم ناگونجێ، قوتابیەکانی نەوەی نوێ فێری شێوازێکی ڕەوانبێژی دەکات کاتێك خوێندن تەواو دەکەن، لە نووسینەکانیان ڕێبازی جاحیز و تەوحیدی دەگرنە بەر. جا دەیانبینی لە جیهانی پەخشان وەك شاعیران بەرز دەفڕن. ئەمەش وا دەکات لە کۆمەڵگاکەیان جیا ببنەوە بە هەموو کێشە و قەیرانەکانیەوە، وا دەکات واقیعی ئێستا لەبیر بکەن. بە شێوەیەك مانای وشە یۆتۆپییەکان لەگەڵ واقیعی کێشەکانی کۆمەڵگا ناگونجێن. وا دەکات شاعیر و ئەدیب لە دۆڵێك بن، بە زمانێك بدوێن کە بەکار نەهاتووە. هەموو ئەمانەش وا دەکات ئەو واقیعە تاڵە لەبیر بکەن کە تێیدا دەژین.

## خەونەکان لەنێوان بیروباوەڕ و زانستدا ۱۹۵۹

کتێبی خەونەکان وەك تەواوکەری کتێبی (کارە نائاساکانی نەست) دەکرێت بڵێین وەردی کتێبەکەی بۆ سەر سێ بەش دابەشکردووە. لە بەشی یەکەم باس لە خەون دەکات لە ڕووی کۆمەڵایەتی و باوەڕەوە، لەم بەشەدا باسی بۆچوونی فەیلەسووفان دەکات لەبارەی خەونەوە، جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە مرۆڤە سەرەتاییەکان زیاتر لەوانی دیکە باوەڕیان بە خەون هەبووە. ئەرستۆش بە یەکەم فەیلەسووف دادەنێت کە فەلسەفیانە توێژینەوەی لەبارەی خەونەوە کردووە دوور لە دونیای غەیب و خۆهەڵقورتاندنی خواوەندەکان. ئەرستۆ پێی وایە خەونەکان لە ورووژێنەرە هەستیەکانی کاتی بێداری دروست دەبن، بەڵام مرۆڤ بایەخیان پێ نادات، کەچی هەرکە دەکەوێتە خەوەوە، ئەوا لە شێوەی خەون دەردەکەون. ئەرستۆ درکی بەوە کردووە کە مەیل و سۆز و ئارەزووەکان کاریگەریان بەسەر خەونەوە دەبێت. دڵدارێك لە خەونەکانی ئەو شتانە دەبینی کە لەگەڵ ئارەزووی عیشقەکەی دەگونجێ، کەسێکی ترسنۆك ئەو شتانە دەبینی کە کاردانەوەی ترسەکەی ئەون... بەم شێوەیە. کەچی فەیلەسووفانی ستیۆسیزم (ڕەواقییەکان) بۆچوونیان لە گەڵ ئەرستۆ جیاواز بوو، ئەوان پێیان وابوو خەون ڕاستگۆیە و سروشێکی خودایییە، دەیانگوت دەروونی مرۆڤ لە کاتی بێداری دەبێتە نێچیری ئارەزووەکان و فشارەکان، بەڵام لە کاتی نوستن لە فشار و شەهوەتبازی نەجاتی دەبێت، ئامادە دەبێت بۆ پێشبینکردن و ئاشکراکردنی غەیب.

لە بەشی دووەمدا عەلی وەردی لە ڕووی دەروونی و

پاراسایکلۆژییەوە توێژینـەوەی لـەبارەی خەونـەوە کـردووە، لـەم بوارەشدا جەختی لەسەر بۆچوونی زانایانی ئیسلام کردۆتەوە. باسی موعتەزیلەکانی کردووە کە نکۆڵی لەوە دەکەن هـیچ پەیوەندییـەکی خودایی لە خەونەکانـدا نییـە، بـەڵکو تـەنها وەهـم و خـەونی ئـاڵۆز. بەڵگەشیان ئەوەیە درکپێکردنی دروست تەنها لە کاتی بێدرایی لەلای مرۆڤ بوونی دەبێـت، کاتێك عەقڵ لە گڕوتینی خۆی دەبێت. هەروەها دەشڵێن درکپێکردن و خەو دژ بەیەکترن و بەیەکـەوە کۆناکرێنـەوە، ناشکرێت لە کاتی خەو عەقڵ درك بە هەقیقەتەکانی گـەردوون بکـات. کەچـی لـە سـۆفیگەرییدا خـەوتن بێدارییـە و بێـدارییش خەوتنـە. سـۆفییەکان دەڵـێن دەروونـی مـرۆڤ لـە کـاتی بێدارییـدا بـە وێنـەی هەستپێکراوەکان و ئەرکەکانی جەستەوە سەرقاڵە، کەچی لـە کـاتی خەوتن پەردە لەسەر چاوەکانی لادەدرێـت و بـە ئاسمـانی مەعریفـە سەربەسـتانە دەفـڕێ، شـتێك خـەریکی ناکـات، بەمـەش دەبیـنین بۆچوونی ئەوان لە بۆچوونی ڕەواقییەکان دەچێ.

دواتر وەردی وەك نەریتی خۆی شمشێری هەڵدەکێشـێ و بـاس لـە کاریگەریی خـەون دەکـات لەسـەر بیروبـاوەڕی ئیسـلامەوە. جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکاتـەوە کـە خـەون ڕۆڵێکـی گـەورەی هـەبووە لـە چەسپاندنی هەندێك بیروڕای پووچەڵ لە ئیسلامدا. لەوانە هەندێك لە پـەیڕەوکارانی مەزهەبـە ئیسـلامییەکان ئەگـەر بیانـەوێ بـرەو بـە ئیمامەکـەیان بـدەن و موژدەبەخشـی بـۆ مەزهەبەکـەی بکـەن ئـەوا هەنـدێك لـە خەونـەکانیان دەدەنـەوە پـاڵ پیاوچـاکەکان گوایـە پێغەمبەریان لە خەو بینیوە، سەلامی ڕاسپاردووە بۆ فلانـە ئیمـام و پـەیمانی بـە فلانـە مەزهـەب داوە کـە ئـەو مەزهەبـە لەسـەر هـەق و

ڕاستییە.

لە بەشی سێیەم وەردی تاوتوێی هەندێك لە تیۆرەكانی فەلسەفەی نوێ دەكات، وەك تیۆری هنری برگسۆن كە دەڵێ هەستەكان لە كاتی خەوتن لە ئەركی خۆیان ناكەون، هەر كاریگەرییەك بەسەر هەستەكانی كەسی خەوتوو دەبێتە هۆی بینینی خەونێك. كەچی فرۆید پێیوایە تێركردنی ئارەزووەكان لە خەوندا بە شێوەیەكی ئاشكرا دەرناكەون، بەڵكو لە زۆر كاتدا دەمامكدار و هێمادار دەبن. خەونیش هەموو ئەو ئارەزووانە تێر ناكات كە مرۆڤ هەستیان پێ دەكات، بەڵكو تەنها ئەوەیان دەهێنێتە دی كە مرۆڤ لە كاتی بێداری كپی كردووە، یان بە هۆكارێكەوە نەیتوانیوە تێری بكات.

وەردی لە بەشی كۆتاییدا پرسیار لەبارەی پەیوەندی نێوان خەون و بلیمەتی دەكات، ئەمەشیان كارە بەزێنەرەكانی نەستە. ئایا ڕاستە بلیمەت و داهێنەران لە میانەی خەونەكانەوە، بە دۆزینەوە و داهێنانەكانیان گەیشتوون. چەندین نموونە لەبارەی ئەو كەسانەوە دەهێنێتەوە، لەوانە دیكارتی فەیلەسووف و توێژەری كەنەدی فردریك گرانت و چیرۆكی دۆزینەوەی ئەنسۆلین. وەردی ئەم كارانە بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە ئەو بیرمەندانە تەنها بەوە ناوەستن كە بە ڕێكەوت لە خەون بینیویانە، بەڵكو بەر لە خەوتن بیریان ڕێكارییان گرتۆتە بەر، لە ڕووی دەروونییەوە زەینی خۆیان ئامادە كردووە، بۆ قۆستنەوەی هەلێكی چاوەڕوانكراو لە خەونەكانیاندا.

## لۆژیكی ئیبن خەلدون ١٩٦٢

ئەم كتێبەی دكتۆر عەلی وەردی لە نامەی دكتۆراكەی وەرگیراوە، كە پێشتر پێشكەشی زانكۆی تێكساسی كردبوو، پلەی ئیمتیازی لەسەر

وەرگرتبوو. خودی خۆی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، لەگەڵ کورتکردنەوەی هەندێك بابەت و زێدەکردنی هەندێکی دیکە کە زمان و ژینگەی عەرەبی پێویستی بە شرۆڤەکردنی زیاتر هەبوو. وەردی بەرگی ئەکادیمی لە کتێبەکە داماڵیوە بۆ ئەوەی لەلای هەموو خەڵك بخوێنرێتەوە. هەروەها پێشکەشی کۆنفراسی ئیبن خەلدونی کرد کە لە تونس بەسترا.

وەردی کتێبەکەی کردۆتە دوو بەش، لە بەشی یەکەمدا تاوتوێی ئەو لۆژیکە دەکات کە ئیبن خەلدون لە کاتی دانانی تیۆرەکەی و لە کاتی بەرەنگاربوونەوەی کەسانی بیرتەسکی سەردەمی خۆی، پەیڕەوی کردووە. دەبووایە لەبەردەم ڕەوتی هزری یۆنانی کۆن و لۆژیکی ئەرستۆ بوەستێتەوە. وەردی پێی وایە ئەوان لە سەروبەندی دانانی کتێبی موقەدیمە توانیان کاریگەریان بەسەر هزری ئیبن خەلدون هەبێت. کەچی لە بەشی دووەم دەبینین ئیبن خەلدون دەستبەرداری ئایدیالیزمی لۆژیکی ئەرستۆ دەبێت، بیرکردنەوەی خۆی بەرەو ڕیالیزمی کۆمەڵایەتی ئاڕاستە دەکات، چونکە کۆمەڵگا یان ئەوەی ئیبن خەلدون بە عومڕان (عمران) ناوی دەبرد، پەیوەستە بە بەرژەوەندییەکان و کێشمەکێشی جیاواز، کە وا دەکات لە جموجۆڵی بەردەوام دابێت، بۆیە هێندە ملکەچی لۆژیك نابێت، بەقەد ئەوەی دەکەوێتە ژێر کاریگەری دەمارگیرییەکان و ململانێی نێوان شارنشینی و بیابانشینی و هەموو کێشمەکێشی نێوانیان و ئەمەو سەرەڕای هۆکارە ئابووری و سیاسیەکانیشەوە.

وەردی لە بەرژەوەندی ئیبن خەلدون ئەوە دەسەلمێنێ، کە ئیبن خەلدون هەر زوو پێشبینی ئەوەی کردووە زانایان و فیقهناسان

بەکەڵکی بەڕێوەبردنی دەوڵەت نایەن. چونکە ئەوان لە ڕادەبەدەر ئایدیالیست و لەو واقیعبینییە دوورن کە دەبێت فەرمانڕەوا هەیبێت بۆ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییە هەنووکەییەکان و ڕووداوە ڕاستەوخۆکان.

وەردی وەك نەریتی خۆی نمایشێکی فەلسەفەی یۆنانی دەکات لە سەردەمی ئیبن خەلدوندا، کە چۆن کاریگەری بەسەر فیقهناس و زانایان و کەسانی دیکەی ئەو سەردەم هەبووە. دواتر لە میانەی دەرخستنی ئەو پاشخانە ژینگەیی و کۆمەڵایەتییانەوە وەردی دەچێتە سەر ژیانی ئیبن خەلدون و ڕۆشنایی دەخاتە سەر بارودۆخی جوگرافی و کۆمەڵایەتی و ڕەفتاری، کە تێیدا ژیاوە.

وەردی توێژینەوە لەبارەی ئیبن خەلدون دەکات بەو پێودانگەی بلیمەتێکە، بلیمەتییەکەی وێڵی کردووە، چونکە نەیتوانیوە هاوسەنگییەك لە نێوان زانستەکەی و خواستی دەسەڵات و پێگە دروست بکات کە خوازیاری بووە. ئەمەش وایکردووە لەنێو دژبەیەکترەکان بژیت. کە ئەمەش ڕەنگدانەوەی ئاشکرای لەسەر موقەدیمە بەناوبانگەکەی هەبووە. وەردی ڕەخنە لەو بیرۆکەیەی ئیبن خەلدون دەگرێت، لەبارەی دامەزراندنی دەوڵەت لەسەر بنەمای دەمارگیرییەکان. وەردی وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: ئەم سەردەمە، سەردەمی شارستانیەت و پێشکەوتنە، بۆیە دەکرێت دەمارگیرییەکان بەهۆی چەکی پێشکەوتوو لە یەکتر جیا ببنەوە، جا لەو کاتەدا پێویستە دەوڵەت لەسەر بنەمای شارستانیەت بونیاد بنرێت، نەوەك لە شێوەی پێشوو بێت. وەردی پێی وایە ئیبن خەلدون زانستی عومرانی داهێناوە بۆ ئەوەی توێژینەوە لەسەر کۆمەڵگاکان و سروشتی مرۆڤەکان بکات بە شێوازێك کە پێشتر کۆمەڵگاکەی لێی

ڕانەهاتووە، تەنانەت چینە خوێندەوارەکەش کە خەریکی وەعزخوێنی بوو، بانگەشەی بۆ ئایدیالەکان دەکرد، ئەم شێوازەی نەناسیوە. (هێشتا ئەم دەقە هی وەردییە) ئیبن خەلدون بیرۆکەی ئەوەی گەڵاڵە کرد کە لۆژیکی نوێ لەکارکەوتووە پێویستی بە پێشخستن هەیە.

لە کۆتایی کتێبەکەیدا وەردی هەوڵی داوە واقیعی ئێستای عەرەبی بەو واقیعە ببەستێتەوە کە ئیبن خەلدون تێیدا ژیاوە. ئەمەش زیادکردنی بابەتێکە بۆ سەر نامە زانستییەکەی، بە شێوەیەك وەردی نامە بۆمب ئاساکانی بۆ پێشخستنی کۆمەڵگا لەوێ دەشارێتەوە. جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەبێت بایەخ بە کۆمەڵناسیی نوێ بدرێت، بۆ ئەوەی نەوەی نوێ بتوانێ کۆمەڵگاکەی لە وێنەیەکی واقیعی نزیکتر بخوێنێتەوە.

## لێکۆڵینەوەیەک لە سروشتی کۆمەڵگای عێراقی ١٩٦٥

وەردی بە شێوەیەکی مەیدانی توێژینەوەی لەبارەی کەسێتیی عێراقی کردووە و چەمکە زانستییەکانی خۆی لەسەر پراکتیزە کردووە، کە سەلماندوویانە بەهای بیاباننشینی و شارنشینی دوو بەهای دژ بەیەکترن. ئەم دوو بەهایەش بەگوێری جوگرافیای عێراق پێکهاتووە کە ڕووبار بە بیابان دەگات، یەکەمیان گەشەکردن و سەوزایی و سەقامگیریی لەخۆیەوە دەگرێت، دووەمیان کۆچکردن و چۆڵەوانی و ناسەقامگیری و داگیرکاری لەخۆ دەگرێت. بۆیە لەو نێوەدا کەسێتیی عێراقی کەسێتییەکی دووفاقییە، لەلایەك بانگەشە بۆ بەهاکانی بیابان دەکات لە زاڵبوون و سەرکەوتن و شانازیکردن بە هۆز، ڕەسەنایەتی و شەڕ دەکات، لەلایەکی دیکەشەوە حەزی لە شارنشینی و شارستانیەتە، لەگەڵ سەقامگیری و مەدەنیەت. وەك

وەردی بەو وتەیە کورتی دەکاتەوە" کەسێتیی عێراقی وەك رۆمیۆ عاشق دەبێت و وەك مەلا علێوی ژن دەهێنێ". وەردی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە شارستانیەت لەلایەنی خەڵکی شارەکانەوە لە عێراق بونیاد نراوە، کەچی خەڵکی بیابان بە هێرشە یەك لەدوا یەکەکانیان رووخاندوویانە.

وەردی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە ناکرێت بە شێوەی مەیدانی توێژینەوە لەسەر کەسێتیی عێراقی بکرێت، چونکە کۆمەڵگای عێراق لە کۆمەڵگای ئەمریکا جیاوازە. هێشتا لەنێو عەوامی خەڵك ترس لە ئەفەندییەك ماوە قەڵەم و دەفتەری بە دەستەوە بێت. ئەگەر ببینن ئەفەندییەك بۆ لایان دەچێت و قەڵەم و دەفتەری بە دەستەوەیە، وا دەزانن بۆ باج هاتووە، یان بۆ سەربازی و دەستگیرکردنیان هاتووە. ئەو خەڵکە لەوەش راهاتووە لە وەڵامی ئەوان بە چەندین رێگا درۆ بکەن، نەوەك تووشی خراپەیەك بن.

دکتۆر وەردی یەکەم کەسە لە وڵاتانی عەرەبی توێژینەوەی کەسێتی لە چوارچێوەیەکی زانستی کردووە. ئەمەش لە میانەی خوێندنەوە میتۆدییەکەی بووە بۆ سروشتی گەشەکردن و پێکهاتنی کۆمەڵگای عێراقی نوێ، لە رووی مێژووییەوە. واتە دوای سەردەمی عوسمانییەکان و لافاوەکانی بەغدا و تەوژمی تاعوون کە ژمارەیەکی زۆری عێراقیەکانی لەناو بردووە (لەوانەش خێزانەکەی وەردی کە خەریك بوو بەتەواوی بە تاعوون لەناودەچوون.) ئەم نەخۆشیانەش وایکردووە ژمارەیەکی زۆری خەڵکی عێراق بەرەو ویلایەتەکانی دیکەی دەوڵەتی عوسمانی برۆن، لە رۆژهەڵاتی نەجد و کەنداوی عەرەب و یان بەرەو شامی کۆن. کە ئێستا بەناوی دەوڵەتانی سووریا و لوبنان

و ئـەردەن و فەڵەسـتین ناودەبرێـت. یـان بـەرەو میسـر و بـاکووری ئەفریقیا کۆچیان دەکرد، کـە هێشـتا هەنـدێك خێـزان هەیـە نازنـاوە عێراقییەکانیان لەو وڵاتانە پاراسـتووە، جـا لـە میسـر بێـت یـان لـە مەغریبی عەرەبی بێت.

وەردی بایەخی بە شرۆڤەکردنی ڕەچەڵەکی ئەو کۆچبەرانە داوە کە ڕوویان لە عێراق کردووە، یانیش لە عێراقەوە ڕۆیشتوون. یان بڵێین لە شارستانیەتەوە بۆ هـاوردەکردنی بیابانشـینی هـاتوون. نووسـین و توێژینەوەکانی وەردی خەسڵەتێکی ئەنثرۆپۆلۆژییان هەیە. ئـەو لـە توێژینەوەی واقیعی کۆمەڵگای عێراق و کۆمـەڵگای بەغـدا بـە داب و نەریتەکانەوە بەردەوام بوو، ماوەی توێژینەوەکەشـی لـە سـەردەمی عەباسییەکان دەستی پێدەکرد تـا ئـەو کاتـەی کۆچـی دوایـی کـرد. وەردی پێی وایە ئەوەی کۆمەڵگای عێراقی لە تـەواوی کۆمـەڵگاکانی دەوروبـەری جیـا دەکاتـەوە ئەوەیـە کۆمـەڵگای عێراقـی مـەیلێکی نائاسـایی بـۆ مشـتومڕکردن هەیـە. ئـەم مشـتومڕەش وایکـردووە کولتووری هزری خەسڵەتێکی ئایدیالیزمی هـەبێت، دوور لـە واقیعـی بەرجەستەکراو. تەنانەت بەو ئاستە گەیشتووە کۆمەڵگای عێـراق بـە کۆمەڵگای دووبەرەکی و دووڕوویی بناسرێت، کە ئەمانـەش سـیفەتی ڕەسەنی ئەم کۆمەڵگایە نین، بەڵکو لە میانەی ئەو مشتومڕانە هاتووە کە لەگەڵ حەجاجیان کردووە، ئەمیش ئەم ناوەی لێناون.

وەردی لـە میانـەی ڕووداوە مێژووییـەکان و کاریگـەری ڕەفتـاری دەستەجەمعی لە پێکهێنانی سروشتی کۆمەڵگا، توێژینەوەی لەبارەی کۆمەڵگای عێراق کردووە. بۆیە وەردی بەم شێوەیە دەردەکەوت کە بەدووی ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی دەگەڕا تـا تۆمـاری بکـات. لەوانەیـە

لەسەر هەندێك وەستابێت کە کاریگەریان نەبووە، میتۆدێکی لێ دروست کردووە و لە توێژینەوەکانی کراوەتە پێوەرێك. ئەم چاوپێداخشانەشی بەگوێرەی بژاردەکردن و کاریگەرییەکەی بووە.

بۆ نموونە باسی بابەتی دەرکەوتنی (شێخیەت) و (بابایی) کردووە لە عێراقدا، لەگەڵ دەرکەوتنی کەسایەتیی (قورەتولعەین) کە ئافرەتێك بووە ئەم کات سیمای خۆی دەرخستووە لە مەجلیسان لەبارەی ئایینەوە دەمەتەقێی لەگەڵ پیاوان کردووە. ئەمەش وایکرد وەردی سەرسامی خۆی بۆ ئەم ژنە دەرببڕێت و مەزندەی ئەوە بکات ئەگەر ئەم ژنە لە سەردەمی ئێمە بایە چەندین خەڵاتی بەدەست دەهێنا و لە ڕیزی ئەو ژنە بەناوبانگانە دەبوو کە کاریگەریان بەسەر کۆمەڵگاکانی خۆیان هەبووە. وەردی نەچۆتە قووڵایی ئەم ئایینە نوێیە، کە ڕووخسارە سەرەتاکەی لە ناوچەیەکی نزیك لە کازمیە دەرکەوتووە، کە ئەمیش کەرخە و وەردیش هەر لەوێ نیشتەجێیە. دواتریش کاریگەری ئایندەی لە ئێرانەوە هەبووە، لە عێراقی سەردەمی عوسمانیش گەشەی کردووە.

ڕۆژێکیان بە وەردیم گوت، وێنەیەکی (قورەتولعەینم) دەستکەوتووە، لە کتێبێك دایە لە سەرەتای شۆڕشی ئێران چاپ کراوە بە ناونیشانی (بهائیت به روایت تاریخ) هەڵبەتە کتێبەکە بە فارسییە لە ڕووی مێژووییەوە باس لە دەرکەوتنی بەهائیەت دەکات. وەردی داوایکرد وێنەکەی نیشان بدەم، کاتێك سەیری وێنەکەی کرد، کەوتە پێداهەڵدانی و وتی" سەرەڕای هەموو کارەکانیشی جوان بووە". وەردی تاوتوێی ئەوەی نەکردووە، بەهائیەت چۆن دەرکەوتووە و چۆن لە وڵاتی فارس بۆ عێراقی عوسمانی بڵاوبۆتەوە،

دواتـر چـۆن دەوڵـەتی ڕووسـیای قەیسـەری و حکومـەتی بـەریتانی هەوڵیان بۆ چەسپاندنی داوە و داکۆکیان لێ کـردووە. وەردی تـەنها باسـی چـیرۆکی ئـەو ئافرەتـەی کـردووە، دواتـر بەدواداچـوونی بـۆ جووڵانەوەکەی کردووە تا کاتی کوشتنی لە ئێران، کە دەگوترێت زۆر دڕندانە کوژراوە.

وەردی بەپێی تێڕوانینی خۆی توێژینەوەی بۆ ئەو هۆکارانە کردووە کـە کاریگـەریان بەسـەر (کەسـێتی) هەیـە. دواتـر بـە بیرۆکەکـەی پەیوەستی دەکات بۆئەوەی لە میانەیدا باکگراوندێك دابمەزرێنێت تا پاڵپشـتی تیۆرەکـەی بکـات. ئەمـەش باسـکردنی ئـەو ورووژێنـەرە دەرەکی و ناوەکیانەن کە وەردی پێی وایـە کەسـێتیی عێراقـی پێـك دەهێـنن. هەرچـەندە وەردی دواجـار دانـی بـەوە نـاوە لەگـەڵ ئـەو پێشـکەوتنە کۆمەڵایەتییـە ترسـناکەی کـە لـە دوای شۆڕشـی ١٩٥٨ هاتووە، زۆرێك لە تێڕوانینەکانی بۆ کۆمەڵگای عێراقی گۆڕاوە.

لەپێناو هەقیقەت و مێژوو شتێك دەگێڕمەوە، هەرچەندە وەردی ئەم قسەیەی لە کتێبەکانی باس نەکردووە، بەڵام لە دانیشتنە تایبەتەکانی دركاندوویـەتی، بەتایبـەتیش لـە کۆتـا ڕۆژەکـانی تەمەنیـدا. ئـەم بۆچوونەش ئەوەبوو: وەردی تەواو لـە کۆمـەڵگای عێـراق بـێ ئومێـد بووە، کاتێك ڕووداوەکـان بـەخێرایی لـە دوای شۆڕشـەکانی ١٩٥٨-١٩٦٣-١٩٦٨ تێدەپەڕین. دواتریش لە دوای ساڵی ١٩٧٥ ئەستێرەی سەدام حوسێن هەڵکشا، ئینجا جەنگی هەشت ساڵەی نێوان عێراق و ئێران، کە لە ساڵی ١٩٨٠ دەستی پێکردبوو، دواتر جەنگی کوێت لـە ساڵی ١٩٩٠-١٩٩١. بە دوای هەموو ئەمانەشەوە ئابڵۆقـەی ئـابووری کـە زۆر دڵڕەقانـە بـوو. ئینجـا دەرکـەوتنی بۆرژوازیـەتی فـەرمانڕەوا

بەدوەکان (ئەمە ناوی وەردی بوو بۆ سەرانی عێراقی بەکاردەهێنا) هەموو ئەو ڕووداوانە وەردی بێئومێد کردبوو، بە شێوەیەك وایدەزانی هیچ تیۆرێکی زانستی نییە بەسەر کۆمەڵگای عێراق پەیڕەو بکرێت. جیا لەمەش وەردی نەدەترسا لەوەی ئەم بۆچوونەی بەرەو ڕووی کۆمەڵگا و سەرکردەکەی باس بکات، وەك سەلام شەماع باسی کردووە هەر ئەو بوو لە کۆڕەکەی ئەمینداریێتیی بەغدا کاتێك زانی ئەمینی بەغدا کۆڕەکەی تۆمار دەکات بۆئەوەی سەدام گوێبیستی بێت وەردی وتی" کۆمەڵگاتان کاول کرد ئەگەر نازانن فەرمانڕەوایی بکەن، دەسەڵات بۆ کەسانی دیکە جێبهێڵن". وەردی باوەڕی وابوو سیستەمی ناکاری کۆمەڵگای عێراق لە جەنگی نێوان عێراق و ئێران داڕووخاوە، دواتر لە کاتی داگیرکردنی کوێت، عێراق گەڕایەوە سەر دەسەڵاتی بەدوەکان، کە باوەڕیان بە داگیرکاری و تاڵانکاری هەبوو. لە خوێنەری بەڕێزی ناشارمەوە کە ئەوەی بەسەر عێراق هات، وەردی پێشبینی کردبوو.

## چاوپێداخشانێکی کۆمەڵایەتییانە بە مێژووی نوێی عێراق لە شەش بەرگدا لە ساڵی ١٩٦٩ تا ١٩٧٩

وەردی ئەم کتێبەی بە کتێبی تەمەن ناوبردووە، پشت و پەنای لە خوا خواستووە بۆ تەواوکردنی. لە پێشەکی بەرگی یەکەمی ئەمەی نووسیوە" لەوانەیە بکرێت ئەم کتێبە، بۆ خۆم بە کتێبی تەمەن ناوببەم. لە هەموو کتێبەکانی پێشووم زیاتر کات و کۆششم تێدا خەرج کردووە.. کردوومەتە چەند بەرگێك... تا دەگەمە کاتی ئێستا کە تێیدا دەژین، لەمەش پشت و پەنا لە خودا دەخوازم".

وەردی لـەبارەی کتێبەکـە دەڵـێ:" لـە کـاتی لێکۆڵینـەوەم بـۆ کۆمەڵگای عێراق (ئەمەش بابەتێکە لەمێژە پەرۆشیم) درکم بـەوە کردووە، من ناتوانم لەو بارودۆخەی ئێستا لە کۆمەڵگاکە بگەم، ئەگەر لەو ڕووداوانە نەگەم کە پێشتر بەسەر عێراق هاتووە. هەر یەکێك لەو ڕووداوانە دەبێت زۆر یان کەم کاریگەرییەکی بەسەر ڕەفتاری خەڵك و بیرکردنەوەی ئێستایان هەبێت.

دەکرێت لەو بارەیەوە کۆمەڵگا بە کەسێتیی مرۆڤێکی پێگەیشتوو بشوبهێنین. ئەو لە کەسێتیی ئێستایدا کاریگەر بووە بە ڕابردووەکەی، لەوانەیە ئەم کاریگەرییە لە ڕووی نەستەوە بێت، بەڵام هەرچۆنێك بێت بوونی هەیە و لەوانەیە لە شێوەی گرێی دەروونی دەربکەوێت، پاڵ بە مرۆڤەکە بنێ بۆئەوەی هەندێك کردەوەی پڕوپووچ بنوێنێ، بەناچاری ئەنجامیان دەدات بە کاریگـەری پاڵنـەرێك کـە ناتوانـێ بەسـەری زاڵ بێت. خەریکە بگەمە ئەو باوەڕەی کـە کۆمـەڵگا هـیچ جیاوازییـەکی لەگەڵ ئەم مرۆڤە نییە. زۆرجار ڕووداوەکانی ڕابردوو لـە کۆمـەڵگادا گرێی دەروونی دروست دەکەن، بەجۆرێك خەڵکەکە بەهۆیەوە بەرەو هەندێك نەریت و بیرکردنەوە دەڕۆن. ئەمەش هیلاکیان دەکات کەچی ئـەوان وا دەزانـن کـارێکی چـاکیان کـردووە. لـەم کتێبـەدا چـەندین نموونەی واقیعی لەم شێوەیە دەبینین".

وەردی لـە پێشـەکی چاوپێداخشـانێك دەڵـێ:" ئـەم کتێبـەم بـۆ توێژینەوەی ڕووداوە مێژووییەکان تەرخان کردووە، هەر لە سەرەتای دەسەڵاتی عوسمانییەکانەوە. من بەنیاز بووم بەر لەم مێژووە تاوتوێ بکـەم، چـونکە سـەردەمەکانی مێـژوو یـەکانگیرن، ئەسـتەمە لـە سەردەمێك بگەین بێئەوەی بگەڕێینەوە سەردەمی پێشـووتر. بـەڵام

بینیم لە ڕووی زانستییەوە، نیمچە مەحاڵ بوو، چونکە ئەم کارە ناچارمان دەکات هەنگاو بە هەنگاو هەڵسەنگاندن بۆ ڕووداوەکانی ڕابردوو بکەین تا دەگەینە باوکە ئادەم.

دروستە بگوترێت توێژینەوە لە سەردەمی عوسمانی بەهێزترین پەیوەندی بە واقیعی ئەمڕۆی کۆمەڵگاکەمان هەیە. ئێمە هێشتا لە کولتووری کۆمەڵایەتی ئەودا دەژین، هێشتا زۆرێك لە ئێمە بە شێوەی بیرکردنەوەی سەردەمی عوسمانییەکان بیر دەکاتەوە. لە منداڵیم هەستم بەوە کردووە خەڵکانێك هەن غەریبی ئەو سەردەم دەکەن و ستایشی سەرکەوتنەکانی دەکەن و هیوای گەڕانەوەی دەخوازن".

لە دووانەی کۆمەڵایەتی و مێژوودا کە وەردی لە توێژینەوەکانی پشتی پێ دەبەستێت، بە ڕاشکاوی دەڵێ: " لە کتێبی ڕابردووم هەوڵم داوە توێژینەوە لەسەر ئەوە بکەم عێراق لە سەردەمی عوسمانییەکان لە چ بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی بووە. ئێستاش هەوڵ دەدەم توێژینەوە لەو ڕووداوە مێژووییانە بکەم کە ئەو کات ڕوویان داوە. پێویست بەوە ناکات بڵێم ئەم دوو بابەتە بەتوندی پەیوەستن بەیەکترەوە. بۆیە خوێنەر لەم کتێبەی ئێستام زۆرێك لە شرۆڤەکاری دەبینێ وەك چۆن لە کتێبی پێشووتر چەندین گێڕانەوەی مێژوویی بینیوە. بەهەرحاڵ ئەم کتێبە وەك کتێبێکی مێژووە، بەڵام وەك کتێبەکانی دیکەی مێژوو تەنها بایەخ بە خودی ڕووداوە مێژووییەکان نادات کە مێژوونووسان ئەنجامی دەدەن. بەڵکو بە پلەی یەکەم بایەخ بەوە دەدات ڕووداوەکان چ ئاماژەیەکی هزری و کۆمەڵایەتی لەخۆ دەگرن، سەبارەت بە بەها مێژووییەکەشی ئەوا لە پلەی دووەم دێت.

من مێژوونووس نیم بەڵکو لەوەی دەینووسم پشت بە مێژوونووسان

دەبەستم، بەدەست ئەمەش مەینەتییەکی زۆرم بینی. چونکە مێژووی عێراق لە سەردەمی عوسمانییەکان هێشتا لە چەندین لایەنەوە ناڕۆشنە. دەبێت توێژەر بە زۆرترین سەرچاوە بگەڕێت تا ڕووداوێکی ئەوتۆ دەدۆزێتەوە ئاماژەیەکی کۆمەڵایەتی و هزری هەبێت. جیا لەمەش ئاستەنگێکی دیکە هەیە لەم ڕووەوە تووشمان دەبێت کە مێژووی عێراق لەگەڵ زۆرێك لە وڵاتانی دەوروبەر تێکەڵ دەبێت لەم حاڵەتەشدا وا پێویست دەکات توێژینەوە لەو مێژووانە بکرێت ئەمە سەرەڕای مێژووی تایبەت بە عێراق. بۆیە خوێنەر دەبینی هەندێك جار لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان درێژدادڕیم کردووە تا دەگاتە ئێران و تورکیا یان دەکەوێتە نەجد و وڵاتی شام و میسر. ئەمەش بابەتێکە بە پێویستم دەزانی بۆ تێگەیشتن لە ڕووداوەکانی عێراق، دروستە ئەگەر بڵێم زۆرێك لە ڕووداوەکانی عێراق شتێك نەبووە تەنها سەدای ئەو ڕووداوانە بووە کە لە وڵاتانی دەوروبەر ڕوویانداوە".

ئەوەی وەردی لەم کتێبەدا بەدەستییەوە دەناڵێنی کێشەیەکی بابەتیانەیە بۆیە دەڵێ:" ئاماژە بۆ ئەو کێشەیە دەکەم کە لە هەموو کتێبەکانی پێشووم بەدەستییەوە مەینەتیم بینیوە. ئەمیش کێشەی بابەتی و بێلایەنییە لە توێژینەوەدا. جا لە هەندێك بەشی ئەم کتێبەدا دەگەینە هەندێك بابەت، لەلایەن زۆرێك لە عێراقییەکان بە هەستیار دەزانرێت. ئەوان لە تێڕوانین بۆ ڕووداوە مێژووییەکان وەها ڕاهاتوون وەك کەسانێك کە سەیری هەرەمێك دەکەن، هەر کۆمەڵێك دیقەت لەلایەکی هەرەمەکە دەکات و لایەنەکەی دیکە فەرامۆش دەکات".

کتێبی (چاوپێداخشانێکی کۆمەڵایەتییانە بە مێژووی نوێی عێراق) بە شەش بەرگ و لە دووتوێی هەشت کتێب بڵاوکراوەتەوە، چونکە

بەرگی پێنجەمی بە دوو کتێب بڵاوکراوەتەوە. بەشی شەشەمیشی پاشکۆی کتێبێکی لەگەڵ دایە، بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم کتێبە بە هەشت بەش یان بە شەش بەش و دوو پاشکۆ بڵاوکراوەتەوە.

بەرگی یەکەم بایەخی بە سەرەتای دەسەڵاتی عوسمانییەکان داوە، تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم. هەروەها بایەخی بە ڕووداوەکانی ئێران داوە، چونکە پەیوەندییەکی پتەویان بە ڕووداوەکانی عێراق هەبووە.

## بەرگی دووەم لە ساڵی ١٨٣١ تا ١٨٧٢

ئەم بەشە باس لە نیو سەدە دەکات لە سەرەتای ویلایەتی عەلی ڕەزا پاشا لە ساڵی ١٨٣١ تا کۆتایی ویلایەتی مەدحەت پاشا لە ساڵی ١٨٧٢

لە بەشی دووەمدا بایەخ بە ڕووداوەکانی میسڕ و شام دراوە، چونکە کۆمەڵگای عێراق لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە لە ئاڕاستەی کۆمەڵایەتی و هزرییەکەی لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات. بە واتایەکی دیکە لە هۆشیاری تایفەگەری بەرەو هۆشیاری نەتەوەیی دەڕوات. بای مەدەنیەت لە ڕۆژئاواوە لە ڕێگای میسر و شام دەگات و بەرە بەرە عێراقیش دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەکەی ئەمەش مانای ئەوەیە عێراق دیاردەیەکی نوێی کۆمەڵایەتی بەخۆیەوە دەبینی کە پێشتر بوونی نەبووە. ئەگەر پێشتر ململانێی تایفەگەری زەینی خەڵکی خەریك کردبوو، ئەوا ئێستا سەرەتای ململانێی نوێ دەردەکەوێ ئەویش ململانێی نێوان کۆن و نوێیە.

## بەرگی سێیەم لە ساڵی ١٨٧٦ تا ١٩١٤

ئەم بەشە مێژووی ٣٨ ساڵ لەخۆ دەگرێت. لە ساڵی ١٨٧٦ دەست

پێدەکات. کاتێك سوڵتان عەبدولحەمید هاتە سەر عەرشی دەسەڵاتی عوسمانی، لەساڵی ١٩١٤ کۆتایی دێت کە لەم ساڵەدا جەنگی یەکەمی جیهانی هەڵگیرسا. ئەم ماوەیە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە زۆر گرنگە، چونکە عێراق تووشی تەوژمی بیرکردنەوە و داهێنان و سیستەمی نوێی ئەورووپی بوو. ئەمەش بووە هۆی گۆڕانێکی بەرچاو لە ژیانی دانیشتووان لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە. ساڵانێکی کەم بەر لەم ماوەیەدا چەندین داهێنانی نوێ لە عێراق دەرکەوتبوو لەوانە کەشتیی ڕووبار، وێستگەی تەلەگراف، بنکەکانی پۆستە. ئەمەش وەك هەڵگرتنی ئەم لەمپەرانە بوو کە کۆمەڵگای عێراقی لە تەوژمی شارستانیەتی نوێ دابڕیبوو. هەر ئەم شتانەش بوو عێراقی لەم دابڕانە دەرهێنا کە تێیدا دەژیا.

عەلی وەردی دەڵێ: لە ساڵی ١٨٦٩ دوو شت ڕوویدا کە لەم بوارەدا کاریگەرییان هەبوو، یەکەمیان هاتنی مەدحەت پاشا وەك والییەك بۆ عێراق. وەك زانراوە ئەم والییە زۆرێك لە سیمای شارستانیەتی نوێی هێنایە عێراق. لە نموونەی قوتابخانە و نەخۆشخانە و چاپخانە و ڕۆژنامە و کارگە و هێڵی ترام و شەقام و باخچەی گشتی، لەگەڵ چەندین شتی دیکە. دووەمیان کردنەوەی نۆکەندی سوێس بوو. لەڕاستیدا کردنەوەی ئەم نۆکەندە کاریگەرییەکی مەزنی لە ڕووی کۆمەڵایەتی و هزری ناوچەکە هەبوو.

## بەرگی چوارەم لە ساڵی ١٩١٤ تا ١٩١٨

جەنگی یەکەمی جیهانی بەتوندی عێراقی هەڵتەکاند، کە ئەمەش نیشانەی قۆناغێکی گواستنەوەی گەورەی کۆمەڵایەتی بوو. وەردی دەڵێ: ئێمە هێشتا لەو قۆناغەدا دەژین، ماوەیەکی زۆریش تێیدا

دەمێنینەوە کە نازانین چەند دەخایەنێ. وەردی پشکی یەکەم و دووەمی بۆ ئەو ڕووداوە گرنگانە تەرخان کردووە کە لە تورکیا و شام و حیجاز ڕوویان داوە، ئەم ڕووداوانەش ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە ڕووداوەکانی عێراقەوە هەبووە. لە بەشی چوارەم دا باس لە سەرەتاکانی جەنگ دەکات لە بەسرا. ئەمەش کاتێك بوو کە تورکیا حاڵەتی نەفیرعامی لە ٢ی ئابی ١٩١٤ ڕاگەیاند. لەو کاتەدا هەواڵەکان لە بەسرا و بوشەهر و موحەممەرە دەگەیشتە کونسوڵی بەریتانیا کە تورکەکان مکوڕن لە پاڵ ئەڵمانیا بجەنگن و ئامادەکارییش بۆ ئەم جەنگە دەکەن.

لە ٢٩ی ئەیلول یەکەم کەشتیی جەنگی بەریتانی گەیشتە شەتولعەرەب، ناوی کەشتییەکە (ئیسبکیل) بوو. لەلای قەسری شێخ خەزعەل لە موحەممەرە لە نزیك ڕێژگەی ڕووباری کارۆن کەنارگیر بوو. سوبحی بێك کە فەرمانڕەوای حامیەی بەسرا بوو ناڕەزایی دەربڕی، بە بیانووی ئەوەی کەشتییەکە لە ناوی هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانی وەستاوە. لە ٧ی تشرینی یەکەم ئەفسەرێکی تورك دەچێتە لای کەشتییەکە نامەیەکیان پێ دەدا کە بەم گوزارشتە کۆتایی دێت" تکایە لە ماوەی بیست و چوار کاتژمێر شەتولعەرەب جێبهێڵن". کەچی فەرماندەی کەشتییەکە بەوە وەڵامی دەداتەوە ناتوانێ ئەو شوێنە بەجێبهێڵێ تەنها بە فەرمانی وەزارەتی جەنگی بەریتانیا نەبێت. ئەمەش سەرەتای جەنگ بوو.

## بەرگی پێنجەم لەبارەی شۆڕشی بیستەوە (هەردوو بەش)

وەردی لە پێشەکیی بەرگی پێنجەم دەڵێ: لە خوێنەری ناشارمەوە ماوەیەکی زۆر دوودڵ بووم لە دەرکردنی ئەم بەشە، چونکە دەزانم

ئەم ڕێبازە زۆرێك لە خوێنەران تووڕە دەكات ئەوانەی لە ڕێبازی مەزنكردن و حەماسەت ڕاهاتوون. بۆیە بەلایانەوە ئاسایی نییە، پەیڕەوی ڕێبازێكی دیكە بكەن، بۆ توێژینەوەی شۆڕشی بیست. سەرەڕای ئەمەش لەوانەیە بە ناپاكی نیشتیمان یان لایەنگیری داگیركەر تۆمەتبارم بكەن. وەك شاراوەش نییە ئەمانە تۆمەتێكی تۆقێنەرن. من نكۆڵی لەوە ناكەم كە شۆڕشی بیست شایەنی مەزنكردنە، شایەنی ئەوەیە هەموو عێراقییەكان شانازیی پێوە بكەن و درێژدادڕی لە ستایشكردنی چاكەكانی بكەن. بەڵام پێم وایە لە بەرژەوەندی نیشتیمان نییە بەردەوام بێت لە شكۆمەندكردنی شۆڕشێك بێئەوەی كەمێك بوەستێ بۆئەوەی پەندی كۆمەڵایەتی لێ وەربگرێت.

## بەرگی شەشەم لە ساڵی ١٩٢٠ - ١٩٢٤

وەردی ئەم ماوەیە بە گرنگ دەزانێ، لەم ماوەیەشدا حكومەتی نیشتیمانی دامەزراوە. وەردی لە توێژینەوە لەبارەی ئەم ماوەیە پشتی بە كۆمەڵێك سەرچاوە بەستووە، ئەمەش سەرەڕای توێژینەوەی مێژوونووسان. سەرچاوەكانی دیكەی وەردی بریتی بوون لەمانەی خوارەوە:

١- بەڵگەنامە بەریتانییەكان.

٢- نامەكانی مس بێل كە سكرتێری ڕۆژهەڵاتی نێردراوی باڵای بەریتانیا بوو.

٣- نامە ئەكادیمییەكان كە لەلایەن قوتابیانی خوێندنی باڵا لە زانكۆی بەغدا ئامادە كراوە.

٤- یاداشتی سیاسەتمەدارانی عێراق.

٥- قسەی بەساڵاچووان کە لەم قۆناغەدا ژیاون.

٦- ڕۆژنامە کۆنەکانی ناوخۆ.

دواجار و دوایین کاریش نییە پاشکۆی بەشی شەشەمە! بەناوی چیرۆکی ئەشراف و ئیبن سعوود. ئەم پاشکۆیە دەکرێ پاشکۆی هەموو بەشەکانی کتێبەکانی پێشتر و دواتر بێت. توێژینەوەیەکە لەبارەی ئەو ڕووداوانەیە کە لە حیجاز و نەجد و سووریا ڕوویانداوە و هەموویان پەیوەندییەکی توندیان بە کۆمەڵگای عێراقی و ڕووداوەکانی هەبووە، هەر لە ململانێی سەفەوی و عوسمانی بگرە تا دەگاتە شۆڕشی چواردەی تەمموز. وەردی دەڵێ: ڕاستە ئەگەر بڵێین ئەم ڕووداوانە ڕۆشناییەکی زۆر دەخەنە سەر ڕووداوەکانی عێراق، هاوکار دەبن لە تێگەیشتنی ڕووداوەکان، هەروەها هاوکاری خوێنەر دەکەن لەوەی لە هەندێك دیوە شاراوەکانی سروشتی مرۆڤایەتی بگات لەگەڵ کێشەکانی بە شێوەیەکی گشتی.

بەڵام کاتێك وتم دوا کاریش نییە، ئەمە قسەی منە قسەی وەردی نییە، چونکە ئەوەی من دەیزانم وەردی کتێبی چاوپێداخشانی تەواوکردبوو، پێیوە سەرقاڵ بوو، تەنانەت داوای هەندێك سەرچاوەی لە من کرد منیش لە دەرەوەی عێراق بۆم هێنا. بەڵام لە بەدبەختیدا تا ئێستا بەشەکانی دیکەی نەکەوتۆتە بەر دیدی خوێنەران.

هیوام وایە ئەو کەسانەی تەواوکەری کتێبەکەیان دەستکەوتووە بیخەنە بەر ڕووناکی، هەرچەندە لەوانەیە بە گونجاوی نەزانن، چونکە ئەمە خەتایەکی تێدا نییە. وەردیش بێ هەڵە نییە، ئەوەی نووسیویەتی بۆچوونێکی زانستییە کە دوای هەشتا ساڵ لە کۆشش و کارکردن دروست بووە و پێگەیشتووە، بۆیە بۆچوونەکەی گرنگ

دەبێت. پێم وایە ئەگەر بڵاوبێتەوە، هەرچۆنێك بێت بۆچوونی خودی دکتۆر عەلی وەردییە، پەیوەست نییە بە خێزان و کەسوکارەکەی.

## بەر لە پسپۆڕی کاریگەر بوو بەم کەسانە:

زانستەکەی وەردی زانستێك نەبوو کە بۆ دونیا بێت، بەڵکو زانستێکی بەسوود بوو لە چەندین سەرچاوە وەرگیرابوو. وەردی لە سەرەتای سییەکان کە لە زانستی کۆمەڵناسی یاخی دەبێت، دواتر پسپۆڕییەکەی دەبێتە ئەو زانستە و ئینجا دەبێتە گەورەترین زاناکانی، کەچی پێشتریش ڕازی نەبوو ئەم وانەیە لە قوتابخانەکان بڵێتەوە چونکە پسپۆڕیی ئەو نییە، پسپۆڕیی ئەو بواری ئابووری بوو.

ویستی خودای لەسەر بووە وەردی هەر لە منداڵییەوە خاوەن زەین و ڕابەرێکی مەشقپێکراو بووە، بۆ دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤەکان و گەڕان بەدوای گۆڕانکاری، ئەمەو سەرەڕای کارکردن بەهرەی تێگەیشتنی فیکری هەبووە، لەگەڵ بەراوردکردنی کۆمەڵگا و ژینگە، ئەمەش بەهۆی خوێندنەوە قووڵەکەی بووە لە بواری مێژوو و کۆمەڵگا. کە دواجار دەبێتە زانایەکی بەناوبانگ. وەردی دژی ئەفسانە و مەزنکردنی کەسەکان بوو، بەڵکو نەست و ژینگە و ڕێکەوت و توێژینەوەی لە پێکهاتەی کەسێتیی زانستی دادەنا، کەچی دانیشی بەوە دەنا بە کێ کاریگەر بووە و کاریگەری کێی بەسەرەوە بووە. تەنانەت کاتێك یەکێك بەتوندی مشتومڕی لەگەڵ بکردایە، ئەو ڕستە بەناوبانگەی دەگوت" مامە ئەمە زانست وا دەڵێ من چی بکەم".

**مستەفا جەواد:**

وەردی سەرەتا بە مێژوو کاریگەر بوو دواتر بە کۆمەڵگا، بەلام لە

مرۆڤەکان بە زانا و مێـژوونووس و زمانـەوان دکتـۆر مسـتەفا جـەواد کاریگــەر بــوو (مســتەفا جــەواد ١٩٠٤ - ١٩٦٩) زمانــەوان و مێژوونووسێکی ئینسکلۆپیدی بووە. لە بەغدا لەدایك بووە. لە ساڵی ١٩٤٩ دکتۆرای لە زانکۆی سۆربۆن بەدەست هێناوە. بۆتـە ئەنـدامی کۆمەڵێك کۆڕی زانیاری عەرەبی، جێگری سـەرۆکی کـۆڕی زانیـاریی عێراق بوو).

جـەواد بینیـی وەردی ماددەیـەکی خـاوە بـۆ وەرگرتنـی زانسـتە نوێیـەکان. کاتێــك مســتەفا جــەواد مێــژوونووس و زمانــەوان و ئینســکلۆپیدی دەبێـت، وەردیـش بـە جۆراوجـۆری زانیارییـەکانی سەرسام دەبێت، ئەمەش وا دەکات بەرەو مستەفا جەواد بچێت، لـە هەموو کۆڕەکان یـاوەری دەکـرد، بۆچـوونەکانی وەردی لـە میانـەی ڕێنماییە ڕۆشنبیرییەکانی مستەفا جەوادەوە فراوان دەبێـت.

## هەبەتودینی شەهرستانی:

لەنێو مەجلیسەکاندا، وەردی مەجلیسـی فیقهناسـی و ڕیفۆرمخـواز هەبەتودینی شەهرستانی ناسیوە. (هەبەتودین شەهرستانی ١٨٨٤ - ١٩٦٧ موجتەهید و فیقهناسێکی شیعەیە لـە سـامەڕا لـەدایك بـووە. پێشەنگی جووڵانەوەی ڕیفۆرمە لە دژی چەقبەستوویی ئایین، چەندین هەڵوێستی پشتگیری بۆ شۆڕشی دەستووری ئێران و عوسمانی هەیە. لە جەنگی شوعەیبە و شۆڕشی بیست لە دژی بەریتانیا بەشدار بووە، بۆتە وەزیری مەعاریف لە حوکمڕانی نیشتیمانیدا) هەر لەو مەجلیسەدا وەردی ڕیفۆرمی ئایینی و تێزەکانی ڕیفۆرمی ناسی کە شەهرسـتانی بانگەشەی بۆ دەکرد. دکتۆر عەلا حوسێن ڕەهیمی لە توێژینەوەکەی لەبارەی هەبەتودینی شەهرسـتانی و کۆششـە فیکرییـەکانی بـەناوی

(هەبـــەتودینی شەهرســـتانی لـــە یادەوەریـــدا) نامەیـــەکی وەردی بڵاوکردۆتەوە کە لـە ساڵی ١٩٤٣ بـۆ شەهرستانی ناردووە و تێیـدا هاتووە" ئەگەر دەستی تۆ لە زۆر بواری ئایین و کۆمەڵگا هەیە، ئەوا دەستی تۆ لە دژی نەریتی بەسەرچـوو زۆر ڕۆشـنە و مێـژوو لـەیادی ناکات. بێگومانم لەوە منیش یەکێك لە شاهێدحاڵەکانی دەبم". ڕۆژێك وەردی بـۆی باسـکردم لـە میانـەی ئـەم مەجلیسـەوە نووسـینەکانی جەمالەدین ئەفغانی و محەمەد عەبدەی قوتابییەکەی ناسیوە لەگەڵ بیرۆکەکانی موحسین ئەمین عاملی.

## موحسین ئەمین عاملی:

موحسین ئـەمین عـاملی، سـێیەم کەسـە کـە وەردی لـە سـەرەتای تەمەنی گەنجێتی پێـی سەرسـام دەبێـت. (موحسـین ئـەمین عـاملی ١٨٦٥ – ١٩٢٥ لە لوبنان لەدایك بووە لە سەردەمی گەنجێتی خۆیدا بۆ زانسـت هاتۆتـە نەجـەف، دواتـر لـە هاوزاکـانی جیـا دەبێتـەوە و دەچێتە دیمەشق لەوێ نازناوی موجتەهیدی گەورەی پێ دەدرێت. بە شۆڕشـــە ڕیفۆرمییەکـــەی ناســـراوە، لـــە دیمەشـــق نێـــژراوە) وەك دەردەکەوێت ئـەو یاخیبوونـەی کـە وەردی لـە عـەقڵی نـاوەخنی لـە منداڵییەوە هەیبووە وا دەکات قبووڵی بۆچوونەکانی موحسین ئەمین عاملی بکات، کە داوای دەکرد ئایین لە توێکڵی دابونەریتە سواوەکان دەربهێنرێت بۆئەوەی لەگەڵ سەردەمەکە بـڕوات. هـەر ئەمـەش بـوو دواتر وەردی وەك سەرچاوەیەکی گرنگی توێژینەوەکانی پشـتی پـێ دەبەست.

## مەلیک فەیسەڵی یەکەم:

مەلیك فەیسەڵی یەکەم کوڕی شەریف حوسێنی هاشمی بوو لە ساڵی

١٨٨٣ لەدایك بووە و لە ساڵی ١٩٣٣ مردووە. لە شاری تائیف لەدایك بووە، سێیەم کوڕی شەریفی مەککەیە. فەیسەڵی یەکەم ماوەیەکی کەم لە ١٩١٨ تا ١٩٢١ مەلیکی سووریا بوو. دواتر لە ١٩٢١ تا ساڵی ١٩٣٣ بوو بە مەلیکی عێراق. وەردی پێی گوتم ئەو بە کارەکتەری کاریزمی مەلیك فەیسەڵی یەکەم کاریگەر بووە. ئەمەش لە میانەی بەڕێوەبەردنی وڵات بووە. چونکە لەگەڵ باوکی لە سیاسەت شارەزا بووە سەرەتا لە مەککە و دواتریش لە شۆڕشی عەرەبی. بەتایبەتی لە ماوەی مانەوەی لە ئەستەنبۆڵ فێری زمانی تورکی و ئینگلیزی و فەرەنسی بووە. لەسەر دەستی شارەزاترین مامۆستا گەورە بووە، دواتر دەگەڕێتەوە حیجاز و سووریا. لەوێ تووشی نوشستی دەبێت نەوەك سەرکەوتن، بەتایبەتی دوای دۆڕانی جەنگی مەیسەلۆن.

وەردی دەڵێ فەیسەڵی یەکەم هەموو ئەزموونی ژیانی و سیاسی خۆی لەگەڵ گەورەترین ڕاوێژکارەکانی لە نموونەی نوری سەعید و ڕۆستەم حەیدەر و دکتۆر ئەحمەد قەدری و فایز غصین و تۆماس ئیدوارد لۆرانس هێنایە عێراق. بۆئەوەی حکومەتێکی سەرکەوتوو لە عێراق دابمەزرێنێ بۆ گەلێك چاوەڕوانی زۆر شتیان لە مەلیك دەکرد. بەتایبەتی عێراق تازە لە ئەنجامی شۆڕشێکی خوێناوی کە چوار ساڵی خایاندبوو لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانییەکان دەربازی ببوو. فەیسەڵی یەکەم بە دووانەیی بەریتانییەکان و عێراقییەکان بە شێوازی (ببە و داوا بکە) مامەڵەی دەکرد بۆئەوەی مافی عێراقییەکان لە بەریتانییەکان وەربگرێت و ڕێگەش نەدات بەریتانیا دەست بەسەر عێراقدا بگرێت. ئەمەش لە کاتێك دابوو دەسەڵاتی داگیرکاریی کەم ببۆوە بۆ گرووپێك ڕاوێژکار کە هەوڵیان دەدا وڵاتەکە بەڕێوەبەرن، تا

تەنگژە دروست نەبێت. تا ئەو کاتەی لە ساڵی ١٩٣٠ پەیماننامەی لەگەڵ بەریتانییەکان بەست و بە پەیماننامەی ١٩٣٠ ناسرا. بەپێی ئەم پەیماننامەیە دان بە سەربەخۆیی عێراق نرا و کۆتایی بە حاڵەتی ئینتداب هات. لەو ماوەیەدا مەلیك فەیسەڵی یەکەم پرۆسەی سیاسی لە دەرەوە و ناوەوە بە سەرکەوتنێکی نایاب بەڕێوە دەبرد. ڕۆژنامەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی، بەریتانیا بە هۆکاری مردنی دەزانی بەهۆی ئەو ژنە سستەرەی یاوەری مەلیکی کردووە لە گەشتی چارەسەرکردن بۆ بیرنی سویسرا، گوایە ژەهری بۆ خستۆتە چاوە. کەچی ڕاپۆرتی مردنەکە هۆکارەکەی بۆ ڕەقبوونی خوێنبەرەکان گێڕاوەتەوە. وەردی کوشتنی مەلیکی بەدوور نەدەزانی، لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی نەبوو کە کوژرابێت، ئەو زانیاری تایبەتی لە ئەندامێکی تیمەکە بەدەست کەوتبوو کە یاوەری مەلیکی کردبوو، گوایە مەلیك بۆیە مردووە چونکە کۆششێکی زۆری کردووە (..........) کە بۆ تەمەنی ئەو شیاو نەبووە! .

**سەلامە موسا:**

دەتوانین سەلامە موسا بە یەکێك لەو کەسایەتییانە دابنێین کە لە ڕووی شێوازی نووسینەوە کاریگەرییان بەسەر وەردی هەبووە. (سەلامە موسا ١٨٨٨ – ١٩٥٨ لە قاهیرە لەدایك بووە، خوێندنی لە لەندەن و پاریس تەواو کردووە.) شێوازی سەلامە موسا لە نووسین، ئاسان و لاسایی نەکراوە بووە کە عەرەب بە (السهل الممتنع) ناوی دەبەن، شێوازەکەی دوور بووە لە وشە ڕازاندنەوە. هاوسەردەمی وەردی بوو. سەلامە ستایشی هزری وەردی و شێوازی نووسینی وەردی کردووە، وەردیش لەلایەن خۆیەوە لە کتێبی ئەفسانەی

ئەدەبی باڵا ستایشی سەلامە موسای کردووە. وەردی دەڵێ سەلامە موسا درکی بە ڕۆڵی کۆمەڵگا کردووە لە لایەنی کولتووردا. هیوای دەخواست کۆمەڵگایەکی ئاست بەرز ببینێ باوەڕی بە ئازادی ڕۆشنبیری هەبێت و یاسا و سیستەمێك دابنێ هاوکار بێت لە برەودان بە کتێب و گۆڤار، بە ڕۆژنامەکانیشەوە. وەردی لەگەڵ سەلامە هاوڕایە لەوەی ڕۆشنبیری لە قوتابخانە و زانکۆکان لەسەر کۆمەڵێك ڕێسا دەڕوات کە زەین چەقبەستوو دەکات، بەڵام ئەو گەنجەی کە لە کۆمەڵگا خۆی پەروەردە دەکات، لە ڕۆشنبیرییەکەی بە ئاراستەیەکی داهێنەرانە دەچێت. هەر لەبەر ئەو هۆکارەشە لە بیرکردنەوەکەی لە قوتابییەکی زانکۆ ئازادترە. جیا لەمەش ڕێساکانی تووتی ئاسا لە دەرخستنی پرۆگرامەکانی قوتابخانە و زانکۆش ڕێگر دەبن لەوەی قوتابی لە بابەتێکەوە قووڵ بێتەوە، کەچی قوتابییەکی ئازاد ئەوەی بە تاقیکردنەوە پابەند نابێت، چێژی لێ وەردەگرێت و لێی قووڵ دەبێتەوە.

## لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان بەو کەسانە کاریگەر بووە:

دکتور عەلی وەردی لە زۆربەی توێژەران بەوە جیا دەکرێتەوە کە ناوی سەرچاوەکانی دەهێنێ و هەندێك جاریش پشت بە بیرۆکەکانیان دەبەستێ. بۆیە ئەگەر توێژەرێك بیەوێ سەرچاوەی توێژینەوەکانی وەردی بناسێ، ئەوا دەبێت بگەڕێتەوە سەر خودی کتێبەکانی وەردی، کە مافی هەموو کەسێك دەدات و ناوی خاوەنی هەموو تیۆرەکان دەبات. ئەگەریش بیەوێ بۆچوونێکی خۆی دەربخات، ئەوا دەڵێ ئەم گریمانەیە هی منە، خۆم گریمانەم کردووە. چەندە

هیوادەخوازم توێـژەرانی کۆمەڵناسـی تـاوتوێی تیـۆری ئـەو زانـا و فەیلەسووفانە بکەن کە وەردی پشتی پـێ بەسـتووە و گریمانـەکانی خـۆی لەسـەر بونیـاد نـاوە. بڕوایـەکی یەکلاکـەرەوەم هەیـە، ئـەو توێژەرانە بۆیان دەردەکەوێت کە گریمانەکانی وەردی چەندین تیۆری زانستین لەبارەی کۆمەڵگا و مێژوو و سروشتی مرۆییەوە.

وەردی لە کۆمەڵناسیدا کاریگەر بوو بە هزری خۆرئاوا، ئەو خوێندنی مەنهەجی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بووە، کە ئەو کات لە ڕووی مێژووییـەوە لـە لووتکـەی زانسـتی خـۆی دابـوو. بۆیـە وەردی میتۆدێکی ئەکادیمی بۆ خۆی دارشت کە لـە هـەموو هاوڕێکـانی جیـا دەکرایەوە، ئەمەش وایکرد ببێتە قیبلەی قوتابیانی بەش و کۆلیـژ و زانکۆکانی عێراق. هەروەها لێکدانی بابەتی مێژووی کۆمەڵایەتی وەک ماددەیەکی سەپێنراو لە هـەموو بـەش و پسـپۆڕییەکان، ئاسـۆیەکی نـوێی لەبـەردەم وەردی کـردەوە بۆئـەوەی جـەخت لەسـەر میتـۆدە تایبەتەکەی خۆی بکاتەوە.

توێژەر دەتوانێ کاریگـەری هەنـدێك لـە بیرمەند و فەیلەسـووفانی ڕۆژئاوایی بەسەر بۆچوونەکانی وەردی ببینـێ، تـەنها ئـیبن خەلـدون نەبێت کە ڕۆژهەڵاتی بووە. هەروەها هەر توێـژەرێکی هـزری وەردی درك بەوە دەکات کـە وەردی میتـۆد و میکانیزمـەکانی توێژینـەوە و شیکردنەوەی دیاردەکان و سەرچاوەی توێژینەوە زانستییەکانی، لە شـێوازەکانی توێژینـەوەی ڕۆژئـاوایی وەرگرتـووە، کـە هـەر لـەوێش زانستی خوێندووە. هەروەها ڕەخنەی لە هەندێك بیرمەند گرتـووە و دواتر بۆچوونی خۆی لەبارەی ئەوان گۆڕیـوە. بێگومـان هـەموو ئـەو سەرچاوانەی وەردی پشتی پـێ بەسـتووە، وەك هزرێـك نـەبووە کـە

تەواو وەریگرتبێ، یان ڕێبازێك بێت تەواو پەیڕەوی کردبێت. ئەم وەك هـەر توێـژەرێکی زانسـتی بـە سەرچـاوەی زانسـتی پاڵپشـتی بۆچوونەکانی دەکـات. وام بـۆ دەرکـەوتووە هیواداریشـم هەڵـە بم، هەندێك لەو توێژەرانەی توێژینـەوەیان بـۆ فیکـری وەردی کـردووە، وایـان زانیـوە ئـەو سەرچـاوانەی وەردی پشـتی پـێ بەسـتووە، لـە پاڵپشتیکردنی بۆچوونەکانی، یان لە توێژینەوەکەی بەکاری هێناوە، ئەوان بە سەرچاوەی میتۆدی توێژینەوەی وەردییان زانیـوە، گوایـە ڕێبازێك بووە لەسەری ڕۆیشتووە.

وەردی هەندێك لە میتۆدەکانی لە بیرمەندانی ڕۆژئـاوا وەرگرتـووە، بەڵام هەموو بیرمەندانی ڕۆژئاوا خاوەن میتۆد و ڕێبازی تایبەت نین. دواتریش پێویست ناکات وەردی لە توێژینەوەکانی پشت بـە هـەموو ڕێبازەکان ببەستێت، بۆئەوەی لەسەر ڕێبازی هەموویان بڕوات. بۆیە بەهیچ شـێوەیەك ئـەم تێگەیشـتنانەی هەنـدێك لـە توێـژەرانی بـیری وەردی جێگای قبووڵکردن نییە. ئەگـەر هـاتوو وەردی هەنـدێك لـەو میتۆدانە جێبەجێ بکات تەنها لەبەر ئەوەی لە توێژینەوەکانی بەکاری هێناوە، لەوانەیە هەندێك دژبەیەکتر و پێچەوانەی یەکتر بن، ئەمـەش لەگەڵ میتۆدی لێکۆڵینەوەی زانستی ناگونجێت. لەوانەیە دژی یەکتر بوەستنەوە. بۆ نموونە میتۆدی ئیستقرایی کە بریتییە لە هەڵێنجانی یاسای گشتی لە دیمەنە جوزئییەکان، لەگـەڵ میتـۆدی قیاسـی یـەك ناگرێتەوە کە مەعریفەی لە شرۆڤەکردنی زاراوەکان هەڵدەهێنجێ لـە گشتییەوە بەرەو تایبەت دەڕوات. جگە لەمەش ڕێبازی فەیلەسووفان لە تێزەکانیان تەواو لە یەکتر جیاوازن، ڕێبازی توێژینەوەی دیکارت لە گومانەوە بەرەو یەقین دەڕوات. ڕێبازی کانت تەواو گومانی هزری لە

میتافیزیکا ڕەتکردەوە و پشتی بە هەستپێکراوەکان بەست. ئەوەی پێی گەیشت تەواو پێچەوانەی ڕێبازەکەی دیکارت بوو. وەردی لە سەرچاوەی توێژینەوەکانی پشتی بە کانت و دیکارت بەستووە، ئایا ئەمە مانای ئەوەیە وەردی ڕێبازەکەی لە هەردووکیان وەرگرتووە. یان کاتێك لەسەر مارکسیزمی نووسی، واتای ئەوە بوو پەیڕەوی ڕێبازی ماددی کردووە لە نووسیندا. هەروەها ئەو لەسەر ڕێبازی عەقڵی هیگڵی نووسیوە، دواتر لەسەر ڕێبازی شۆبنهاوەری نووسیوە کە دژ بە ڕێبازی هیگڵە. ئەمە بابەتێکە هەرگیز جێگای قبووڵکردن نییە، چونکە جیاوازییەکی گەورە لەنێوان بەکارهێنانی سەرچاوەی توێژینەوە و پەیڕەویکردنی میتۆد هەیە.

من لەو کتێبەدا هەوڵم داوە، وردبینی بۆ ناوی ئەو بیرمەندە ڕۆژئاواییانە بکەم کە وەردی لە لێکۆڵینەوەکانی پشتی پێیان بەستووە. جا ئەم کاریگەربوونە لەسەر ئاستی تێزە فیکرییەکانەوە بێت لە بواری فەلسەفە و کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە، یانیش لەسەر ئاستی ڕێبازی لێکۆڵینەوە و میکانیزمەکانی بێت. من ئاماژەم بەو هۆکارە کردووە کە وام لێدەکات پێم وابێ وەردی ئەم ڕێبازەی لە فیکر جێبەجێ کردووە، ئەو ڕێبازەشی لە توێژینەوە پەیڕەو کردووە. تکاشم وایە ئەم پێشەکییە هەنگاوی یەکەم بێت بۆ توێژینەوە لەبارەی وەردییەوە لە ڕووی هزر و میتۆدەوە. لەم میانەشدا دەتوانین جووڵانەوەی زانستی وەردی بۆ سەر سێ ئاراستەی سەرەکی دابەش بکەین:

ئاراستەی یەکەم: ئەو بیرمەندانەی لە ڕووی هزرییەوە پێیان کاریگەر بووە.

ئاراستەی دووەم: ئەو بیرمەندانەی لە ڕووی میتۆدی توێژینەوە پێیان کاریگەر بووە.
ئاراستەی سێیەم: ئەو بیرمەندانەی ڕەخنەی لە هزریان گرتووە، دواتر بۆچوونی لەبارەی ئەوانەوە گۆڕاوە.

## ئیبن خەلدون:

بەگوێرەی ئەم ڕێبازەی سەرەوە ئیبن خەلدون یەکەم کەسە کە کاریگەری بەسەر وەردییەوە هەیە (ئیبن خەلدون ١٣٣٢ - ١٤٠٦ مێژوونووس و فەیلەسووفی کۆمەڵایەتی، یەکێك لە زانایانی سەردەمی خۆی لە کارگێڕی و سیاسەت و دادوەری و ئەدەب و زانستەکاندا. لە تونس لەدایك بووە و چەندین پۆستی لە مەراکیش و میسر وەرگرتووە) وردەکاریی ئەم بابەتەمان لە باسی کتێبی وەردی لەبارەی (لۆژیکی ئیبن خەلدون) باسکردووە. ئەو وایکردووە ئیبن خەلدون چوارچێوەی توێژینەوەکەی بێت لە خوێندنی دکتۆرا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. کەچی ڕەخنەی وەردی لە ئیبن خەلدون ئەوە بوو ئەم پیاوە حەزی لە پۆست بووە. وەردی دەڵێ نازانم ئاخۆ ئەگەر ئیبن خەلدون خۆی بۆ نووسین تەرخان دەکرد دوور لە سیاسەت و دادوەری بەرهەمە زانستییەکانی مەزنتر دەبوو، یان ئەم پۆستانە وایکردووە ببێتە نووسەر وبیرمەندێکی مەزن.

وەردی لە میانەی تێزەکەی ئیبن خەلدون بەرەو بیرۆکەکەی خۆی ڕۆیشتووە، کە بە گریمانە ناوی بردووە. کە باس لەوە دەکات ململانێی نێوان شارستانی و بیاباننشینی بریتییە لە ململانێی بیابان و شارەکان، هەرچەندە ئەم دووانە دژ بەیەکترن بەڵام هەردووکیان لە

بۆتەیەکدا کارلێك دەکەن. وەردی جیاوازی لەگەڵ ئەم تێزە هەیە، ئەو پێی وایە ململانێ لەنێوان بەهای بیابانشینی و بەهای شارستانی هەیە. وەردی کۆمەڵگای عێراقی بە نموونە دەهێنێتەوە کە شارەکانی هەمیشە لەگەڵ ئەو بەها و نەریتە لە ململانێ دایە کە لە دوورگەی عەرەبییەوە دێت. ئەمە بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی. دواتریش ململانێیەکی دیکە لە جۆرێکی جیاواز لە نێوان نەریتە چەسپاوەکانی سەردەمی عوسمانی و شارستانیەتی ڕۆژئاوایی کە لە دوای داگیرکردنی بەسرا لەلایەن ئینگلیزەوە دەرکەوت.

هەروەها تێبینی دەکرێت سەرەڕای ئەوە وەردی ستایشی ئیبن خەلدونی کردووە لەوەی ملکەچی پیاوانی ئایینی و سیاسی نەبووە، دوای نووسینی موقەدیمە و وازهێنانی لە لۆژیکی ئەرستۆ و پەیڕەوکردنی لۆژیکێکی جیاواز. یان وەك وەردی دەڵێ دوای ئەوەی وازی لە ئایدیالیزمی لۆژیکی ئەرستۆ هێنا و لە بیرکردنەوەدا بەرەو واقیعێکی کۆمەڵایەتی ڕۆیشت. وەردی ستایشی ئەو ڕێبازە نوێیەی کردووە، بەڵام کاتێك ویستوویەتی توێژینەوە لەبارەی ئیبن خەلدون بکات، تەنها تاوتوێی ئەو ڕێبازەی نەکردووە کە دایهێناوە. بەڵکو چەندین میکانیزمی توێژینەوەی هاوچەرخی هەڵبژاردووە، بۆئەوەی توێژینەوەکەی بە شێوازە زانستییەکەی بە ئەنجامی خوازراو بگات.

## ولیام گراهام سیمنەر

ولیام سیمنەر دووەم کەسایەتییە کە وەردی پێیوە کاریگەر بووە. (ولیام گراهام سیمنەر ١٨٤٠ – ١٩١٠ زانایەکی کۆمەڵناسی ئەمریکییە، لە ساڵی ١٨٦٣ زانکۆی بیلی تەواو کردووە، لە هەمان زانکۆ مامۆستای زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بووە. سەرۆکی

کۆمەڵەی کۆمەڵناسیی ئەمریکی بووە، لە بەناوبانگترین کتێبەکانی نەریتە میللییەکان و زانستی توێژینەوەی کۆمەڵگایە) کاتێك وەردی دەچێتە زانکۆی ئەمریکی تیۆرەکانی سیمنەر دەنگدانەوەیەکی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی هەبووە. ئەو کات ماوەیەکی زۆر بەسەر مردنی سیمنەر تێنەپەڕی بوو. هەروەها ئەم زانایە مامۆستای پرۆفیسۆر هاری مۆر بووە کە مامۆستا بووە لە بەشی کۆمەڵناسی زانکۆی تێکساس و سەرپەرشتیاری تێزەکەی وەردی بووە لە دکتۆراکەیدا، جیا لەوەش زۆر کاریگەر بووە بە سیمنەر و هزرەکەی.

کتێبێکی مەنهەجی کە لەلایەن سیمنەرەوە دانراوە، ناونیشانەکەی بریتییە لە (زانستی توێژینەوەی کۆمەلگا) ئەمەش کۆمەڵێك موحازەرەیە، کە لە پێشەکییەکەی دەڵێ بەمشێوەیە تەواونەکراوە کە خۆی ویستوویەتی. ئەمە ئەو کتێبە مەنهەجییە بووە کە وەردی لەسەری ڕۆیشتووە. وەردی پێی وایە تیۆرەکەی سیمنەر کۆمەلگا ملکەچی کۆمەڵێك یاسای دیاریکراو دەکات. ئەم یاسایانەش لە ڕەفتاری مرۆڤەکەوە سەرچاوە دەگرێت، کە ئەوانیش لەلایەن خۆیانەوە لە میانەی بیرکردنەوە و کولتووری باو و بیروباوەڕە ئایینییەکانەوە پێکدێن. سیمنەر پێی وایە ئەرکی کۆمەڵناسی ئەوەیە توێژینەوە لەبارەی ئەو یاسایانە بکات. مرۆڤ لەسەریەتی کاردانەوەی بۆ ئەم یاسا سروشتیانە هەبێت و ملکەچیان بێت. پێویستە فێری ئەو یاسایانە بێت و گوێڕایەڵیان بێت. ئەگەر هاتوو کەسێك هەوڵی گۆڕینیان بدات یان خۆی لەم یاسایانە داماڵێت ئەوا ڕەفتاری دەستەجەمعی هەوڵی بەتوندی ڕەتی دەکاتەوە.

وەردی دوای گەڕانەوەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەوڵی

دا ئەو تیۆرەی سیمنەر لەبارەی ڕەفتاری دەستەجەمعی ببەزێنێ، وەك چۆن ئەمەی لەگەڵ تیۆری ئیبن خەلدون تاقی کردەوە. سەرەتا لە خۆی دەستی پێکرد، هەوڵی دا بەختی خۆی تاقی بکاتەوە لە ویست و گۆڕانکاری لە بەرامبەر ڕەفتاری دەستەجەمعی کۆمەڵگاکەی، بەڵام وەك دەردەکەوێ سەرکەوتوو نەبوو، بۆیە دەبینین دەڵێ: مرۆڤ کە لەدایك دەبێت هەندێك مەیل و ئارەزووی ئاژەڵیانەی هەیە، هەموو ئەمانە دەخاتە ژێر کاریگەری بەهاکانی شارستانی و کۆتوبەندە کۆمەڵایەتییەکان، بە شێوەیەك منداڵ بۆ ئەوە کۆشش دەکات تەباییەك دروست بکات لە نێوان ئارەزووە کاتییەکانی و ئەوەی کۆمەڵگا لە بەها و نەریتیەکانەوە بەسەری دەسەپێنێ. ئەمەش ململانێیەکی بەردەوامە لە نێوان دوو هێزی پێچەوانەی یەکتر: هێزێکی ئاژەڵیانە کە لە کۆتوبەند تێناگات و درك بە مانا ناکات. هێزەکەی دیکەش کۆمەڵایەتییە هەوڵ دەدات بەسەر هێزە زۆردارەکەی یەکەم زاڵبێت و لە قاڵبی پەسەندکراوی شارستانیەتی بگرێت.

## ئارنۆڵد تۆینبی

وەك دەرکەوێ دکتۆر عەلی وەردی مەزن، بە دووانە زانستییەکان کاریگەر بووە، دووانەی شارستانی و بیابانشینی ئیبن خەلدون، دووانەی هێزە پێچەوانەکانی ولیام سیمنەر، هەروەها بە دووانەی بەها شارستانییەکان کاریگەر بووە کە تۆینبی بە ئاڵەنگاری و کاردانەوە دەستنیشانی کردووە. (ئارنۆڵد تۆینبی ١٨٨٩ – ١٩٧٥ مێژوونووس و زانای کۆمەڵناسی و فەیلەسووفی ئینگلیز، لە زانکۆی ئۆکسفۆرد خوێندوویەتی و سێ ساڵێك کاری تێدا کردووە. تیۆرەکەی ئاڵەنگاری و کاردانەوە لەبارەی بەهاکانی شارستانیەت لە بەناوبانگترین کتێب

باسی کردووە کە ئەویش ناوی توێژینەوە لەبارەی مێـژووەوە–یـە.) تۆینبی لە کتێبە مەزنەکەی بەناوی توێژینەوە لەبارەی مێژووەوە کە دوانـزە بەرگـە، تیـۆری ئـیبن خەلـدونی لـەبارەی بیابانانشـینی و شارستانی وەرگرتووە. چوار بەرگی ئەم کتێبە لەلایەن دکتۆر فوئاد محەمەد شبل وەرگێڕدراوەتـە سـەر زمـانی عـەرەبی. بـەڵام تـۆینبی بیابانانشینییەکەی گۆڕیوە بە کۆمەڵگای سەرەتایی، چونکە پێی وایە سەرجەم ئەم کۆمەڵگایانە لەناوچوون تـەنها حـەوت دانـەیان مـاوە، زۆرینەی ئەم شارستانیەتانەش پشت بە ئایین و نەتـەوە دەبەسـتن، ئەمەش بە بڕوای ئەو بەرەو لەناوچوون دەچێت. سـەرەڕای ئەمـەش تۆینبی بۆچوونی خۆی لەبارەی شارستانیەتی ڕۆژئاوایی دەرنەبڕیوە.

هەروەها تۆینبی تیۆرەکەی زانای دەروونی کارڵ یۆنگی وەرگرتووە لـەبارەی ئاڵـەنگاری و کاردانـەوەی ڕەفتـاری مرۆیـی، ئەمەشـی بـە شێوەیەکی گشتی لەسەر ڕەفتاری کۆمەڵگاکان پراکتیزە کردووە. بە بڕوای ئـەم کۆمـەڵگاکان وەك مـرۆڤ بـە مـاوەی سـاتمەی شارسـتانی تێدەپەڕن، یان نێگەتیڤە یانیش پۆزەتیف. ئەگەر نێگەتیف بوو ئەوا بزاڤی مێژوو وا دەخوازێ کۆمەڵگاکە بۆ ڕابردوو بگەڕێتەوە و گەلەکە دەبێتـە کۆچـبەر و بیابانانشـین، بـەدوای خـواردن و ئـاو و لـەوەڕگا دەگەڕێت. بەڵام ئەگەر هاتوو ساتمەکە پـۆزەتیف بـوو ئـەوا لەسـەر خاکەکەی دەمێنێتەوە و هەوڵ دەدا بەسەری زاڵ بێت و هاوسـەنگی خۆی هەبێت.

تۆینبی هەوڵی داوە نموونە بە شارستانیەتەکانی ڕابردوو بهێنێتەوە، وەك شارسـتانیەتی میزۆپۆتامیـا و شارسـتانیەتی میسـڕی لـە ڕووی کاردانـەوەی پـۆزەتیف و ئاڵـەنگاری بـۆ سـاتمە. شارسـتانیەتی

ئەفرۆئاسیایی  لە باشووری نیمچە دوورگەی عەرەب و بیابانی چین و ئەفریقیا ئەمانەی نموونەی نێگەتیڤن بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ساتمەی شارستانی. بۆیە تۆینبی وای دەبینی کە کۆمەڵە مرۆییەکان لەو ناوچانە لە شێوەی چەند کۆمەڵێکی پەرتەوازە دەژین، بەڵام ژیانێکی پڕ لە ڕەزامەندی لەگەڵ ڕاووشکار و کۆکردنەوەی بەروبوومدا. وەردی ئەم بیرۆکەیەی لە تۆینبی وەرگرتووە، دواتر لە کۆمەڵگاکەی خۆی دایڕشتۆتەوە، بە شێوەیەك هەمان دووانە و هەمان ئەو حاڵەتەیە کە تۆینبی تەرحی کردووە و دواتر وەردی هاتووە چەندین نموونەی لە واقیعی کۆمەڵگا هێناوەتەوە، بۆئەوەی پاڵپشتی ئەو ئەنجامە بکات کە دەیەوێ پێی بگات. وەردیش ئەوەی نەشاردۆتەوە  لە تێزەکانیدا بە تۆینبی کاریگەر بووە.

وەردی لە هەشتا و نۆهەدەکانی سەدەی بیستەمدا، دوای ئەوەی عێراق کەوتە نێو جەنگەکانی بەعسەوە، بە پێچەوانەی ئەو دروشمانەی کە لە سەرتاسەری وڵات بەرزدەکرایەوە و باسیان لە جەنگ و هێز و سەرکەوتن دەکرد بەسەر دوژمن، هەمیشە ئەوەی دووبارە دەکردەوە و دەیگوت: ئەگەر ئەم جەنگانە بەردەوام بێت ئەوا کۆمەڵگا دادەڕووخێت و ئەو سیستەمە ئەخلاقی و ئایدیالە لەدەست دەدات کە پشتی پێ دەبەستێ. ئەمەش تۆینبی پێشتر لە توێژینەوەی مێژوودا ئاماژەی بۆ کردووە: جەنگ هۆکاری جەوهەرییە بۆ داڕووخانی کۆمەڵگا و شارستانیەت. تۆینبی دوور نەڕۆیشتووە کاتێك کۆمەڵگای ئاشووری کۆنی بە نموونە هێناوەتەوە کە دەڵێ: ئاشوور جەستەیەکی داتەپیو بوو، بەڵام چەکدار بوو، بە سادەیی لە بەرامبەر هێرشی مادەکان و بابلییەکان لە سەدەی حەوتەمی بەر لە

زایین کەوت.

لەڕاستیدا ئەوەی کتێبە مەزنەکەی تۆینبی لە مێژوودا بخوێنێتەوە، بۆی دەردەکەوێ کە ئەو هەوڵی داوە ئەم دووانەیەی کۆمەڵگا کە لە بیرکرنەوەی خۆیدا هەبووە بسەلمێنێ ئەمەش لە میانەی چەندین نموونەوە کە دەگاتە ئەو حاڵەتەی فەلسەفەکاری بۆ تێگەیشتنەکانی خۆی دەکات. هەروەها لە هەموو ئەوانەی دەیخوێنیتەوە وەردیت بۆ دەردەکەوێ. وەردیش سەرسامی خۆی بە تۆینبی ناشارێتەوە لەگەڵ هونەرکارییەکەی لە نووسیندا کە بە شێوازێکی نوێ لە چوارچێوەی کۆمەڵناسی نووسیویەتی، کە زۆربەشی لە مێژوو یان لە زانستەکانی دیکەی وەك دەروونناسی و فەلسەفە وەرگرتووە.

## دیل کارنگی

وەردی هەمیشە ئەوەی دووبارە دەکردەوە ئەوەی بیەوێ چۆن مامەڵە لەگەڵ خەڵك بکات ئەوە دەبێت کتێبی (چۆن هاورێ پەیدا دەکەین) بخوێنێتەوە کە لەلایەن دیل کارنگی نووسراوە (دیل کارنگی ١٨٨٨ – ١٩٥٥ لە نیویۆرك لەدایك بووە، نووسەرێکی ئەمریکییە و خاوەن پرۆژەی وانە بەناوبانگەکانە لە پێشخستنی خوددا، بەڕێوەبەری پەیمانگای کارنگییە بۆ پەیوەندییە مرۆییەکان.) وەردی بەو شێوازانە مامەڵەی لەگەڵ کۆمەڵگای عێراقی کردووە کە دیل کارنگی پێشنیاری کردووە، بۆچوونی خۆی لەبارەی ئەو کۆمەڵگایە داوە کە بۆ وەردی قین لە دڵ بووە. وەردی لە خۆی نەترساوە، بەڵکو دڵخۆش بوو بەوەی کە نەیاری زۆر بوو. دیل کارنگی دەڵێ: ئەوەت لەبیر بێت کەس جووتە لە سەگێکی تۆپیو نادات. هەرچەندە سەگەکە گرنگ بێت ئەوا خەڵکەکە قەناعەتی زیاتر دەبێت لێی بدات. ئەگەر تۆ

مەیلی نیگەرانیت هەیە بەهۆی ڕەخنەیەکی نادادپەروەرانە، دەبێت پەیڕەوی ئەو ڕێسایە بکەیت: ئەوەت لەبیر بێت کەس جووتە لە سەگێکی تۆپیو نادات، ئەم کارە بکە و ڕەخنەی خەڵك ئازارت نادات کە بیر لە من و تۆ ناکاتەوە، یانیش بایەخ بەوە نادەن چی لەبارەی ئێمەوە دەگوترێت، بەڵکو ئەوان بیر لە خۆیان دەکەنەوە، ئەوان بایەخ بە ئازارێکی سەریان دەدەن هەزار جار زیاتر لەوەی بایەخ بە هەواڵی مردنی من و تۆ بدەن. تەنانەت ئەگەر هاتوو فریودراین، یان درۆ لەبارەی ئێمە بڵاوکرایەوە، لە پشتەوە زەبرمان بەرکەوت، لەلایەن نزیکترین هاوڕێیەوە بخرێینە ڕووبارێکەوە. با خۆمان لە نقوومبوون بەدوور بگرین، لەبری ئەوەی شیوەن بۆ خۆمان بکەین. ئایا ڕێگە بە تۆمەتبارکردنی پووچەڵ دەدەیت کار لە تۆ بکات.

وەردی باوەڕی بەو ڕێسایانە هەبوو، پراکتیزەی کرد. دواتریش لە هیچ شتێك نەدەترسا وەك ئەوەی بڵێ"تۆفانێك بەدوامەوەیە". زۆر بەچڕی ئەو قەناعەتەم لەلای وەردی بینی. ئەو باکی نەبوو لەسەر بۆچوونەکانی بکوژرێت و تیرۆر بکرێت. لەوە ئاگادارم کردەوە، کەچی وتی" لەوە چاکتر نییە ناوم بچێتە ڕیزی ئەو زانا شەهیدانەی کە لە بەرامبەر کۆمەڵگا و دەسەڵاتی زۆردار داکۆکییان لە بۆچوونەکانی خۆیان کردووە". وەردی بەمە وتەکانی دیل کارنگی پەیڕەو دەکرد کە لە کتێبە بەناوبانگەکەی هاتووە و دەڵێ: "سەیرکە چی بەسەر سوکرات هات، ئایا پێشبینی چاکتر دەکەیت، لە دادگا نیوەی قوتابیەکانی لە دژی وەستانەوە، بۆیە بڕیار درا ژەهری تێکەڵ بە هەنگوین بخواتەوە. کەواتە هەموو کۆششی خۆت بکە، دەست بە چەترە کۆنەکەت بگرە بۆئەوەی بارانی ڕەخنەکان نەڕژێتە ناختەوە".

هـەر یـەکێك وەردی بخوێنێتـەوە دەزانـێ یـەکێك لـە بابەتـە سەرەکییەکانی لە بواری ناسینی کەسێتیی مرۆیی، لە خودپەرستی دەست پێدەکات. مرۆڤ بە سروشتەکەی، خۆی زیاتر لە کەسانی دیکە خۆشتر دەوێ. لەڕاستیدا ئەو ڕەخنە ناگرێت بەڵکو دەزانێ شتەکان لەگەڵ مەیل و ئارەزووی ئەو (من) ە نییە کە لە ناخی دایە. ئەمەش دەقی وتەکەی کارنگییە کە دەڵێ: لە خودی خۆت دەست پێبکە، لە خودپەرستییەوە. براونگ دەڵێ: کاتێك مرۆڤ پێچەوانەی خودی خۆی دەبێت بەهای دەبێت، بەڵام ئەمە کاتێك دەخایەنێ دواتـر دەتوانـێ ئەوانیتر بگۆڕێت. کۆنفۆشیۆس دەڵێ: لـەو بـەفرە پەسـت مەبـە کـە لەسەر بانی ماڵی دراوسێکەت کەوتووە، کاتێـك حەوشـەی ماڵەکـەی خۆت پڕ لە بەفرە.

## ولیام ئوگبێرن

(ولیـام ئـوگبێرن لـە سـاڵی ١٨٨٦ لـەدایك بـووە، لـە سـاڵی ١٩٥٩ مردووە. ڕابەری قوتابخانەی ئەمریکییە لـە کۆمەڵناسـیدا. سـەرۆکی کۆمەڵەی کۆمەڵناسیی ئەمریکی بوو لە ساڵی ١٩٢٩. بایەخی سەرەکی بە توێژینەوەی پرۆسەکانی گـۆڕانی کۆمەڵایـەتی دەدا.) دووانەکـەی ئوگبێرن بۆ وەردی گونجاو بوو، وەردی لەسەر دووانەکان پەروەردە بووە، هەندێك جار لـە سـەر دووانـە تـەباکان و زۆربـەی کاتـەکانیش لەسەر دووانە ناکۆکەکان کاری کردووە. ئەو کاتەی وەردی گەیشـتە ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا هێشـتا تیۆرەکـەی ئـوگبێرن لـە فەلسـەفەی کۆمەڵناسـی سـارد نەبۆتـەوە. ئـوگبێرن لـە توێژینـەوە بەناوبانگەکەی لـەبارەی پرۆسـەکانی گـۆڕانی کۆمەڵایـەتی، بۆشـایی کولتووری پێشخست. ئەم تیۆرەش وەك پاڵپشتێك بوو بۆ ئەو کارەی

کە وەردی بە دووفاقی لە کەسێتی و ناهاوسەنگی کۆمەڵایەتی ناوی دەبات. کارەکە لەلای ئۆگبێرن لە تێکەڵکردنی زاراوە و چەمکەکان بەوە ئاسان بوو، کاتێك زاراوەیەکی تەواوکاریی بەکارهێنا، ئەویش زاراوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی بوو. ئەمەش کاری وەردی ئاسان کرد لە هەڵبژاردنی زاراوەی دووفاقی و ناهاوسەنگی لە بونیادی گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا.

بۆ ڕوونکردنەوە دەڵێم ئۆگبێرن بە زاراوە نوێیەکەی کێشەی تێکەڵبوونی زاراوە و چەمکەکانی چارەسەر کرد، کە هەموویان لە نێوەخنی چەمکی گۆڕانی کۆمەڵایەتی گشتگیر بوون، کە تێکەڵکردن لەنێو ئەو چەمکانە دروست دەبوو: شۆڕشی کۆمەڵایەتی، ڕیفۆرمی کۆمەڵایەتی، گەشەی کۆمەڵایەتی، پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، شارستانیبوون و گەشەکردن. دواجار ئۆگبێرن هەموو ئەم چەمکانەی لە چوارچێوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی کۆکردەوە.

لە چوارچێوەی ئەم چەمکە ئەو زانایە قسەی لە دیاردەی گۆڕان و جووڵە کرد. ئەم دیاردەیەشی بە دیاردەیەکی هەمیشەیی و بەرجەستە و بەردەوام زانی. بابەتی گۆڕان و جووڵە کاریگەرییەکی زۆری بەسەر فیکری وەردی هەبوو. تەنانەت لە هەموو کتێبەکانی ئەم بیرۆکەیە دەدۆزینەوە. بەمەش ئۆگبێرن بیرۆکەی گۆڕانی لە بیرکردنەوەی مرۆیی هێنایەوە ڕیزی پێشەوە. بە شێوەیەکی گشتی لەوەتەی شارستانیەتی مرۆڤایەتی دەرکەوتووە، تا ئەمڕۆ، هەموو بیرمەندان بە تێڕوانین و تێگەیشتنی جیاواز لەسەر چەمکی گۆڕانی کۆمەڵایەتی کۆك بوون. بەڵام ئەوەی ئۆگبێرن باسی کردووە ئەوەیە گۆڕان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، بێگومان یەکەم کەس بوو بەمشێوەیە پێشنیازی

کردووە. کۆمەڵگا بە سروشتی خۆی گۆڕاوە، لە نەوەی کۆن هەندێك لایەنی کولتووی وەردەگرێت و دواتریش بەپێی واقیعی کۆمەڵایەتی و پێداویستییەکان زێدەی دەکات. ئەمەش بەپێی ئاراستە فیکری و ئایدیۆلۆژییەکانی هەر کۆمەڵگایەك دەبێت. لە میانەی ئەم بیرۆکەیەوە وەردی، ئـوگبێرنی خوێندۆتـەوە، گەیشـتۆتە ئـەو ئەنجامـە کـە گۆڕانکاریی بە هەڕەمەکی ڕوونادات، بـەبێ ڕێنماییـەکی وشـیارانە، بەڵکو بەپێی پلانێکی دانراو دەبێت. واتە گۆڕانکاریی مەبەستدار و بە ویسـتی مرۆڤـە بۆیـە لـە سـەردەمی ئێسـتادا کۆمـەڵگاکان ڕێبـاز و هۆکارەکانیان نوێ دەکەنـەوە لـەپێناو ئـەوەی پرۆسـەی گـۆڕان بـە شێوەیەکی گشتی ببێتـە هـۆی هێنانـەدی گەشـەپێدان. لـەو کاتـەدا پێویست بەوە دەکات بابەتیانە چەمکی گۆڕان دیـار بکرێـت، لەگـەڵ دیـارکردنی میکـانیزم و جـۆر و ئاراسـتەکانی، سـەرەڕای دیـارکردنی بەربەستەکانی. کە هەموو ئەمانە دەبنە قووڵبونەوەی تێگەیشتن لـە دیاردەی گۆڕان.

ئـوگبێرن گـۆڕانی کۆمەڵایـەتی بـەوە پێناسـە کـرووە: بریتییـە لـە جێگۆڕکێیەك کە لەنێوان بونیاد و ئەرکی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان ڕوودەدا. واتە ئەو گۆڕانەی لە بونیادی کۆمەڵایەتی و بەها و نەریت و ڕۆڵـەکان ڕوودەدات لـە ماوەیـەکی زەمەنیـدا. ئەمـەش هـەموو گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە، جا سنووردار بێت یان فراوان، لە دیاردە ماددییەکان بێت یان مەعنەوییەکان. بەلای خوێنەر شاراوە نییە ئەم تیۆرە لەلای وەردی بنەما زانستییەکەی بیرۆکەی سروشتی کۆمەڵگای عێراقی بوو. وەردی لە میانەی ئـەزموونی خـۆی چـەندین نموونەی بۆ زیاد کـردووە بـۆ بـەهێزکردنی تیۆرەکـە. دەکرێـت ئـەم

کارەش بە پێشبینی وەردی دابنرێت بۆ کۆمەڵگای عێراقی، کە لە سایەی تیۆرە زانستییەکانی پێشبینی ڕۆژگاری خراپتری بۆ عێراق کردووە، دوای ماوەیەکیش هەر ئەمە ڕوویدا!

## لە توێژینەوە سیاسی کۆمەڵایەتی کاریگەر بووە بەو بیرمەندانە

ئەگەر وا ڕێک دەکەوێت کەسێك لە دە ساڵەی کۆتایی تەمەنی وەردی، گوێی لەو پیاوە دەگرت کە باسی سیاسەت و کۆمەڵگای دەکرد، ئەوا گوێبیستی دووبارەبوونەوەی وتە نەمرەکەی دەکرد: سیاسەت هونەری ئەگەرە ڕەخساوەکانە. دکتۆر وەردی لە سیاسەت پڕاگماتی بوو. بە موحازەرەیەکی تەواو لە مەجلیسی خاقانی داکۆکی لە میکیاڤیللی و کتێبی (میر) کرد. وەردی دەیگوت پانتاییەکی پڕ لە بەرژەوەندی لەبەردەم هەر سیاسییەك هەیە، دەبێت بەپێی بارودۆخ و شوێن هەل بقۆزێتەوە، بۆئەوەی سەرکەوتوو بێت. لە سیاسەت دۆستایەتی هەمیشەیی و دوژمنایەتی هەمیشەیی نییە، بەڵکو بەرژەوەندی هەمیشەیی هەیە. ئەمەش تەواو لە گەڵ پراگماتیزم یەك دەگرێتەوە. وشەی pragmatism ی ئەورووپی لە وشەی pragma ی یۆنانی وەرگیراوە کە بە مانای (کار) دێت. ڕێبازی پراگماتیزم لە سەدەی نۆزدەم دەرکەوت. بەپێی تێڕوانینی ئەم ڕێبازە: پێوەری دروستی بابەتێك ئەنجامی کردەییە، نەوەك هاوڕێکی لەگەڵ واقیعدا. پێوەری هەقیقەت ئەوەیە بیرۆکەکە لە ڕووی کردەیی سەرکەوتوو بێت. هەقیقەتی بیرۆکە و ڕاستگۆییەکەی بە ئەنجامە کردەییەکان دەبەستێتەوە، لەگەڵ ڕەزامەندی و بەرژەوەندی.

هەقیقەت جۆراوجۆرە و ڕێژەییيە.

لەپێناو دادپەروەری لەگەڵ عەلی وەردی، لە ناسینی ئاڕاستەی فیکری سیاسی ئەو، دەبێت باسی ئەوە بکرێت سەرەڕای ئەوەی سەرسام بوو بە میکیاڤیللی کە وتەیەکی بەناوبانگی هەیە دەڵێ" ئامانج پاساو بۆ هۆکارەکان دەهێنێتەوە" (**الغاية تبرر الوسيلة**) ئەخلاقیشی لە سیاسەت بەدوور خستۆتەوە. کەچی لە هەندێك بابەتی سەرەکی وەردی لەگەڵ بیرکردنەوەی ئەم بیرمەندە تەبا نەبوو. وەردی کە پێنج سەدە دوای میکیاڤیللی ژیاوە بە شێوەیەکی ڕوونتر لە بەڕێوەبردنی دەوڵەت دەگەیشت. ئەویش باوەڕهێنان بوو بە لیبڕالیزمی سیاسی کە پێی وابوو لە میانەی پرەنسیپی پراگماتییەوە پەیڕەو دەکرێت. هەمیشە لە کتێبەکانی دەیگوت و دووبارەی دەکردەوە، سیاسەت شوێنێکی دروست نییە بۆ ئەو کەسانەی خاوەن مەبدەئی ئاکار بن. چونکە هیچ مەبدەئێك لە سیاسەت نییە، بەڵکو بەرژەوەندی تەوەری سیاسەتە، جا چۆن خاوەن مەبدەئەکان شوێنیان دەبێتەوە. کەواتە وەردی بەو سیفەتە بە تێزەکانی میکیاڤیللی کاریگەر بوو کە واقعییە. بەڵام لەلایەن خۆشیەوە لیبراڵیزم و پراگماتی بۆ زیاد کرد کە ئەو پرەنسیپانەن ناکرێت کەسێکی سیاسی سەرپێچییان بکات.

## میکیاڤیللی

وەردی بە شێوەیەکی ڕۆشن بە تێزەکانی میکیاڤیللی کاریگەر بوو (نیکۆلا میکیاڤیللی لە ساڵی ١٤٦٩ لەدایك بووە و لە ساڵی ١٥٢٧ مردووە. لە ئیتاڵیا لەدایك بووە لە حکومەت کاری کردووە، تا دواجار گەیشتە پۆستی سکرتێری یەکەم لە حکومەتی فلۆرەنسا. کتێبی

(میر) ی پێشکەش بە فەرمانڕەوا گەنجەکەی میدچی کردووە. لەگەڵ میکیاڤیللی فەلەسەفەی سیاسی لە سەدەی نوێ دەست پێدەکات. بەڵام دواجار بە دەستی پاپا دوورخرایەوە و لە کێڵگەکەی مرد.) میکیاڤیللی پێی وایە کۆمەڵگا بە هۆکاری سروشتییەکان پێشدەکەوێت. هێزە بزوێنەرەکانی کۆمەڵگا بریتین لە بەرژەوەندی ماددی و دەسەڵات. لە پەیوەندی دەسەڵاتدار و گەل ئامانج پاساو بۆ هۆکارەکان دەهێنێتەوە. بە شێوەیەک فەرمانڕەوا دەتوانێ پشێوی گەل سەرکوت بکات لەپێناو پاراستنی دەسەڵاتەکەی خۆی. وەردی داکۆکی لەو بیرۆکەیە کردووە، بەو بڕوایەی بۆ سەردەمی میکیاڤیللی دەگونجا، لەوانەیە بەرژەوەندی سیاسی ئەو وایکردبێ بەمشێوەیە بدوێ. وەردی وتی: میکیاڤیللی پێشبینی کردووە ئەم بیرۆکەیە دوای ماوەیەک باو نەبێت، چونکە هۆکارە سروشتییەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵگای ئەم بیرۆکەیە پووچەڵ دەکەنەوە. وەردی پشتگیری بۆچوونی میکیاڤیللی دەکات لەوەی ڕیفۆرمخوازەکان دوو جۆرن: جۆرێکیان هەوڵی ڕاکێشانی کەسانی دیکە دەدات لەپێناو چاکسازی. جۆرەکەی دیکە پشت بە هێز و دەسەڵاتی دەبەستێ. ئەوەی دووەم بەدەگمەن نوشستی دەهێنێ. بەهێزترین بەڵگەش ئەوەیە پێغەمبەرە چەکدارەکان سەرکەوتن کەچی ئەو پێغەمبەرانەی چەکدار نەبوون سەرنەکەوتن! وەردی ڕۆژێکیان لە کۆڕێکی زانکۆی کوفە وتی: پێغەمبەر محەمەد بەر لەوەی چەک هەڵبگرێت کەسی لەگەڵ نەبوو، یارانی لە سەرەتای بانگەواز لە حەوت کەس زیاتر نەبوو. وەردی ویستی گاڵتە لەگەڵ جەماوەرەکە بکات وتی: ئەگەر من ئێستا بۆ دەرەوە بانگتان بکەم، حەوت کەسم لەگەڵ نابێت! فەرمانڕەوا لەلای

میکیافیللی دیکتاتۆرێك نییە شەیدای هێز بێت، بەڵکو یاریزانی شەترەنجی سیاسییە و بە هەموو حسێبی خۆی دەزانێ. ئامانجی ئەو سەپاندنی دەسەڵاتەکەیەتی، بۆیە گرنگترین ڕێسا پەیوەندی ئەوە بە گەلەکەیەوە. دەبێت تۆقێنەر بێت، بێئەوەی بێزراو بێت. چونکە ڕق ستەمکاریی دروست دەکات، ڕقبوونەوە لە لاوازی دێت، ئەمەش هەڕەشە لە دەسەڵاتدار دەکات. وەردی پێی وابوو مەلیك فەیسەڵی یەکەم نموونەی دەسەڵاتدارێکی سیاسی سەرکەتوو بوو، یاریزانێکی شەترەنجی سیاسی بوو بە هەموو حسێبەکانی خۆی دەزانی.

میکیافیللی پێی وایە دەوڵەت قەوارەیەکی ڕێکخراوە لەلایەن خودی خەڵکەکە دانراوە، دەوڵەت هەوڵ دەدات بێ چاویلکەی ئاکاری سەیری کاری سیاسی بکات. لەگەڵ ئەوەشدا میکیافیللی ئەمەی بە کارێکی نائاکاری نەدەزانی، بەڵکو پێی وایە لەگەڵ بەها ئاکارییەکان یەکناگرێتەوە. ئەو نایەوێ بە شێوازێکی هۆشیارانە و بەئەنقەست گومان لە ئاکار بکات، بەڵکو لە دەرەوەی فەلسەفەی سیاسی خۆی دەیهێڵێتەوە. لەلایەکی دیکەوە پێی وابوو دەبێت دەسەڵاتدار فێڵبازی ڕێوی و هێزی شێری هەبێت، تا بتوانێ سەرکەوتن و زاڵبوون بەدەست بهێنێ. نابێت ڕەچاوی پەیمانێك بکات لە بەرژەوەندی ئەو نییە، نابێت لە بەڵێنێك بەردەوام بێت هۆکارەکەی بەسەرچووە. ئەگەر هاتوو لەوە ترسا پێی بگوترێت شەڕانگێز، ئەم وەسفە تەنها کاتێك دروستە کە هەموو خەڵکەکە چاکەخواز بێت. وەردی زیاتر لە جارێك وتوویەتی سیاسەت بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتە بەگوێرەی بەرژەوەندی. چەندین نموونەی بۆ پاڵپشتی تیۆرەکەی هێناوەتەوە، لە سەرەتای ئیسلام و سەردەمی ڕاشیدیەکان و ئەو ئاژاوەیەی ئەو کاتە بەرپابوو.

وەردی باسی ئەوەی کردووە کە چۆن دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسییەکان توانیان چەند سەدەیەك حوکمڕانی بکەن، بەهۆی پەیڕەوکردنی ڕێبازی بەرژەوەندی و هێز.

## جۆن ستیوارت میل

لیبڕالیەتی سیاسی و پراگماتیزم، لە چواچێوەی دیموکراسیدا، چارەسەری نموونەییە کە مرۆڤایەتی لەسەری تەبایە. سیاسەت قبوڵی ئایدیال و ئەخلاق ناکات، ئەمانە پوختەی بۆچوونەکانی وەردی بوو لەبارەی سیاسەتەوە. وەردی بە جۆن ستیوارت میل کاریگەر بوو. (میل لە ساڵی ١٨٠٦ لەدایك بووە، لە ساڵی ١٨٧٣ مردووە، فەیلەسووفێکی کۆمەڵایەتی بەریتانییە، لە پێشەنگی لۆژیکی ئیستقرا بوو، لە کتێبەکانی (بنەماکانی ئابووریی سیاسی) (لەبارەی ئازادییەوە) ئەمەیان بەناوبانگترین کتێبەکانیەتی، کە لەلایەن دکتۆر عەبدوڵڵا ئەمین غەیس وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی. لەگەڵ کتێبی (بنەماکانی لیبڕالیزم) کە لەلایەن ئیمام عەبدولفەتاح وەرگێڕدراوەتە سەر عەرەبی و کتێبێکی دیکەش بەناوی (بەکۆیلەکردنی ئافرەتان) ). میل لە کتێبەکەی لەبارەی ئازداییەوە پێی وایە ئەوەی ڕکابەریی سەربەستانە کۆتوبەند بکات، ئەوا خراپەیەکی ڕەهایە، ئەوەی دەرگای بۆ بکاتەوە ئەمە چاکەیە. هەروەها میل دەڵێ: ئەگەر هەموو مرۆڤ لەسەر بۆچوونێك بوون، تەنها کەسێك لەگەڵیان نەبوو، ئەوا ناتوانن بێدەنگی بکەن. بە هەمان شێوەیش ئەو کەسە ناتوانێ ئەوان بێدەنگ بکات، هەرچەندە هێز و دەسەڵاتیشی هەبێت. چونکە ئەگەر ئێمە دەنگێکمان کپ کرد ئەوا

هەقیقەت بێدەنگ دەکەین. لەوانەیە بۆچوونی هەڵە لە ڕەهەندەکانی خۆیدا هەقیقەتی شاراوەی هەبێت. ئەو بۆچوونەی خەڵکیش لەسەری کۆکن ناکرێت لەسەر بنەمای عەقڵی قبووڵ بکرێت تەنها ئەوکاتە نەبێت کە دەخرێتە بواری تاقیکردنەوە و پشکنینەوە. ئەگەر ئەم بۆچوونەش ناوەناوە ڕووبەڕووی ئاڵەنگاری نەبێتەوە ئەوا گرنگی و کاریگەرییەکەی لەدەست دەدات. چونکە ڕەفتاری مرۆیی شتێك نییە تەنها ئەنجامی کاریگەرییەکی ژینگە نەبێت بەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگاوە.

وەردی دەڵێ: عەقڵی مرۆیی بە شێوەیەکی گشتی ناتوانێت بە تێڕوانینێکی بێلایەنانەی ڕەها سەیری بابەتەکان بکات، چونکە چەندین هۆکاری نەست هەیە، بێئەوەی درکی پێ بکات کاریگەری بەسەر بیرکردنەوەی دەبێت، لەوانە: ئەو بیروباوەڕەی لەسەری پەروەردە بووە، بەرژەوەندی، خۆویستی، سنووری مەعریفەکەی، ئەزموونی لەبیرکراو، گرێی دەروونی و چەندین هۆکاری دیکە. جا مرۆڤ کاتێك بیردەکاتەوە وا وێنای خۆی دەکات کە لە بیرکردنەوەکەی ئازادییەکی ڕەهای هەیە، چونکە نازانێ چەندین هۆکاری نەستی هەیە کاریگەرییان بەسەر عەقڵیەوە هەیە. ئەگەر کەسێك پێچەوانەی ئێمە بێت ئەوا بە دەمارگیر و کەللەڕەق و نەزان وەسفی دەکەین، ناشزانین ئەویش لەلایەن خۆیەوە بە هەمان ئەو تۆمەتانە تۆمەتبارمان دەکات. هەر ئەمەشە قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ کردووە کە دەفەرموێ" کل حزب بما لدیهم فرحون". کەچی لەسەر ئێمە پێویستە ڕێز لە هەموو بۆچوونێك بگرین.

جۆن ستیوارت میل پێی وایە، کۆمەڵگای ئازاد بە کاریگەری زۆرینە بەسەر کەمینە جیاناکرێتەوە، بەڵکو بەوە جیادەکرێتەوە کە

پارێزگاری لەو کەسانە دەکات کە پێچەوانەی زۆرینەن، ناوەندی ئەم پاراستنەش ئازادی مرۆڤە. تاکە ئامانج کە وا دەکات مرۆڤ پابەند بێت بە پاساوە، ئەوەیە زیان لە کەسانی دیکە دووربخاتەوە. دکتۆر وەردی لە هەموو تێزە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی لەگەڵ میل هاوڕا بوو، بەتایبەتی کە دەڵێ: با گریمانەی ئەوە بکەین بۆچوونی پێچەوانە هەڵەیە، کەواتە دەبێت ڕێگای پێ بدرێت گوزارشت لە خۆی بکات، ئەمەش ناچارمان دەکات کە بەدوای پاساوی چاکتر بگەڕێین بۆ بۆچوونەکەمان. بەمەش لە بانگەشەکردن بۆ هەقیقەت بە ئاشکرا بەڵگەی چاکترمان دەبێت. دووەم با گریمانەی ئەوە بکەین بۆچوونی پێچەوانە ڕاست و دروستە، کەواتە شایەنی گوێگرتنە، چونکە لە هەڵە دوورمان دەکاتەوە. سێیەم ئەگەر بۆچوونی پێچەوانە بەشێکی هەڵەیە و بەشێکی دروستە، کەواتە بەهەرحاڵ گەیشتن بە هەقیقەت لە میانەی ئاشکرا دەرخستنی بەڵگە و پاساوە خوازراوەکان دەبێت.

## کاریگەر بوو بە میتۆدی توێژینەوەی ئەم کەسانە:

کورتە بابەتێک دەربارەی میتۆد: بەر لەوەی بچمە ناو بابەتی میکانیزمی توێژینەوە و میتۆدەکانی توێژینەوە، حەز دەکەم بۆ خوێنەری گشتی بابەتی میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی ڕوون بکەمەوە، مانای میتۆدی توێژینەوە چییە کە نووسەرێک لە توێژینەوەکەی پشتی پێ دەبەستێ؟ زانست وەها پێناسەی میتۆد (ڕێبازی توێژینەوە) دەکات: بریتییە لە کۆمەڵێک ڕێسای گشتی و شێوازی کردەیی کە توێژەر لە چارەسەرکردنی کێشەکانی توێژینەوەکەی پشتیان پێ دەبەستێ و بەپێی پلانێکی ڕێکوپێک بۆ بابەتەکەی لەسەری دەڕوات. دواتر بەشەکانی دەردەخات و دەچێتە

بنج و بنەوانی بابەتەکەی و تاوتوێی دەکات و شرۆڤەی دەکات. بەڵگە بۆ بابەتەکەی دەهێنێتەوە و هەندێکیانی بە دروست دەزانێ، لۆژیکی بەڵگەسازی و ئەنجامسازی بەکاردەهێنێ. کەواتە میتۆدەکان شێوازی توێژینەوە و بەکارهێنانی زاراوەکانە کە زانایان لە توێژینەوەکانیان بەکاریان دەهێنن. ئەمانەش شیاوی ڕەخنەگرتن و هەڵسەنگاندنن، دەکرێت گۆڕانکارییان تێدا بکرێت و پێش بخرێت. میتۆدی لێکۆڵینەوەش لە زانستێکەوە بۆ زانستێکی دیکە جیاوازی هەیە.

زانستی کۆمەڵناسی لە توێژینەوەی کۆمەلایەتیدا کۆمەڵێك میتۆدی خۆی هەیە، کە لە زانستەکانی دیکە جیاوازە. کۆمەڵناسی هەموو میتۆدەکانی خۆی وەك ئەزموونی و مێژوویی و بەراوردکاری و بونیادگەری و هەڵوەشاندنەوە وەردەگرێت. لە میانەی ئەمانەوە توێژینەوە شێوازی زانیاری و وەسفی و شرۆڤەکاری و ڕەخنەیی ئەنجام دەدات. لەگەڵ بەکارهێنانی شێوازەکانی چەندێتی و چۆنیەتی یان تێکەڵکردنی هەردوو شێواز. سەرچاوەکانیشی لە مەیدانی پراکتیزەکردن وەردەگرێت، وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی توێژینەوەکەی. ئەمە لەگەڵ بەکارهێنانی سەرچاوەی ناڕاستەوخۆ و خوێندنەوەی هەڵبژاردە بۆ پاڵپشتی توێژینەوەکەی. دواتریش هەموو داتاکان کۆدەکاتەوە و بەراوردیان دەکات و تاوتوێی حاڵەتەکان دەکات و پێوەری کۆمەلایەتی بەکاردەهێنێ.

ئەگەر خوێندنەوەیەکی بەدیقەت و بێلایەنانە بۆ ئەو نووسینانە بکەین کە وەردی نووسیویەتی، بۆمان دەسەلمێت وەردی میتۆدەکانی توێژینەوەی زانستی بەوپەڕی کاملی بەکارهێناوە. ئەمەش لە میانەی بەکارهێنانی میتۆدێکی جۆریی بووە کە بە شێوەی

ئاساییەکەی خۆیان وەسفی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەکات، بایەخ بە بیروڕاکان دەدات، لەگەڵ ئەزموون و بەرخودە مرۆییەکان بەراوردیان دەکات کە بە هەموویانەوە چەندین داتای ئەوتۆمان پێدەدات ئەگەر هاتوو بە چاوێکی لایەنگرانە سەیری ئەو داتایانە بکەین، لەوانەیە داتاکان بە نابابەتیانە دەربکەون، بۆیە دەبینین وەردی لێکدانەوە و شرۆڤەکاری ئەنجام دەدات، شێوازی توێژینەوەکەی لەناو خەڵك ڕوون دەکاتەوە ئەمەش شێوازێکە لە توێژینەوە مرۆییەکان بە کاری مەیدانی ناوی دەبەین.

وەردی لەگەڵ خۆی و کۆمەڵگاکەی ڕاستگۆ بوو، ئەو ئەنجامەی پێی دەگەیشت بە (گریمانە) ناوی دەبرد و دەیگوت شیاوی گۆڕانکاری و گۆڕینەوەیە. چونکە دانانی تیۆری کامڵ پێویستی بە داتای ورد و ئەنجامی ورد هەیە، لە میانەی داتا و شێوازی ئیستقرایی زانستی دەکرێت تیۆر دابنرێت. وەردی نەیتوانی لە توێژینەوە زانستییەکان بگاتە دامەزراندنی تیۆرێك. ئەمەش بەهۆی نەبوونی متمانە بوو بە داتا سەرەتاییەکان و شێوازی هەڵێنجانی داتاکان و ئەنجامی کاری مەیدانی کە خۆی لە پێشەکی توێژینەوەکانی گومانی لێ کردووە، بۆ دووفاقی خەڵکەکەی گێڕاوەتەوە. کەواتە وەردی لە میانەی ئەو میکانیزمانەی لە توێژینەوە لەبەر دەستی دابوو، شێوازێکی هەڵبژاردووە، تێبینی جۆریی بەکاردەهێنێ، لەگەڵ پۆلین کردن، تێبینییەکانی خۆی بە شێوەیەکی ئاسایی و ئاسان تۆمار دەکات و وێنەی واقیع دەگوازێتەوە، دوای کۆکردنەوەی زانیارییەکان و شرۆڤەکردنیان، ئەنجامەکان دەردەخات.

دکتۆر عەلی وەردی لە توێژینەوە کۆمەڵایەتی و فەلسەفەییەکان

سەرسام بوو بەو بیرمەندانەی کە خاوەن تێزی دوو ڕەهەندی بوون (ئێمە لێرەدا بە دووانەیی ناویان دەبەین- وەرگێڕ) وەك بیرۆکەی بیابانشینی و شارستانی لەلای ئیبن خەلدون، کۆمەڵگای سەرەتایی و کۆمەڵگای مەدەنی لای سیمنەر، یان دووانەی کاردانەوە و ئاڵەنگاری لەلای تۆینبی، کە پێشتر لە پێشەکی ئەم بەشەدا ئاماژەمان بۆ کردووە. جا وەردی ئەوەی هەڵبژاردووە کە لەگەڵ کۆمەڵگای عێراق دەگونجێ، بۆئەوەی ڕێبازێك دابنێ لەسەری بڕوات و میکانیزمی توێژینەوەی تێدا پراکتیزە بکات.

جیا لەمەش وەردی پشتی بە هەموو ئەم دووانە فەلسەفەی و کۆمەڵایەتییانە نەبەستووە کە بیرمەندانی ڕۆژئاوا پێشنیازیان کردووە، تا بیانکات بە میتۆدێك لەسەری بڕوات و میکانیزمەکانیان بەکاربهێنێ. بەڵکو لەبری ئەو کارە، ئەو شتەی هەڵبژاردووە، کە لەگەڵی دەگونجێ. بۆ نموونە پشتی بە پۆلینکردنەکەی دووانەکەی فیرناند توێنز نەبەستووە کە کۆمەڵگا بۆ دوو جەمسەر پۆلین دەکات، یەکێك لە جەمسەرەکان کۆمەڵگای سەرەتاییە کە پەیوەندی سەرەتایی و خزمایەتی بەسەری زاڵە. جەمسەری دووەم ئەو کۆمەڵگایەیە کە پەیوەندی لاوەکی و گرێبەستانەی تێدا بڵاو دەبێتەوە. هەروەها کاریگەر نەبووە بە دووانەکەی ماکس ڤێبەر لە پۆلینکردنی نموونە تەقلیدی و نموونە عەقڵانییەکان. نە سوودی لە دووانەکەی سورکینیش وەرگرتووە لە خێزان و گرێبەستانە، یان دووانەکەی هوارد لە نموونەی پیرۆز و نموونەی عەلمانی، یان دووانەکەی ڕۆبێرت ڕدفیلد لە کۆمەڵگای میللی و کۆمەڵگای شارستانی. بۆیە دوای وردبوونەوەیەکی زانستییانە تێبینی ئەوەم کردووە میتۆدی وەردی و

میکانیزمی توێژینەوەکانی لەسەر سێ شت وەستاوە چوارەمیان نییە. ئەمە تا ئەو کاتەی قوتابییەکی دیکەی وەردی توێژینەوەیەکی قووڵتر لەو توێژینەوەی من ئەنجام دەدات، تا کاریگەرییەکی دیکەی وەردی دەردەخات بە میتۆدی دیکە.

## تالکۆت بارسۆنز

عەلی وەردی بە میتۆدی تالکۆت بارسۆنز کاریگەر بووە (تالکۆت بارسۆنز لە ساڵی ۱۹۰۲ لەدایك بووە، لە ساڵی ۱۹۷۹ مردووە. یەکێکە لە کۆمەڵناسە هاوچەرخەکان کە تیۆرەکانی لە بواری کۆمەڵناسیدا دەنگدانەوەی لە ئەمریکا و ئەوروپا هەبوو. نووسینەکانی جۆراوجۆرن، چەندین بوار دەگرێتەوە لە گرنگترین کتێبەکانی (داهێنراو و دژەکان لە کۆمەڵناسیدا) لەم کتێبەدا ڕەخنەی لە هەندێك زانایانی کۆمەڵناسی گرتووە. تیۆرە گرنگەکەی بارسۆنز لە کتێبی (بونیادی کاری کۆمەڵایەتی) دەرکەوتووە. لە میانەی ئەو کتێبەدا هەوڵی داوە بیروڕاکانی ماکس ڤێبەر و مارسا باریتۆ و دۆرکهایم لەگەڵ یەکتر بگونجێنێ. ئەم زانایە پشتی بە چەمکی سیستەمی پێوانەیی گشتی بەستووە، کە لە وابەستەبوونی کۆمەڵێك پێوەر و ڕەگەز دەردەکەوێ. لەگەڵ سیستەمی واقیعی کە دەکرێت ملکەچی کۆمەڵێك ڕێسا بێت لە شرۆڤەکاریدا).

ئەو پێی وایە کردەی کۆمەڵایەتی بریتییە لە هەموو جۆرەکانی ڕەفتاری مرۆیی کە لەلایەن ئەو (واتایانەی) لە دونیای (بکەر)دا بوونیان هەیە، دەجوڵێنرێن و ئاڕاستە دەکرێن. ئەمەش ئەو واتایانەن کە (بکەر) درکی پێ دەکات و لە خودی خۆی ئاوێتەی دەکات. (بکەر) لێرەدا دەکرێت تاك یان گرووپ یان ڕێکخستن تەنانەت خودی

کۆمەڵگاش بێت.

بکەر قەوارەکەی بچووك بێت یان گەورە، لەژێر ڕۆشنایی ئەو واتایانە دەڕوات کە لە ژینگەکەیدا هەیە. مادامەکی ئەو واتایانە لەلایەن تاکە بکەرێکەوە قۆرخ ناکرێت بەڵکو کەسانی دیکە هاوبەشی دەکەن، ئەوا کردەی کۆمەڵایەتی بکەرێکی دیارکراو ئەنجامی دەدات دروست نابێت تەنها لە چوارچێوەی هەڵوێستەوە نەبێت لێرەشدا کۆمەڵێك ڕەگەزی دیکە بوونیان دەبێت تا کارلێکردن دروست بکەن ئەمەش وا دەکات کردەکە بگاتە تەواوکاری.

واتەی ئەوەی سیستەمی کۆمەڵایەتی پشت بە کۆمەڵێك ڕەگەز دەبەستێ کە تاك بە کۆمەڵگا دەبەستێتەوە، بەمەش تەواوکاریی پێوانەیی دێتەدی. دوای ئەمە جۆری (پارێزگاری) دێت. ئەمەش لەو سیستەمەیە کە ئەو پێوەر و بەهایانە لەخۆ دەگرێت کە شێوەیەکی گشتگیریان هەیە. دەبێتە هۆی پارێزگاری کردن لە جۆری کارلێکردنەکە، تا لە سنووری سیستەمەکە دەرنەچێ و لێی لانەدات. دواتر (گونجاندن) دێت، بە واتای ئەوەی هەر سیستەمێکی کۆمەڵایەتی دەبێت لەگەڵ ژینگەی کۆمەڵایەتی و ماددیی خۆی بگونجێنێت بۆئەوەی بگات بە ئامانجی خۆی. مەبەستیش لێی شێوازی تاکە بکەرەکانە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکە. واتە تاکەکان لە تێرکردنی ئارەزووەکانیان هەریەکەیان لە پێکهاتەی کەسایەتییان لەویتر جیاوازە، بەمەش هاریکاریی دەستەجەمعی دروست دەبێت. بە واتای تەواوکاریی پێوەرەکان و جۆری پارێزگاری و تەواوکاریی بەهاکان ئەو سیاسەتەی بەکاردێت بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکە، لەگەڵ ئابووریی بەکارهێنراو، دواجار بە گونجاندن دەگات. (ئەم زانیارییانە

لەبارەی میتۆدی بارسۆنز لـە کتێبـی مێـژووی کۆمەڵناسـی محەمـەد محەمەد وەرگیراوە – نووسەر)

تێبینی ئەوە دەکرێت دکتۆر وەردی میتۆدی بارسۆنزی بە پێوەر و سیسـتەم و توێژینـەوەی لـەبارەی بـەهاکان و چـەمکی تـەواوکاریی کۆمەڵگاوە، پراکتیزە کردووە. وەردی هەرچەندە سوودی لەم میتۆدە وەرگرتووە، بەڵام بەتەواوی لەگەڵ تیۆرەکە کۆك نەبووە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە سەروەریی بەرژەوەندیی دەستەجەمعی هەیە لە دەوڵەتانی پێشکەوتوو، بە پێچەوانەی دەوڵـەتانی پاشکەوتوو کـە بەرژەوەنـدی تاکەکەسـی بەسـەری زاڵـە. گومانـە هەمیشـەییەکەی لەبارەی زاڵبوونی ویژدان لە دەوڵـەتانی پاشـکەوتوو، لـە بەرامبـەردا بێلایەنی ویژدان دێت لە دەوڵەتانی پێشکەوتوو. وەردی لەگـەڵ ئـەم دوو بیرۆکەیە نەبوو.

جێگای داخە ئەو کتێبەی مـن پسـپۆریی نییـە تـا بابەتەکـە زیـاتر شـرۆڤە بکـەم، دەترسـم لـە سـنووری ڕۆشـنبیری و زانسـتی و پسپۆڕییەکەی وەردی دەربچم. بۆیە من کورتەیەکم ئامادە کردووە. هیوادەخوازم پسپۆڕان زیـاتر بـەرەو پێشـەوە بچـن لـە توێژینـەوەی هزری وەردی و ئاڕاستەی میتۆدی توێژینـەوەکانی و ئـەو قوتابخانـە کۆمەڵناسییانەی پێیوە کاریگەر بووە.

## ئەمیل دۆرکهایم

دکتۆر عـەلی وەردی بـە بیرۆکـە دووانەییەکـەی زانـای کۆمەڵناسـی فەرەنسی ئەمیل دۆرکهایم کاریگەر بوو (ئـەمیل دۆرکهـایم لـە سـاڵی ١٨٥٨ – ١٩١٧ چاکەی یەکەم لە دیارکردنی بابەتی کۆمەڵناسـی بـۆ ئەو دەگەڕێتەوە. بە دانانی ڕێبازی ئەو زانستە هەڵسا و لقـەکانی لـە

یـەکتر جیـاکردەوە. لـە کتێبەکەیـدا بـەناوی (ڕێسـاکانی ڕێبـازی کۆمەڵایەتی و سوننەتی کۆمەڵایەتی) چەمکی شرۆڤەکاریی ڕێبازیانەی دیارکردووە، بە تێبینی کردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بەو پێیەی کە شتن، بە واتـای بـێ کاریگـەریی بیرۆکـە پێشـینەکان مامەڵـە لەگـەڵ دیـاردە کۆمەڵایەتییـەکان بکرێـت، وەك ئـەوەی بوونیـان هەیـە. لـە میتۆدی شرۆڤەکاریی دیـاردە کۆمەڵایەتییـەکان وا پێویسـت دەکـات توێژەری کۆمەڵناسی خۆی لە هەر بیرۆکەیەکی پێشینە ئازاد بکـات، بۆئــــەوەی لــــەلای تایبەتمەندییــــە جەوهەرییــــەکانی دیـــاردە کۆمەڵایەتییەکان بوەستێ، ئەو میکانیزمانە دەستنیشـان بکـات کـە بەهۆی ئەوانەوە لە ڕێگای تایبەتمەندییە دەرەکییەکانـەوە، دەگاتـە جەوهەری شتەکان و قووڵایی بابەتەکان. دواتر کاتێك توێژینـەوە لـە ئاڕاستەیەکی دیارکراوی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەکرێت، گشتاندن بـۆ ئـەو ئەنجامانـە دەکرێـت لـەو دیاردانـەی لـە هـەمان خەسـڵەت هاوبەشن و هەمان مـەرجیان تێـدا بـەدی دەکرێـت. دەبێـت توێـژەر هێندە وریا و بـەتوانا و خـاوەن ڕۆشـنبیری بێـت، لـە شـیکردنەوەی دیاردەیەك، تا دیاردەکە سەربەخۆ دەربکەوێت و لە دیاردەکانی دیکە جیا بێت، هەرچەندە لەگەڵ دیاردەکانی دیکەش بەراوردی دەکات کە هەمان خەسڵەت و مەرجیان تێدایە).

بەپێی دووانەکەی دۆرکهایم، دوو جۆر لە کۆمـەڵگا هەیـە، ئەمـەش بـەپێی هاریکـاریی کۆمەڵایـەتی، یەکـەمیان هاریکـاریی میکـانیزمی دەبێـت، دووەمیـان هاریکارییەکـەی ئۆرگـانی دەبێـت. میتـۆدێکیش دادەنێت کە لـە یـەك کاتـدا لەسـەر تیـۆر و تاقیکردنـەوە وەسـتاوە. ئەمەش لە میانەی تیۆری (عەقڵی دەستەجەمعی) بوو، ئەم تیۆرەش

لەسەر بنەمای جیاکردنەوەی (وێناکردنی تاکەکەسی) بوو لە (وێناکردنی دەستەجەمعی) دانرابوو، وێناکردنە تاکەکەسییەکان، تاکەکان و کۆمەڵەکان لە ژینگەیەك و کولتوورێك بەیەکەوە دەبەستێتەوە، ئەمەش ناکرێت لە هەموو کات و شوێنێك گشتاندنی بۆ بکرێت. بەڵام وێناکردنی دەستەجەمعی لە نێوان گەلان و نەوەکان هاوبەشە و کار لە ڕەفتاریان دەکات بێئەوەی ڕاستەوخۆ هەستی پێبکەن. ئەم وێناکردنانەش ئەو ڕوح و ماددەیە دەنوێنن کە کۆمەڵگای لەسەر وەستاوە.

لەلای توێژەران شاراوە نییە کە دکتۆر وەردی لە توێژینەوەکەی بۆ کۆمەڵگای عێراق، پشتی بە میتۆدەکەی دۆرکهایم بەستووە، هەوڵیشی داوە پراکتیزەی بکات لەگەڵ ئەو پێشخستنەی بارسۆنز ئەنجامی داوە، بەمەش وێنەیەکی تەواوکاری لەبارەی کۆمەڵگای عێراق بەدەستەوە دەدات. وەردی تا ڕادەیەکی زۆر لە کۆکردنەوەی ئەم دوو میتۆدە سەرکەوتوو بووە، سوودی لەو تەواوکارییە بینیوە کە بارسۆنز بۆ تیۆرەکەی دۆرکهایم پێشنیازی کردووە.

دۆرکهایم جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، ژیانی عەقڵی مرۆڤ بریتییە لە تەوژمێکی وێناکردنی چەسپاو لە زەینی خەڵکدا، هەندێکیان تاکەکەسی و هەندێکیان دەستەجەمعین، ئەمەش کۆی ئەم ڕەفتارە وەرگیراوەی تاکە لەناو کۆمەڵگادا. هەروەها بەم وێناکردنانە ڕەفتاری گشتی تاك و کۆمەڵگا دیار دەکرێت، بە شێوەیەك تاك ناتوانێ بەدرێژایی ژیانی خۆ لە کاریگەرییەکانی نەجات بدات، بە چاوپۆشین لە بونیادی کولتووری و هزری تاکە کەسەکە. وێناکردنە دەستەجەمعییەکان چەندین خەسڵەتی تایبەتیان هەیە، ئەوانە لە

دەرەوەی هەستی تاکەکەسن، مەعریفەش ئەنجامی هاوکارییە کە لە پانتاییەکی فراواندا لەسەرووی هەر شتێکەوەیە کە عەقڵی تاکەکەس بتوانێ بیپارێزێ. بیرۆکە ئایینییەکانیش لە دەرەوە بۆ تاکەکەس دێن، سەربەخۆیی تایبەتیان هەیە، جووڵانەوە کۆمەڵایەتی و ڕووداوەکانیش لە دەرەوەی هەستی تاکەکەسەوە دێن.

دۆرکهایم جەختی لەسەر شتێك دەکردەوە، وەردیش هەمیشە دووبارەی دەکردەوە و کەسیش گوێی بە بانگەوازەکانی نەدەدا، شتەکەش ئەوەیە: کاتێك کەسێك نەخۆش دەبێت دەچێتە لای پزیشك، ئەوەی کێشەی کارەبای هەبێت دەچێتە لای کارەباچی. هەریەکێك لە ئێمە پێویستی بە کەسانی پسپۆڕە، بۆیە سیاسەتمەدارانیش بگەڕێنەوە سەر کۆمەڵناسی. ئەمەش بۆ دیارکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان و گەڕان بەدوای چارەکردنیان. بانگی هەمیشەیی دۆرکهایم بۆ ئەوە بوو کۆمەڵناسی بکاتە زانستێك تا ڕۆشنایی بخاتە سەر کۆمەڵگا و لە چارەسەرکردنی هەندێك کێشە پشتی پێ ببەسترێت ئەمەش لە ڕێگای چاککردنی پەیوەندی نێوان تاك و کۆمەڵگا. بۆیە بایەخی گەورەی دۆرکهایم بە کێشە پەروەردەییەکان بوو، چونکە پەروەردە ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە لە گونجاندنی تاك لەگەڵ کۆمەڵگادا. ئەم وێناکردنانەش بۆمان دەردەخات کە دۆرکهایم بایەخی بە کێشەکانی سەردەمی خۆی داوە، دوو لە کتێبە هەرە گرنگەکانی لەبارەی ئەو شڵەژانە کۆمەڵایەتییە بووە کە لە ئەنجامی ئەو پیشەسازییە لەناکاو و چڕە بووە، کە کۆمەڵگاکانی سەردەمی ئەوی تەنیوەتەوە.

## کارڵ[7] مانهایم

کارێکی ئاساییە وەردی بایەخ بە ڕێبازی زانای کۆمەڵناسی هەنگاری کارڵ مانهایم بدات، چونکە وەردی لەوە ڕاهاتووە بایەخ بەو تیۆرانە بدات کە لە دووانەیی پێك دێن ( کارڵ مانهایم لە ساڵی ١٨٩٣ لەدایك بووە، لە ساڵی ١٩٤٧ مردووە. بە ڕەچەڵەك هەنگاری بووە و تەواوی ژیانی لە بەریتانیا ژیاوە. لە میانەی کتێبەکەی (ئایدیۆلۆژیا و یۆتۆپیا) تیۆرەکەی داناوە بۆ لێکدانەوەی هەموو بیروباوەڕە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای ئەوروپا) کارڵ مانهایم لە کتێبەکەیدا بەناوی ئایدیۆلۆژیا و یۆتۆپیا، دوو ئاست بۆ چەمکی ئایدیۆلۆژیا دیار دەکات: یەکەم ئاستی هەڵسەنگاندن، دووەم ئاستی دینامیکی. یەکەم ئاست لەسەر ئەو بنەمایە مامەڵە لەگەڵ ئایدیۆلۆژیا دەکات کە چەند ڕێسایەك لەخۆ دەگرێت بایەخ بە واقیعی بیرۆکە و بونیادی هۆش دەکات. ئاستی دینامیکیش ئایدیۆلۆژیا لەسەر خەسڵەتە دینامیکییەکان وەردەگرێت گوایە ئەمانە هەمیشە لە ڕێگای واقیعەوە پێوانە دەکرێن. ئەو واقیعەی کە لەژێر سایەی هەڵقولان و تەوژمێکی هەمیشەیی دەژیت. جا ئەوەی بە سەرمەستی ئایدیۆلۆژیا و هۆشێکی ڕووکەش ناوبرد. واتە ئەو لێکدانەوە ناڕاستگۆیەی کە کەسێك دایدەنێ.

مانهایم دوو جۆر ئایدیۆلۆژیای لە یەکتر جیاکردۆتەوە: یەکەمیان ئایدیۆلۆژیای تایبەتە، پەیوەستە بە تێگەیشتنی تاکەکان و پاساوەکانیان بۆ هەڵوێستێك کە هەڕەشە لە بەرژەوەندی تایبەتیان دەکات. دووەمیان ئایدیۆلۆژیای گشتییە کە پەیوەستە بە بیرکردنەوەی باو لەنێو چینێك یان قۆناغێکی مێژوویی. وەك ئەو حاڵەتەی لە بیرکردنەوەی باوی بۆرژوازی یان چینی پرۆلیتاری هەیە.

لەژێر ڕۆشنایی ئەوەدا ئایدیۆلۆژیای بەوە پێناسە کردووە، کۆمەڵێك بەهای بنەڕەتی و چەند نموونەیەکی مەعریفە و درکپێکردنن، بەیەکەوە پەیوەستن و پەیوەندی لەنێوان خۆیان و لایەنە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان دروست دەکەن. دکتۆر وەردی پشتی بەو ڕێبازە بەستووە لە کاتی توێژینەوەی بۆ سروشتی کەسێتی، ئەو بەها دەستەجەمعیانەی بوونەتە نموونەی مەعریفە کە لەڕاستیدا دروست نین. وەردی بەپێی ئەم تێڕوانینە تاوتوێی جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان کۆمەڵگاکانی کردووە. بنەماکانی ئەو جیاوازییەی بە داب و نەریت و پێکهاتەی دانیشتوان دەستنیشان کردووە، ئەمەو سەرەڕای بونیادی عەشیرەتگەری. هەروەك چۆن مانهایم کۆمەڵگاکانی مرۆیی لەسەر بنەمای ڕەچەڵەك پۆلێن کردووە، وەك ئەوەی لە کۆمەڵگا هۆزگەرییەکان هەیە، یانیش لەسەر بنەمای ئاین و زمان لە کۆمەڵگا شارستانییەکاندا. وەردی بینویەتی ئەم تیۆرە دەکرێت لەسەر کۆمەڵگای عێراقی سەردەمی عوسمانی پەیڕەو بکرێت، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە ململانێی هۆزگەری و تایفەگەری هەیە.

وەردی تێگەیشتنی مانهایمی بۆ چەمکی ئایدیۆلۆژیا وەرنەگرتووە. چونکە بەپێی پۆلینکردنی خۆی دوو جۆر ئایدیۆلۆژیا هەیە، یەکەم ئایدیۆلۆژیای گرووپی دەسەڵاتدار کە وێناکردن و بیرکردنەوەی خۆی بەسەر تەواوی تاکەکانی کۆمەڵگا دەسەپێنێ و پاساو بۆ بارودۆخی هەنووکەیی دەهێنێتەوە، داکۆکی لێ دەکات. دووەمیان ئایدیۆلۆژیای گرووپی ژێردەستە. کە هەوڵ دەدات بارودۆخەکە لە بەرژەوەندی خۆی بگۆڕێت و گۆڕانکارییەك لە بونیادی ئەو هێزەی هەیە ئەنجام

بدات، لەگەڵ هێنانەدی دادپەروەری و دابەشکردنی دادپەروەرانەی داهات. بۆیە وەردی پێی وابوو خاڵی هاوبەش لە نێوانی تیۆرەکەی مانهایم و سروشتی کۆمەڵگای عێراق نییە، هەرچەندە لە زۆربەی کتێبەکانی هەوڵی داوە میتۆدی توێژینەوە و میکانیزمەکانی مانهایم پەیرەو بکات.

## بۆچوونەکانی وەردی پێچەوانەی فەلسەفە مارکسی بوو

لەوانەیە ڕێبازی فەلەسەفەی هیگڵ نزیکترین ڕێباز بێت لە هزری وەردیدا (فیلهیلم فریدریك هیگڵ لە ساڵی ١٧٧٠ لەدایك بووە لە ساڵی ١٨٣١ مردووە. بە یەکێك لەو فەیلەسووفانە دادەنرێت کە زۆرترین کاریگەری بەسەر فەلسەفەی نوێ هەبووە. چەندین کتێبی نووسیوە بەناوبانگترینیان: فینۆمینۆلۆژیای ڕوح، لۆژیك لە سێ بەرگدا، ئینسکلۆپیدیای زانستە فەلسەفییەکان، چەند وانەیەك لەبارەی فەلسەفەی ئایینەوە، مێژووی فەلسەفە، فەلسەفەی جوانی) بەڵام بۆچی فەلسەفەی هیگڵ نزیکترین ڕێباز بووە لە هزری وەردی؟ هۆکارەکە ئەوەی تۆ ناتوانی لە فەلسەفەکانی بوونگەرایی و مارکسیزم و پراگماتیزم و فەلسەفەی شرۆڤەکاری و ڕەوتی ڕەخنەیی بگەیت بێئەوەی لە فەلسەفەی هیگڵ بگەیت، کە بە ئەرێنی و نەرێنی کاریگەری لەسەر هەموو فەلسەفەکان هەبووە. وەردی هەوڵی داوە لاسایی کتێبی لۆژیکی هیگڵ بکاتەوە، کە لەم کتێبەدا هەموو مانا بنەڕەتییەکانی میتافیزیکا و لۆژیك تاوتوێی کراوە. ئەمەش لە میانەی کتێبەکەی وەردی بەناوی (کارە نائاساکانی نەست) دەردەکەوێت. وەردی توانیویەتی ئەو ئاڵۆزی و ناڕۆشنییە ئاسان بکاتەوە کە لە کتێبەکەی هیگڵدا هەیە.

جا بە سروشتی حاڵەتەکە ئـەوەی بـاوەڕی بـە ئایـدیالیزمی هیگـڵ هەبێت ئەوا لەگەڵ ئەو ڕێبازە ماتریالیزمـە کۆك نابێـت کـە لەلایـەن فەیلەسووفی ئەڵمانی کارڵ مارکس دانراوە. (کارڵ مارکس لـە سـاڵی ١٨١٨ لەدایك بووە، لە ساڵی ١٨٨٣ مردووە. لەگەڵ ئەنگڵسی هاوڕێی تیۆری دەوڵەتی کۆمۆنیزمیان دانا. مارکس بیرمەندێکی کۆمەلایەتی و ئابوورییە، پێی وایە ئـابووری بزوێنـەری بنەڕەتییـە لـە تێگەیشـتنی بـزاوی مێـژوو و قۆناغـەکانی پێشـکەوتنی کۆمـەڵگا، لـە گـرنگترین کتێبـەکانی سـەرمایەیە) ئـەم ڕێبـازە لەگـەڵ بیرکردنـەوەی وەردی نەبووە، بۆیە لە پاشکۆی کتێبی (چاوپێداخشانێکی کۆمەلایەتییانە) وتارێکی نووسیوە لە ڕووی تیـۆری و پراکتیکـی وەڵامـی فەلسـەفەی مارکسیەت دەداتەوە. من هەرچەندە هەوڵم دا شتێك لە نووسینەکەی وەردی کورت بکەمەوە، بەڵام نەمتوانی، بۆیە لێرەدا تەواو دەرفەت بە وەردی دەدەم وەڵامەکەی بنووسێتەوە.

ئەو لەبارەی مارکسیەت دەنووسێ: دەگمەنە هاوتای مارکسیەت لە مێژووی مرۆڤایەتی بدۆزینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێت تەواو بێـت و خاڵی بێت لە کەموکوڕی. مادامەکی لە دانانی مرۆڤە ئەوا دەبێت لـە ڕوویێك لە ڕووەکانی تووشی هەڵە و کەموکوڕی ببێتەوە.

نابێـت ئـەوە لـەبیر بکـەین مـارکس تیۆرەکـەی وەك سـرووش لـە ئاسمانەوە بۆ نەهاتووە، بەڵکو لەو زانیارییانـەی هـەڵێنجاوە کـە لـە ژیانی خۆیدا فەراهەم بووە. بۆیە دەبینین ناوە ناوە هەنـدێك لایـەنی تیۆرەکەی دەگۆڕێـت کاتێـك زانیارییـەکی نـوێ بەدەسـت دەهێنـێ. دەکرێـت بگـوترێ ئەگـەر ماوەیـەکی زیـاتر دەژیـا و زانیـاری نـوێی بەدەست دەهێنا ئەوا لەوانەبوو تیۆرەکەی بەمشێوەیە نـەدەبوو کـە

١

دوای مردنی جێیهێشت.

هەندێك لە ماركسییەكان، بەتایبەتی دەمارگیرەكانیان، پێیان وایە تیۆری ماركسیەت لە بنەڕەتدا كامڵ و نەمرە. بۆیە سیفەتی زانستی پێدەدەن، جا بڕوایان وایە لەبەر ئەوەی زانستییە ئەوا دەبێت تەواو دروست بێت و بێ كەموكوڕ بێت، نابێت كەس گومانی لێی هەبێت. ئەو كەسانە ئەوەیان بیرچووە زانستیش بەردەوام دەگۆڕێ، هێشتا لە سەرەتای ڕێگایە. ناشزانین ئایندە چ سەیر و سەمەرەیەكی لە هەگبەدایە. لەوانەیە ئەوەی ئەمڕۆ بە دروستی دەزانین بەیانی هەڵە بێت. لەڕاستیدا من هەندێك لایەنی درەوشاوە لە ماركسیەت دەبینم و بۆ خۆی ڕامدەكێشێ. هەلی ئەوەشم بۆ ڕەخساوە سەردانی هەندێك وڵاتانی سۆسیالیستی بكەم، وەك ڕووسیا و چین و چیكوسلۆڤاكیا و پۆڵۆنیا. نەمتوانی خۆم بگرم و بە هەندێك خەسڵەت سەرسام نەبم كە لە شێوەی وڵاتانی سەرمایەداری نادۆزیتەوە. ئیعتراف بەوە دەكەم بەم دواییانە كاتێك هەندێك خەسڵەتی سۆسیالیزمم لە پۆڵۆنیا خوێندەوە لە ناخەوە هەڵپەم كرد و وتم" ئایندەی جیهان خۆی لێرەدا مەڵاس داوە". من لەوێ ئەو دیمەنە دزێوانەم نەبینی كە لە وڵاتانی سەرمایەداری هەیە. ئاپوورەی بێكار نییە كە كار نادۆزنەوە. هەزاران هەژار نییە تا لەو ماڵانە بژین كە شیاوی مرۆڤ نین. ئاپوورەیەك نییە بە سەبرەوە وەستابێ لەژێر باری گەرما و سەرما چاوەڕوانی هۆكارەكانی گواستنەوە بكات، یان ئەو نەخۆشانەی كەسێك نییە چارەسەریان بكات. یان ئەو منداڵانە بوونیان نییە كە لەبری خوێندن بێوچان كار دەكەن. هەموو ئەو دیمەنانە لەم وڵاتەدا نەبوو. ئامانجی سەرەكی ماركسیەت نەهێشتنی چەوسانەوەی مرۆڤە لەلایەن خودی

مرۆڤەوە، لەگەڵ ئاراستەکردنی بەرهەمهێنانی گشتی بۆ بەرژەوەندی زۆرینـەی هاووڵاتیـان. شـاهێدی ئـەوە دەدەم مارکسـیـەت بـۆ ئـەم ئامانجانە هەنگاوی گەورەی ناوە، بەڵام کێشـەکە ئەوەیـە مارکسیەت تەنها بـە کۆشـش کـردن بـۆ ئـەم ئامانجانـە وازی نـەهێناوە، بـەڵکو بینیمان خۆی هەڵقورتاندە نێـو هەنـدێك بابـەت ئـەرکی ئـەو نـەبوو، لەوانە: نکوڵی لە بوونی خودا کرد، سووکایەتی بـە ئایینـەکان کـرد، بەگوێرەی پلانێکی جێگیر کـە دەرچـوونی قبـووڵ نییـە، هـەوڵی دا شـرۆڤەی مێـژوو و کۆمـەڵگا و سروشـتی مـرۆڤ بکـات، بەمشـێوەیە مارکسیەت بۆ خۆی گەلێك دوژمنی دروست کرد کە دەکرا دۆستی بن.

مارکس لە کەشێکی فیکری ئەوتۆ ژیاوە، ئاراستە باوەکانی ئەو کات مەیلی ئەوەیان هەبوو ئەوەی لە گەردوون هەیە بە سروشتی گەردوون و مرۆڤ و کۆمەڵگا و مێژووشەوە یـەك تیـۆر شـرۆڤە بکـەن. سـەرەتا فەیلەسووفی گەورە هیگڵ بەمشێوەیە دەسـتی پێکـرد و مارکسـیش هات لەسەر نەریتی ئەو ڕۆیشت. ئەوەی شایەنی باسە مارکس سەرەتا هیگڵی بوو، دواجار تیۆرەکەی هیگڵی لەبارەی دیالێکتیکەوە خواست بەڵام لە بەرگە ئایدیالیزمەکەی داماڵی و کردی بە ماتریالی.

## بینینی چەند وڵاتێکی کۆمۆنیزم

دروستە بگوترێت گشتگیری تیۆرەکەی مارکس خاڵێکی بەهێز بـوو لە سەردەمی خۆیدا، کە ئەو کات ڕەوتێکی باو بوو. ئەگەر تیۆرەکەی مارکس گشتگیر نەدەبوو ئەوا لە بەرامبەر تیۆرە ڕکابەرەکانی توانای سەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی نەدەبوو. کەچی هەر ئەم گشتگیرییە دواتر خـاڵی لاوازی تیۆرەکـە بـوو. لایـەنگرانی مارکسـیـەت بەتایبـەت دەمارگیرەکـان تیۆرەکـەیان کردۆتـە بیروبـاوەڕ. وا دەزانـن کلیلێکـە

هەموو شتەكانی پێ شرۆڤە دەكەن. هەركە دەبینین كەسێك پێچەوانەی بۆچوونی ئەوانە ئەوا هەر زوو كۆمەڵێك تۆمەتی بۆ دروست دەكەن وەك دواكەوتوو (متخلف) و غەیبی و پیاوی ئیمپریالیزم... ئەمەش هاوشێوەی تۆمەتی كوفر و زەندیقكردنە كە لەلایەن توندڕەوانی ئایینەكانەوە هەیە.

دوای بینینی وڵاتانی كۆمۆنیزمی و خوێندنەوەی نووسینی ماركسیەكان گەیشتمە ئەو ئەنجامەی ماركسیەت لە پراكتیك جیاوازییەكی گەورەی لەگەڵ ماركسیەتی تیۆریی هەیە. ماركسیەتی پراكتیك بەڕاستی شایەنی سەرسامییە وەك پێشتریش باسم كرد. كەچی ماركسیەت لە تیۆرەكەیدا لە هەندێك شوێن شایەنی قێزبوونەوەیە، چونكە كۆمەڵێك تێكستە لە هەندێك قاڵبی فیكری چەقی بەستووە كە بە ناكۆتا دووبارە دەبێتەوە، وەك ئەوەی مەبەست پێگوتن و ئەزبەركردن بێت نەوەك تێڕوانین لە هەقیقەتێكی نوێ.

زۆرجار پرسیاری ئەو جیاوازییەم لە خۆم كردووە كە لەنێوان ماركسیەتی تیۆر و ماركسیەتی پراكتیك هەیە. وا بۆم دەردەكەوێ سەرۆكی وڵاتانی كۆمۆنیزم بە چارەسەركردنی كێشە كردەییەكانیانەوە سەرقاڵ بن، كە هەمیشە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. ئەوان كۆشش دەكەن بۆ چارەسەركردنی ئەو كێشانەی كە دەبێتە هۆی سوودگەیاندن بە خەڵك. بە چاوپۆشین لەوەی چ لە تێكستەكان هەیە. ئەوان ئەگەر پابەند دەبوون بەو تێكستانەوە ئەوا لە شەمەندەفەرەكە جێدەمان، بۆیە ناچارن ڕێگەی پێشخستن و داهێنان بگرنەبەر، بۆئەوەی لە ململانێی جیهان سەربكەون. لێرەدا باسی ئەو

ڕووداوە دەکەم کە بەسەر لینینی ڕێبەری مارکسیەت هاتووە. ئەم پیاوە ویستی دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر قۆناغێکی سۆسیالیزم ئەنجام بدات. زۆرێك لە مارکسیەکان لە بەرامبەری وەستان و ئەو کارەیان بە پێچەوانەی تێکستەکانی مارکس زانی، کە دەڵێ" سۆسیالیزم نایەتەدی تەنها لەو وڵاتانە نەبێت کە سەرمایەداری گەیشتۆتە ئەوپەڕی گەشەکردن". بەڵام لینین ئەو کەسانەی بە لادەری مارکسیەت زانی و لە کتێبەکەی بەناوی (نەخۆشیی منداڵکاریی چەپ لە کۆمۆنیزم) وەڵامی ئەوانی دایەوە. لێرەدا بڕگەیەکی قسەکانی لینین دەگوازمەوە، کە هەڵوێستی ئەو پیاوە لەبارەی تێکستە داخراوەکان ڕوون دەکاتەوە. لینین دەڵێ" مارکس و ئەنگڵس دەڵێن تیۆری ئێمە بیروباوەڕێکی دۆگما نییە بەڵکو ڕێبەری کارە. مەزنترین تاوان و هەڵەی مارکسیەکانی نموونەی کاوتسکی و ئۆتۆ پاور ئەوە بوو لەم بابەتە نەگەیشتن و نەیانتوانی لە چرکەساتە هەستیارەکانی پرۆلیتاریا پەیرەوی بکەن... لە سەردەمی جیرنۆفیسکی شۆڕشگێڕە ڕووسەکان بێشوومار قوربانیان دا ئەمەش لە ئەنجامی فەرامۆشکردنی ئەم هەقیقەتە بوو. دەبێت بەهەر نرخێك بێت کۆشش بکەین بۆئەوەی ڕێگری بکەین لە شیوعییە چەپەکان و شۆڕشگێڕانی ئەورووپا و ڕۆژئاوا ئەوانەی خۆیان لەپێناو چینی کارگەر تەرخان کردووە، ئەم هەڵەیە دووبارە نەکەنەوە".

جێگەی داخە کەسێك سوودی لەم هاوارەی لینین وەرنەگرتووە، ژمارەیەکی کەم نەبێت لە مارکسیەکان، ئەوانەی پێشتر پابەند بوون بە دەقەکانی مارکس و ئەنگڵس دواتر کەسانی دیکە هاتن، لەسەر پلانی ئەوان دەڕۆیشتن بەڵام تێکستی دیکەیان زیادکردووە، بە خودی

لینینەوە.

دەکرێت بگوترێت مارکسیەت لە بارودۆخی ئێستادا دوو جۆرە هەڵە لەخۆ دەگرێت یەکێکیان دامەزرێنەرانی تێی کەوتوون، واتە مارکس و ئەنگڵس و لینین و هاوئاستەکانیان. ئەوانیش مرۆڤن هەڵە دەکەن یان ڕاست دەکەن. کاتێك ئێمە ڕەخنە لە هەڵەکانیان دەگرین مانای ئەوە نییە ئێمە بیرکردنەوەمان لەوان مەزنترە، تەنانەت بیرمەندە مەزنەکانیش دەکەونە هەڵەی ئەوتۆ کە ئاشکرا نابێت بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار نەبێت.

## لەبارەی هۆکاری ئابوورییەوە

جۆری دووەمی هەڵەکان کە پەیڕەوکارانی مارکسیەت تێیکەوتوون، ئەوان هەندێك جار سەرپێچی دامەزرێنەران دەکەن کەچی وا دەزانن لەسەر ڕێبازی ئەوان دەڕۆن. ئەم بابەتەش تەنها لەلایەن پەیڕەوکارانی هزری مارکسیەت نییە، بەڵکو دیاردەیەکی گشتی کۆمەڵایەتییە، لە هەر کات و شوێنێکدا لەلای پەیڕەوکاران بەدی دەکرێت. لە سەدە درەنگەکاندا چەند نموونەی ئاشکرامان لەلای موسڵمانان بینی، کە وا دەزانن لەسەر سوننەتی پێغەمبەر و یارانی دەڕۆن کەچی لە زۆر بابەتدا دژی ڕێبازی ئەوانن. من لەو پاشکۆیە و پاشکۆکانی دیکە هەوڵ دەدەم تاوتوێی هەردوو جۆری هەڵەی مارکسیەکان بکەم ئەمەش بەپێی تێڕوانینی خۆم بۆ مارکسیەت. یان بە بڕی تێگەیشتنی خۆم. بانگەشەی ڕاستییش ناکەم لەوانەیە لە هەژمارکردنی ئەو هەڵانە خۆم هەڵەبم ، واتە هەڵەکە لە زەینی من بێت نەوەك تیۆری مارکسیەت. بۆیە تکام وایە ئەوانەی لە مارکسیەت گەیشتوون ڕۆشناییم پێ بدەن.

چاکەی ئەوە بۆ مارکس دەگەڕێتەوە، کە یەکەم جار لە مێژوودا هزری مرۆیی بەرەو گرنگی هۆکاری ئابووری لە ژیانی کۆمەڵایەتییدا ئاڕاستە کرد. بیرمەندانی پێش مارکس ئەو هەقەیان بەو هۆکارە گرنگە نەدابوو کە شایەنی بوو. دواجار مارکس هات، بە شێوەیەکی چڕ تێڕوانینەکانی خستە سەر ئەم هۆکارە تەنانەت بە تەوەرێکی بنەڕەتی زانی لە کۆمەڵگادا و بە بزوێنەری یەکەمی زانی لە مێژوودا. ئەم جەختکردنەوەی مارکس بۆ هۆکاری ئابووری وایکرد هەندێك لە پەیڕەوکاران توندڕەویی لەسەر بکەن، ئەمەش هەمیشە خووی پەیڕەوکارانە. ئەنگڵس لە سەردەمی خۆیدا تێبینی سەرەتای دەرکەوتنی ئەم توندڕەوییەی لەلای مارکسییە گەنجەکان کردووە، بۆیە ڕەخنەی لێگرت و سەرزەنشتی کرد. ئەنگڵس بەشێك لە بەرپرسیارێتی ئەم توندڕەوییە بۆ خۆی و مارکس دەگێڕێتەوە، دەڵێ" من و مارکس بەشێك لەو بەرپرسیارێتییە هەڵدەگرین کە گەنجان بایەخێکی زێدە لە پێویست بە لایەنی ئابووری دەدەن. لە بەرەو ڕووبوونەوەی نەیارانمان دەبووایە جەخت لەسەر بنەمایەکی سەرەکی بکەینەوە کە ئەوان نکۆڵیان لێدەکرد. بەڵام لەم حاڵەتەشدا هەمیشە کات و شوێن و بارودۆخ نادۆزینەوە تا دەرفەت بە هۆکارەکانی دیکە بدەین، کە لە کردەکان بەشدار دەبن".

ئەنگڵس باسی ئەوەی کردووە، چۆن هۆکارەکانی دیکە گرنگی خۆیان هەیە لە شرۆڤەکردنی ڕووداوەکان کە ناکرێت نکۆڵیان لێ بکرێت، وەك هۆکاری جەنگ و سیاسەت و ئایین و بیرکردنەوە... هتد. بۆیە دەڵێ" ئەگەر هاتوو یەکێك ئەو هەڵوێستە بشێوێنێ، بە واتای ئەوەی هۆکاری ئابووری بکاتە تاکە هۆکاری دانپێنراو، ئەمە مانای

ئەوەیە دەیکاتە ڕستەیەکی بەتاڵ و دەبەنگانە". ئەنگلس چەندین نموونە لە مێژووی ئەڵمانیا دەهێنێتەوە، وەك دەرکەوتنی دەوڵەتی پروسیا، یان چۆن میرنشینە بچووکەکان دروست بوون. یان ئەڵمانەکان چۆن بەپێی شوێنیان لە زنجیرە چیاکان و شێوەزاریان دابەش بوون. بە تێڕوانینی ئەنگلس ناکرێت ئەم بابەتانە تەنها بە هۆکاری ئابووری شرۆڤە بکرێن، بەڵکو دەبێت هۆکارەکانی دیکەش لەبەرچاو بگیرێن.

## پێشکەوتنی کۆمەڵگا

پوختەی بۆچوونی مارکس لەبارەی کۆمەڵگای مرۆیی ئەوەیە لەسەر بنەمای ماددی و ئابووری دەوەستێ. کاتێك مرۆڤەکان بۆ بەرهەمهێنانی کەرەستە و پێداویستیەکانیان کار دەکەن ئەوا دەچنە نێو پەیوەندی ڕێکخستنی بەرهەمەکانیانەوە، لە کۆی ئەم پەیوەندییانەش ئەم بنەمایە دروست دەبێت کە کۆمەڵگای لەسەر بونیاد دەنرێت، لەسەر ئەو بنەمایەش ئەو شتە دروست دەبێت کە مارکس بە (سەرخان) ناوی دەبات. سەرخانیش بریتییە لە هەموو سیماکانی کولتووری و کۆمەڵایەتی وەك داب و نەریت، بیروباوەڕ، یاسا و ڕێساکانی ئاکار، هونەر و فەلسەفە و... هتد، سەرخان ڕەگی خۆی لەو بنەمایە وەردەگرێت کە لەسەری دروست بووە، بە گۆڕانی ئەویش دەگۆڕێت.

بە بۆچوونی مارکس مێژووی مرۆڤایەتی لە ئەنجامی ململانێی چینەکانە. مارکس ئەو ململانێیە بەوە شرۆڤە دەکات گوایە لە ئەنجامی دژبەیەکتری نێوان لایەنە بەرهەمهێنەکان و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانە. لایەنە بەرهەمهێنەکان لەو مرۆڤانە پێکدێن کە لەگەڵ

ئامێرەکانیان لە بەرهەمهێنان کاردەکەن. ئەم لایەنانەش بە تێپەڕبوونی کات بەرەو چاکتربوون و پێشکەوتن دەڕۆن. کەچی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان، ناتوانێ لەگەڵ ئەم پێشکەوتنانە بڕوات. لێرەدا دژبەیەکتر دروست دەبێت، جارێکی دیکە ململانێی نێوان چینی چەوسێنەر و چینی چەوساوە دروست دەبێت.

مارکس پێی وایە کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی لە مێژووی خۆیاندا بە پێنج قۆناغ یان سیستەم تێدەپەڕن: کۆمۆنەی سەرەتایی، کۆیلایەتی، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری، کۆمۆنیزم. هەر قۆناغێك لەم قۆناغانە لەچاو پێش خۆی بە پێشکەوتوو دادەنرێت، ئەمەش لەبەر بەدیهاتنی گونجانێکە لەنێو لایەنی بەرهەمهێن و پەیوەندی بەرهەمهێنان، بەڵام ئەو گونجانە تاسەر بەردەوام نابێت، دەبێت بە تێپەڕبوونی کات بەرەو لاوازی بڕوات، تا دژبەیەکتر شوێنی دەگرێتەوە. بەمەش ململانێ دروست دەبێ و شۆڕش هەڵدەگیرسێ لە کۆتاییشدا قۆناغێکی نوێ دێتە ئاراوە.

ئەم تیۆرەی مارکس بە (ماتریالی مێژوویی) ناودەبرێت. لەڕاستیشدا کاتی خۆی مەزنترین تیۆری کۆمەڵایەتی بوو. برەوێکی زۆری لەلایەن ڕۆشنبیرانی پێشکەوتووخوازی ئەورووپا هەبوو. لایەنگرانی بە هاوشانی تیۆرەکەی داروینیان دەزانی، بەڵام ئەوەی داروین لە بواری زیندەوەرزانی بوو، کەچی تیۆری مارکس لە بواری کۆمەڵناسی بوو.

کێشەی ئەم تیۆرە لە پەیڕەوکارانیەتی نەوەك خودی تیۆرەکە. مارکس ویستی ئەم تیۆرە ڕێبەری کارکردن بێت، بەڵام پەیڕەوکارانی مارکسیەت یان بەلایەنی کەمەوە هەندێکیان، ئەم تیۆرەیان کردە باوەڕێکی چەسپاو کە گۆڕان و گومان قبووڵ ناکات. بۆیە گریمانەی

پێنج قۆناکەی مارکس لەلایەن ئەو کەسانەوە بوو بە ڕاستەیەك (مسطرة) جا کاتێك دەیانویست توێژینەوە بۆ کۆمەڵگایەك بکەن، یان توێژینەوەی مێژوویی بکەن، ئەوا پەنایان بۆ ئەو ڕاستەیە دەبرد، ئەو کات شتێك نییە تەنها دانانی ڕاستەکە نەبێت بۆئەوەی بزانن کۆمەڵگاکە لە چ قۆناغێکە. دوای ئەوەش دەست دەکەن بە گەڕان بەدوای بەڵگە و ئاماژە بۆئەوەی پاڵپشتی ئەم کارەیان بکەن. کوتلۆڤ لە کتێبی (شۆڕشی بیست) هەر ئەم کارەی کردووە، بۆئەوەی توێژینەوە لەبارەی شۆڕشی بیستی عێراق بکات، بە پێویستی زانیوە لە زەمەنی شۆڕشەکە ڕاستە لە سەر کۆمەڵگای عێراقی دابنێت. بۆیە بەو ئەنجامە گەیشتووە کە کۆمەڵگای عێراقی ئەو کات لە قۆناغی دەرەبەگایەتی بووە، جا بەپێی بۆچوونی ئەو شۆڕشی بیست لە ئەنجامی ململانێی نێوان چینی جەماوەری زەحمەتکێشی وەك بەدو و جووتیار و پیشەگەران بووە. لەگەڵ چینی دەسەڵاتداری چەوسێنەر. ئێمە نکۆڵی لە گرنگی ململانێی چینایەتی ناکەین لە لێکدانەوەی مێژوودا، لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێت لە هەموو ڕووداوەکان بەکاری بهێنین و هەموو شتەکانی پێ شرۆڤە بکەین. چونکە کۆمەڵگاکان لەو ململانێیەی لە نێوانیاندا هەیە جیاوازن، لەگەڵ یەکتر، هەروەها ڕووداوەکانیش لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر بەپێی هۆکارە سەرەکییەکان جیاوازە. شۆڕشی بیست بە نموونە وەربگرە، ئەگەر ئەم شۆڕشە لە ئەنجامی ململانێی چینایەتی بووایە وەك کوتلۆڤ باسی دەکاتن ئەوا دەبووایە ململانێ لەنێوان شێخی عەشیرەت و تاکەکانی عەشیرەتەکە بووایە بەو پێیەی تاکەکان سەپانی چەوساوە بوون و شێخەکانیش چەوسێنەر، بەڵام ئەوەی لە

واقیع بینیمان دژی ئەو بۆچوونە بوو.

هەموو ئەوانە قسەی وەردی بوون لەسەر مارکسیزم لە ڕووی پراکتیك و تیۆرەوە، لە ڕووی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە. جا ئەوانەی پێیان وایە وەردی کاریگەر بووە بە تیۆری ماتریالیزمی ئەوا وەردییان بەباشی نەخوێندۆتەوە. ئەم پیاوە جیاوازی نێوان ئایدیالیزمی هیگڵ و ماتریالیزمی مارکسی ڕوونکردۆتەوە. هەروەها ئەوەشی ڕوونکردۆتەوە کە مارکس بەر لە دانانی تیۆرەکەی کەسێکی هیگڵی بووە.

## هزری وەردی لە ئێران

گەلی ئێران بە سروشتە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکەی لە گەلی عێراق جیاوازە، هەرچەندە ئەم دوو گەلە بە هەزاران کیلۆمەتر دووجا دراوسێی یەکترن. بەڵام ئەم نزیکبوونەوە جوگرافییە بە چەندین هۆکاری دیکەی سروشتی جیای دەکاتەوە، لەوانە چیای زاگرۆس هەردوو ڕەگەزی کوردی و فارسی لە دەشتایی عەرەبی جیا دەکاتەوە کە لە ناوەڕاست و باشووری عێراقە. دواتر ڕووباری کارۆن دێت، کە لە هەردوو دیوی ئەو هۆزە عەرەبیانە نیشتەجێن کە بەسەر کەنداو دەڕوانن و هەردوو گەلی عێراق و ئێران لە یەکتر جیا دەکەنەوە، تەنها یاوەری کارەساتی جەنگ و داگیرکاریی هەردوولا نەبێت... لەبەر ئەم هۆکارانە جوگرافیا لە سەدەی ڕابردوودا هۆکاری نزیکبوونەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی نەبووە، دەبێت ئەوەش لەبەرچاو بگیرێت کە لە سەدەی ڕابردوودا شۆڕشی دیجیتاڵی و ئینتەرنێت نەبووە.

ئەوەی چاودێری ڕووداوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی سەدەی ڕابردووی کردبێت بەڕوونی دەبینێت ئێران پاشکۆی ڕووداوە عەرەبی

و عێراقییەکان بووە لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە. بەو مەرجەی ئەو چاودێرە بە بێلایەنانە خوێندنەوەی بۆ ڕووداوەکان کردبێت، بێ جیاکردنەوەی نەژادی و تایفەگەری، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە لە میانەی چاودێریکردنی بێلایەنانە، ئاماژە بۆ ئەو بەڵگانەی خوارەوە دەکەین:

یەکەم: یەکەم جووڵانەوە لە مایسی ١٩٤١ لەلایەن سوپای عێراقی ئەنجام درا، لە دژی ڕژێمی پاشایەتی، بە ناوی جووڵانەوەی مایس بوو بە سەرکردایەتی ڕەشید عالی گەیلانی. ئەم جووڵانەوە پاڵپشتی جەماوەری بەدەستهێنابوو. بە شێوەیەك تۆ هەتا ئەمڕۆ ناتوانی تاوتوێی ئەم شۆڕشە بکەیت کە بە (شۆڕشی نیشتیمانی مایس) ناسراوە لە عێراق دا. کەچی لە ئێرانی دراوسێ ڕەزا شای پەهلەوی هێشتا هیچ ناڕەزاییەك و یاخیبوونی نەدیبوو جا لەلای سوپا بێت یان گەل. شا توانی وڵاتی ئێران یەك بخات و دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێ. کوڕەکەشی وەك جێنشین دابنێ. ئێران لە سەردەمی ڕەزا شادا بووژانەوەیەکی ئاوەدانی بەخۆیەوە بینی و ژێرخانێکی هاوچەرخی بۆ ئێران دروست کرد، کە هێشتا مێژوو شایەتی بۆ دەدا، بەڵام ئەم پیاوە لە هەندێك حسێب هەڵەی کرد کاتێك لە جەنگی دووەمی جیهانی وەك لایەنگر و هاوکاری هێزەکانی میحوەر (ئەڵمانیای نازی، ئیتاڵیا، یابان) وەستا، ئەمەش وایکرد هێزەکانی هاوپەیمانان (ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ڕووسیا، بەریتانیا، فەڕەنسا) ناچاری بکەن بۆ کوڕەکەی دەستبەرداری دەسەڵاتی پاشایەتی بێ، دواتریش بۆ دوورگەی مۆریس دوورخرایەوە. لەم ماوەیەشدا هیچ جووڵانەوەیەکی گۆڕانخواز دروست نەبوو جا بۆ دیموکراسی بێت یان

گۆڕانی ڕژێمی پاشایەتی. گەلی ئێران لە بەرامبەر شای نوێ محەمەد ڕەزا شا هیچ جووڵانەوەیەکی نەکرد تەنها ئەو کاتە نەبێت دکتۆر محەمەد موسەدەق سەرۆك وەزیرانی ئێران لە بەیاساکردنی فرۆشتنی نەوتی ئێران بۆچوونی خۆی سەپاند لە ساڵی ١٩٥١ دا.

دکتۆر موسەدەق ویستی بەرگی نیشیمانی بە ئۆپۆزسیۆنی کلاسیکی ئایینی ئێرانی دابپۆشێ کە لەلایەن ئایەتوڵڵای کاشانی ڕێبەرایەتی دەکرا، بەڵام پیاوانی ئایینی لەنێو ڕێگای شۆڕشدا موسەدەقیان شەرمەزار کرد. دواتر شای بچووك لە ئێران ڕایکرد، ئەمریکا بە کودەتایەکی سەربازی خۆی تێهەڵقورتاند، ئەمەش وایکرد موسەدەق ڕووبەڕووی دادگا بکرێتەوە و لەو گوندەی تێیدا لەدایکبووە، ئاکەنجەبوونی زۆرەملێی بەسەر سەپێنرا. پیاوانی ڕژێمەکەشی دادگایی کرا و وەزیری دەرەوە حوسێن فاتیمی لەسێدارە درا! لە میانەی زنجیرەی مێژوویی ڕووداوەکان بۆ خوێنەری بەدیقەت، ڕوون دەبێتەوە کە جووڵانەوەی نیشتیمانی لە ئێران لە دژی ڕژێمی پاشایەتی ١٠ ساڵ دوای هاوشێوەکەی بووە لە عێراقدا.

دووەم: دوای شۆڕشی میسر لە ساڵی ١٩٥٢، چەندین کودەتای سەربازی و شۆڕشی میللی لە وڵاتانی عەرەبی بەرپابوو. لەوانە لە عێراق شۆڕشی چواردەی تەمموزی ١٩٥٨ بەرپابوو، کە ڕژێمی پاشایەتی لەناوبرد و ڕژێمی کۆماری هێنا بە ڕێبەرایەتی عەبدولکەریم قاسم. دواتر عێراق تووشی چەندین شۆڕش و کودەتا بوو بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات تا دوایین جار هێزەکانی ئەمریکا هات و ڕژێمیان لەناوبرد و دەسەڵاتێکی دیکەیان دامەزراند.

گەلی ئێران لە جووڵانەوەکەی موسەدەق لە ساڵی ١٩٥١ تا ساڵی

١٩٦٢ ، لەوە وەستا داوای گۆڕانکاری بکات. نکۆڵی لەوە ناکرێت هەندێك حزبی چەپ و ئایینی هەبوو، لە تاران پەنایان بۆ توندوتیژی دەبرد، چەندین غافڵکوژیی سیاسییان ئەنجام دا، بەلام بەمجۆرە جووڵانەوەکەیان زۆر سنووردار بوو، تەنانەت نەدەگەیشتە شارە نزیکەکانی تارانیش. نموونەی ئەم جۆرە جووڵانەوانە ناکرێت بە شۆڕشی میللی و سوپا دابنرێت. تا ئەو کاتە هات باروودۆخی ئایینی ئێران بە جووڵانەوە شۆڕشگێڕەکانی عێراق کاریگەر بوو کە بەسەر ڕژێمی پاشایەتی و کۆمارە نوێیەکە ئەنجام درا.

جووڵانەوەی ئیمام خومەینی دەرکەوت لە شاری قومی ئێران دەستی پێکرد، هەوڵیدا نیشتیمانپەروەرەکانی ئێران لەژێر عەباکەی خۆی کۆبکاتەوە، بەلام سەرکەوتوو نەبوو، وەك چۆن پێشتر موسەدەق سەرکەوتوو نەبوو لەوەی پیاوانی ئایینی بخاتە ڕیزی شۆڕشەکەی.. ئەمجارە شا بە ئەزموون بوو، پشت و پەنای هەبوو، بۆیە شا بەتوندی لەگەڵ شۆڕش هەڵسوکەوتی کرد و لەباری برد. خومەینی بۆ تورکیا دوورخستەوە و دواتریش هاتە عێراق.

گەلی ئێران دوای سەرنەکەوتنی جووڵانەوەکەی خومەینی دووبارە کەوتەوە حاڵەتی بێدەنگی تا ساڵی ١٩٧٨، جارێکی دیکە شۆڕش لە ئێران هەڵگیرسا، یەکەمجار بوو هەموو گەلی ئێران لەژێر خێوەتی ئیمام کۆبوونەوە لە پاریس... دوای ساڵێك ئیمام گەڕایەوە و ڕژێمی پاشایەتی خست و یەکەم کۆماری لە ئێران دانا، ئەم کۆمارەش نزیکەی بیست ساڵ لە یەکەم کۆماری عێراق دواکەوت. بەمشێوەیە ئێستاش کە دەوڵەتانی عەرەبی بە شۆڕش تێدەپەڕن کە لە ناوەخۆ بەرهەم دێت و لە دەرەوە دروست دەکرێت. بەو شۆڕشانە چەندین

ڕژێم کەوت، گەلی ئێران هەوڵی دا لاسایی ئەم شۆڕشانە بکاتەوە، بەڵام دەسەڵاتی خامەنایی ڕێبەر خوێنی ڕشت و بە شێوەیەکی کاتی تەوژمی شۆڕشی وەستاند. تۆش خوێنەری خۆشەویست لە هەر کاتێکدا کە ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە، دوای ئەوەی لەبەردەستی من تەواو دەبێت، تۆش وێنەکان تەواو بکە، ئێستا کاتی نووسینی ئەم کتێبە ساڵی ٢٠١٣یە، کاتەکەی دیکەش نادیارە!!

ئەمە لەلایەنی سیاسییەوە، لەلایەنی ئاینییەوەش جیاوازییەکی زۆری نییە. شۆڕشی (التنباك) لە ئێران فەتواکەی لەلایەن ئیمامێک دەرچوو کە لە عێراق نیشتەجێ بوو، شۆڕشی بیست لە عێراق تەوژمە جەماوەرییەکەی پشتیان بە چەندین فەتوا بەست کە لەلایەن مەرجەع و زانایانی نەجەف و کەربەلا و سامەڕا دەرچووبوو. فیقهناسێك کە لە قوتابخانەی نەجەفی دەرچووبێت لەلای ئێرانییەکان بەهاکەی لە فیقهناسێك باشترە کە لە قوم بێت. زۆربەی سەرچاوە زانستییەکان کە بە زمانی عەرەبی دەردەچن لە نەجەفە و لە قوم دەخوێنرێت. کاریگەری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری عێراقی بەسەر حەوزەی زانستی قوم زۆر ڕۆشنە. ئەم حەوزەی ڕێزێکی تایبەت بۆ ئەو کەسانەی دادەنێت کە لە قوتابخانەکانی نەجەف دەخوێنن. هەندێك لە مەرجەعەکانی قوم پارێزگاری لە نازناوە نەجەفییەکەی خۆیان دەکەن، وەك مەرجەعی مەرعەشی نەجەفی. ڕێزی ئەو زانایەی لە نەجەف خوێندوویەتی لەو زانایە جیاوازە کە لەوێ نەیخوێندووە. لەوانەیە تا ئەمڕۆ نەجەف وەك بارێکی قورس بێت بەسەر سەرکردایەتی ئاینی ئێرانەوە، تەنانەت ئەگەر خودی ئەو مەرجەعەی لە نەجەفیشە ئێرانی بێت، یانیش مەرجەعە ئێرانییەکان

لە ڕووی سیاسییەوە کاریگەرییان بەسەر مەرجەعەکەی نەجەفەوە هەبێت، بەڵام ئەو هەر قوتابخانەی نەجەفی دایک دەنوێنێ. ئەمەش وای لێدەکات تایبەت بێت. هەر لەبەر ئەو هۆکارانەشە قوتابخانەی ئایینی و ڕۆشنبیری لە ئێران هێشتا کتێب و بڵاوکراوەکانی نەجەف دەقۆزنەوە وەك ئەوەی گەنجینەیەك بن، یانیش سەرچاوەیەکی سەرەکی بن بۆ فیکر و هۆش.

دکتۆر عەلی وەردی لە لیستی ئەو ناوە عەرەبیانەیە کە کتێبەکانی لە ئێران خراوەتە سەر زمانی فارسی. لە بەدبەختیشدا واعیزەکانی سوڵتان یەکەم کتێب بوو بە ناونیشانێکی هەڵەوە وەرگێڕدراوە (نقش وعاظ در اسلام) لەلایەن محەمەد عەلی خەلیل وەرگێڕدراوە، ناونیشانەکە بە واتەی (ڕۆڵی واعیزەکان لە مێژووی ئیسلامدا) دێت، پێم وایە خوێنەری خۆشەویست ئاستی ئەو چەپەڵەکردنە دەزانێ کە بە خوێندنەوەی ناونیشانەکە دەچێتە زەینیەوە، کە تەواو پێچەوانەی ویستی وەردییە. من خۆم تەنها سەیری ناوی کتێبەکەم کردووە لە میانەی هەندێك سەرچاوەی ئێرانییەوە، بۆیە ناتوانم بەراوردی تێکستە سەرەکییەکە و وەرگێڕانەکە بکەم. بەڵام تەنها لە میانەی ناونیشانێکی ساختەوە دەکرێت پشت بە ناوەڕۆکی کتێبەکە نەبەستین. من پێم وایە لە میانەی ئەو ناونیشانەوە زانایانی فارس تەنها ئەوەیان لە وەردی وەرگرتووە کە لەگەڵ مەبەستی ئەوان گونجاوە. بۆ مێژوو دەیڵێم: وەردی کە حەزی دەکرد بە هەرزانترین نرخ کتێبەکانی چاپ بکرێت و لەنێو خەڵك بڵاوبکرێتەوە، بەڵام هەمیشە ڕازی نەبوو بێ پێدانی ڕەزامەندی کتێبەکانی لە چاپخانە ئێرانییەکان چاپ بکرێت، داواشی دەکرد مافی پێ بدرێت. هەندێك لە

زانایانی فارس و نووسەران کاریگەر بوون بە بیرکردنـەوەی وەردی ، بەتایبەت دکتۆر عەلی شەریعەتی کە بە فەیلەسووفی شۆڕشی ئێرانی دەناسرێت. لەگـەڵ شـێخ مورتـەزای موتەهـەری کـە یـەکێك بـوو لـە ڕابەرانی هزری شۆڕش، لە سەرەتای شۆڕشەکە کوژرا.

## شێخ مورتەزای موتەهەری

(ئایەتوڵڵا مورتەزای موتەهەری لە ساڵی ١٩٢٠ لەدایك بووە لە ساڵی ١٩٧٩ مردووە. زانایەکی ئایینی و فەیلەسووفێکی ئیسـلامی بـوو لـە ئێران. چەندین کتێبی لەبارەی عەقیـدە و فیقـه و فەلسـەفە هەیـە. یەکێك لە سەرکردەکانی شۆڕشی ئێرانی بوو، یـەکێك بـوو لـە کەسـە نزیکەکانی ئیمام خومەینی، لەلایەن ڕێکخراوی فورقانەوە لە ڕۆژانـی سەرەتای شۆڕش لە ساڵی ١٩٧٩ تیرۆر کرا). مورتـەزای موتەهـەری کاریگەر بوو بە بیرکردنەوەی وەردی کە هانی جووڵانـەوەی دەدا لـە دژی قەتیسبوونی هزری. بەتایبەتی لە ژینگەیەکی وەك ئەوسای ئێران کە لە سەرەوە باسمان کرد. کـە هـەموو جووڵانەوەیـەکی سیاسـی و کۆمەڵایەتی لەبەردەم سەرکەوتنەکانی شا چەقیبوو.

مورتەزای موتەهەری بە یەکێك لە پیـاوە ئایینییـە کلاسـیکییەکان دادەنرێت، ئەویش لە وەردی ئـەو بیرۆکانـەی بـردووە کـە سـوود بـە ئاڕاستەی فیکری ئەو دەگەینێ. لە چاپی شەشەمی کتێبەکەی بەناوی (مقدمەای بر جهان بینـی اسـلامی، وحـی و نبـو) کـە ناونیشـانەکەی دەکاتــە (ســەرەتایەك لــە جیهــانبینیی ئیســلام، لــە ســرووش و پێغەمبەرایەتییەوە) لە لاپەڕە ٢٩ هاتووە: (علی قهرمان تیغ و تسبیح است، هم مرد تیغ هم مرد تسبیح ، اما برای مغلوب کردن کدام طبقة؟ طبقة زیر دست و محکوم یا طبقهی زبر دست و حاکم؟ شعار

علي (كونا للظالم خصما و للمظلوم عونا) است. علي در تمام عمر دوست تيغ و تسبيح بود، دشمن طلا او عليه خداوندان زر و زور به كار رفت به قول دكتر علي الوردي در كتاب مهزلة العقل البشري علي با شخصيت خود فلسفةی ماركس را نقض كرده است).

شێخی موتەهەری پشت بە بۆچوونی عەلی وەردی دەبەستێ کە لە کتێبەکەی گاڵتەجاڕیی عەقڵی مرۆیی هاتووە. بە گوتەی ئەوەی دروشمی عەلی کوڕی ئەبوتاڵب شمشێر و تەسبیح بوو. ئەو نەیاری ستەمکار بوو پاڵپشتی ستەمدیدە بوو، وەك وەردی لە کتێبەکەی جەختی لەسەر دەکاتەوە ڕەفتار و کەسێتیی ئیمام عەلی پێچەوانەی فەلسەفەکەی کارڵ مارکس بوو.

جێگەی داخە ئەو کتێبانەی وەردی وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی فارسی، یاری بە ناونیشانەکان کراوە، لەوانە کتێبی واعیزەکانی سوڵتان و گاڵتەجاڕیی عەقڵی مرۆیی. سەرەڕای ئەم وەرگێڕانە کەمەش وەردی ناوێك بووە بە هزر و بیرکردنەوەکەی ڕێبازێك بووە شێخ موتەهەری بەدوای بووە بۆ گەیاندنی بیرۆکەکانی بە خەڵك. موتەهەری لە کتێبی (جیهانبینیی ئیسلام) کە یەکێکە لە بەناوبانگترین کتێبەکانی باس لەوە دەکات ئایینی ڕاستەقینەی محەمەد بە هزر و هەڵسوکەوتی عەلی کوڕی ئەبوتاڵب بڵاوبۆتەوە، کە پێشەنگی ئەو کەسانە بوو هاتنە ڕیزی ئیسلامەوە. لەم بۆچوونانەش موتەهەری پشت بە وەردی دەبەستێ کە لە کتێبی گاڵتەجاڕیی عەقڵی مرۆیی باسی کردووە و دواتر خەڵکەکە عەلییان جێهێشتووە هەر کۆمەڵەیەك خۆی پێ ڕاست بووە. کە وەردیش باسی ئەوەی کردووە.

## دکتۆر عەلی شەریعەتی

(عەلی شەریعەتی لە ساڵی ١٩٣٣ لەدایك بووە لە ساڵی ١٩٧٧ مردووە. بیرمەندێکی ئیسلامی ئێرانی بەناوبانگ بوو، بە سرووشبەخشی شۆڕشی ئێران دادەنرێت. کە دوای دوو ساڵ لە کوژرانی هەڵگیرسا. کۆلیژی ئادابی زانکۆی تارانی تەواو کردووە، دواتر لە زانکۆکانی فەرەنسا دکتۆرای لە مێژووی ئیسلام و کۆمەڵناسی بەدەست هێناوە. لە بەناوبانگترین کتێبەکانی: شیعەگەریی عەلەوی و شیعەگەریی سەفەوی، بنەماکانی ئیسلام، فاتیمە هەر فاتیمەیە). شەریعەتی یەکێك بووە لەوانەی بە بیرکردنەوە و کتێبەکانی وەردی کاریگەر بووە، بەتایبەتی ئەو پیاوی ئایینی نەبوو، بەڵکو مامۆستایەك بوو دکتۆرای لە زانکۆیەکی فەرەنسی بەدەستهێناوە و لە ڕۆژئاوا ژیاوە. چەندین بیرۆکەی ڕیفۆرمی کۆمەڵایەتی هێنا، بەڵام نوخبەی ئایینی سەرەتا ڕەتیان کردەوە. عەلی شەریعەتی لەگەڵ هەندێك لە بۆچوونەکانی عەلی وەردی هاوڕایە، لەوانە لە کتێبەکەی بەناوی (زیر بنای اسلام) واتە (بنەماکانی ئیسلام) باس لەو بیرۆکانە دەکات کە لە کتێبی واعیزەکانی سوڵتان هاتووە. ئەو پێیوایە ناکرێت کۆمەڵگاکانی ئیسلام تەنها بە وەعزخوێنی چاکسازیی تێدا بکرێت، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو واعیزەکان خۆیان پەیڕەوی ئەو ئامۆژگارییانەیان نەکرد کە بە خەڵکی دەدەن. ئەمەش ئەو بیرۆکەیەیە کە وەردی دە ساڵ بەر لە شەریعەتی لە کتێبی واعیزەکانی سوڵتان باسی کردووە، کە دەڵێ" واعیزەکان پشت بە لۆژیکی ئەفلاتوونی دەبەستن، لە وەعز و ئامۆژگارییەکانیان، سروشتی مرۆیی ناکرێت تەنها بە وەعز چاك بکرێت. واعیزەکانیش

خۆیان پەیڕەوی ئامۆژگارییەکانی خۆیان ناکەن، ئەوان لەسەر خوانی خۆشگوزەرانان دەژین".

وەردی خۆی لەوە بەدوور گرتووە، ڕەخنە لە ئایین بگرێت، بەڵکو ڕەخنە لە واعیزەکانی ئایین دەگرێت، کەچی شەریعەتی ڕەخنە لەوە دەگرێت ئایین بکرێتە هۆکارێك بۆ زاڵبوون بەسەر کۆمەڵگا، ئەمەش بە کەرکردنی خەڵك دەزانێ کە ئایین بە مەبەستی خۆت بەکاربهێنی. شەریعەتی واعیزەکانی لە پیاوانی دیکەی ئایینی جیانەکردۆتەوە، واعیزەکانیش لە ئێران بە (روزەخوان) هاتووە. بەمەش شەریعەتی خۆی خستە بەر ڕەخنەی توندی هەمووان. دەبینین وەردی لە کتێبەکانی دەڵێ سوننەگەریی محەمەد، شیعەگەریی عەلەوی یەك هزرن، جیاوازییەکە لە سوننەگەریی ئەمەوی و شیعەگەریی سەفەوی هاتووە. وەردی مرد هەر لەسەر ئەو بیروڕایە مایەوە. لە یەکێك لە کۆڕەکانی ڕۆژێك وتی" من پێم وایە ئایینی ڕاستەقینەی محەمەد لەگەڵ کوژرانی عەلی خرایە گۆڕەوە" دکتۆر عەلی شەریعەتی لە چوارچێوەی گێڕانەوە مێژووییە دووردرێژەکانیەوە ناونیشانی کتێبەکەی لە هزری وەردی خواستووە ئەمەش ناونیشانەکەیە: (شیعەگەریی عەلەوی و شیعەگەریی سەفەویی) لەو کتێبەدا شەریعەتی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە شیعەگەریی عەلەوی و سوننەگەریی محەمەد یەك بیرۆکەن، جیاوازییەکە لە سوننەگەریی ئەمەوی و شیعەگەریی سەفەوی هاتووە. ئەمەش وادەکات تەبایی لەنێوان ئەم دوو بیرمەندە ڕۆشن بێت، بەڵام وەدری بە دە ساڵ بەر لەوەی شەریعەتی هاتووە. ناتوانم بڵێم شەریعەتی کتێبەکانی وەردی نەخوێندۆتەوە، بەڵکو لە چەندین شوێن ناوی وەردی و کتێبەکانی

هێناوە.

ئـەم تێکسـتـەی وەردی کـە لـە بـەرگی یەکـەمی کتێبی چاوپێداخشانێکی کۆمەڵایەتییانە هاتووە، بە تەواویم بە فارسی لە کتێبەکەی دکتۆر عەلی شەریعەتی دۆزیوەتەوە، ئەمەش تێکستەکەی وەردییە:" شیعە لە سەرەتا ڕافزییەکان نەبوون، هەروەها سوننەش ناسیبەکان نەبوون. بەڵکو توندڕەوی، ئەوەی بە کەڵەکەبوونی هزری ناومان بردووە، بووە هۆی دەرکەوتنی ئەم ئەنجامە خەمگینە. ئەگەر هاتوو شیعە و سوننە لەم سەردەمەدا بیانەوێ یەکبگرن، ئەوا دەگەڕێنەوە سەر ئەو دروشمە کۆنانەی کە زەیدی کوڕی عەلی و ئەبوحەنیفە بەرزیان کردبۆوە، واتە دروشمی شۆڕش بۆ زاڵبوون بەسەر هەموو جۆرەکانی ستەم... لێرەشدا جیاوازی لەنێوان ستەمی شیعە و ستەمی سوننە نییە، ئامانجی ئایین دادپەروەریی کۆمەڵایەتییە. پیاوەکانیش شتێك نین، تەنها ئامرازێکن بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە پیرۆزە".

دکتۆر عەلی شەریعەتی دەڵێ" این بود کە تشیع صفوی کە نە تنها هیچ وجە مشترکی با تسنن نداشت، بلکە در قبال ان بوجود امدە بود، و همیشە تشیع و تسنن یکی بود. ولی متعصبان ان را ساختند".

دواتر دکتۆر عەلی وەردی دەڵێ" سوڵتانە سەفەوییەکان هیچ جیاوازییەکی سەرەکییان لەگەڵ سوڵتانەکانی عوسمانی نەبووە، هەموویان خودا دەپەرستن و بەندەکانی خوداش تاڵان دەکەن". عەلی شەریعەتی دەڵێ"زیرا هما نطور کە صفویە برای جنگ با عثمانی بە یەك نوع تشیع ایرانی نیازمند بود، عثمانی نیز برای جنگ با صفویە بە یك نوع تسنن ترکی تکیە میکرد، و بدین گونە بود کە اسلام واحد،

به دو دین متخاصم مستقل شد". وەردی دەڵێ" دەڵێن سیاسەت بچێتە ناو هەر شتێکەوە بۆگەنی دەکات، چووە ناو هەموو مەزهەب و ئایینەکانەوە خراپی کردن. ئێستا نەوەی نوێ دەبێت پەند لە ڕابردوو وەرگرێت، دەبێت لە نووکەوە ڕێبازی سەرکردە یەکەمەکانیان پەیڕەو بکەن، شۆڕش بەسەر هەموو شێوەکانی ستەمکاری بکەن. ئاکار ئەنجامێکە لە ئەنجامەکانی بارودۆخی کۆمەڵایەتی، ڕۆژئاواییەکان ئاکاریان چاك نەبوو تەنها ئەو کاتە نەبێت باروودۆخی شارستانی و ئابوورییان باش بوو". دکتۆر عەلی شەریعەتی دەڵێ" و درست در حالی که مسیحیت با رنسانس و بورژوازی تازه پا جان میگرفت و با علم و صنعت و پروت مجهز میشد و اسلام را تهدید میکرد، اسلام به جان اسلام افتاده بود و دشمن را فراموش کرده بود. با میلت ایرانی یك نهچت تازه و نیرومند بوجود اورد، واین دو قدرت در این نهچت چنان در هم جوش خوردند که قابل انفکاك نبودند".

تکام لە (خوێنەری عەرەب) هەیە سەرسام نەبێت بەوەی وەرگێڕانم بۆ تێکستە فارسییەکان نەکردووە. چونکە ئەگەر دەقاودەق نەبێت ئەوا تەواو لە ناوەڕۆك وەك بیروڕاکانی وەردییە. وەك ئەوە وایە کەسێك بە دەستکارییەوە کتێبێك وەربگێڕێ، لەمە زیاتر جیاوازییەکی نییە. کاتێك عەلی شەریعەتی ناوی خاوەن وتەکان ناهێنێ، پاساوەکەی لێی وەردەگیرێ، من بەخۆم پاساوی بۆ دەهێنمەوە، چونکە ئەو پیاوە دەرچووی زانکۆیە ئەورووپییەکانە، لە حوسێنیە وتاری دەدا، دواتر وتارەکانی لە شێوەیناملیکە کۆدەکرایەوە و دەکرا بە کتێب. ژیانی سیاسی شەریعەتی لەژێر سایەی ڕژێمی شای

ئێران زۆر ئاڵۆز بوو، هەمیشە لەنێو شارەکان دەگەڕا و بەدوای بوون، تا لە ئێران ڕایکرد و لە بەریتانیا تیرۆر کرا. بەڵام ئەوانەی ئەرکی پاراستنی ڕۆشنبیرییەکەی شەریعەتییان لە ئەستۆ گرتووە، پێویستە دووبارە کارەکانی ڕێکبخەنەوە و پۆلینی بکەنەوە.

ئەمە دیمەنی گواستنەوەی هەندێك کتێب و بیروڕاکانی وەردی بوو بۆ وڵاتی فارس، هەر کەسە و بەپێی خواستی زانستی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایینی بیروڕاکانی وەردی بردووە.

## مشتومڕە زانستییەکانی وەردی لە مەجلیسی خاقانیدا

بیرۆکەی دامەزراندنی مەجلیسی خاقانی، کە لەلایەن وەردییەوە پێشنیاز کرابوو، لەوە سەرچاوەی گرتبوو، وەردی شوێنێکی هەبێت بە سەربەستی قسەی تێدا بکات بێنەوەی قسەکانی پێ ببڕن و دواتریش لەلایەن ئامادەبووانەوە پرسیاری ئاڕاستە بکرێت و ئەویش وەڵامیان بداتەوە. لەبەر ئەوەی مەجلیسی ڕۆژانە ماندووکەر و لە کردەیی جێبەجێ ناکرێت، ئەوا وەردی ڕۆژی پێنجشەممەی بۆ مەجلیسی خاقانی هەڵبژارد، ئەم حاڵەتەش سێ مانگ بەردەوام بوو، کە مەجلیسەکە ناوبانگی پەیداکرد و ئەدیب و نووسەران ڕوویان تێدەکرد. ڕۆژی پێنجشەممەش کاتەکەی لەگەڵ کاتی کۆڕەکانی گرنگترین و ڕەسەنترین مەجلیسی بەغدا یەکی دەگرتەوە، ئەویش مەجلیسی شیعرباف بوو. کە جەماوەری ئەم مەجلیسە لە ڕووی سەلیقەی ئەدەبییەوە لەگەڵ مەجلیسی تازە دامەزراوی خاقانی هاوبەش بوون. بۆیە دەبووایە لە ڕۆژێکی دیکە بگەڕێین، کە تەنها ڕۆژانی دووشەممە و شەممە و سێشەممەمان بەدەستەوە بوو. چونکە هەموو ڕۆژەکانی هەفتە بەسەر مەجلیسەکانی بەغدا

دابەشکرابوو: بەیانی هەیینی بۆ مەجلیسی دکتۆر عەبدولحەمید هیلالی و مامۆستا مەکی سەید جاسم بوو، شەممە بۆ مونتەدای ئەبو حەنیفە بوو، یەکشەممە بۆ مامۆستا محەمەد جەواد غەبان بوو، سێشەممە بۆ مەجلیسی ئال محێدین بوو، چوار شەممە بۆ مونتەدای بەغدا و پێنج شەممەش بۆ ئال شیعرباف بوو. سەرەڕای ئەمانە مەجلیسی دکتۆر ڕەشید عوبەیدی و مەجلیسی دکتۆر خالید هزی مانگانە بوون یەکەم چوارشەممەی سەرەتای مانگی زایینی کۆڕیان دەکرد، مەجلیسی مامۆستا عەلی حەیدەری نیو مانگی بوو، بەداخەوە ئەم سێ مەجلیسە نەیانتوانی بەردەوام بن. هەروەها مەجلیسی مامۆستا غەبان لەوپەڕی توندی ئابلۆقەکە لە ساڵی ١٩٩٤ داخرا. دکتۆر ڕاجی تکریتی مەجلیسێکی نوێی دانا کۆڕەکانیان بە ڤیدیۆ تۆمار دەکرد، بەڵام دوای چوار مانگ لە دامەزراندنی بەهۆی لەسێدارەدانی دکتۆر ڕاجی تکریتی، مەجلیسەکە داخرا.

وەردی لە مەجلیسی خاقانی چەندین مشتومڕی زانستی ئەنجام دەدا، کە زۆریەیان یەکلایەنە بوو، واتە بە سەرکەوتنی بێوێنەی وەردی کۆتایی دەهات. ئەمەش بەهۆی ئەوە بوو پسپۆڕانی کۆمەڵناسی و پاراسایکۆلۆژی و مێژوو نەدەکەوتنە مشتومڕەکانی وەردییەوە. هەروەها وەردیش مشتومڕی لەگەڵ کەسانی دیکە نەدەکرد کە پسپۆڕی ئەویان نەبوو. هەمیشە ئەوەی دووبارە دەکردەوە، کە زۆر سوودی لەو کۆڕانە بینیوە بەتایبەتی کۆڕە نوشدارییەکان. پرسیارە هەمیشەییەکانی وەردی لەو کەسانەی کۆڕیان دەکرد هەمیشە ئەوە بوو کە لەبارەی کۆڕەکە لە زەینە بلیمەتەکەی دروست دەبوو. پرسیاری وەردی بۆ ئەو کەسانەی

کۆڕیان دەگێڕا گرنگ بوو، ئەم زانیارییەش بۆ مێژوو دەنووسم، بۆئەوەی کەسانی نەفسنزم فێربن ئەوانەی لە هەموو شتێك بەدوای کەموکوڕی دەگەڕێن تا خۆیان بە زانست هەڵبکێشن و گوایە لە شتێك تێدەگەن کەسانی دیکە تێی ناگەن. وەردی پۆزشی بۆ هەندێك لەو کەسانە دەهێنایەوە کە مشتومڕیان لەگەڵ کردووە، دەیگوت زانست پێشدەکەوێ، یان ئاگاداری ئەوە نییە کە دەیڵێن، یان بۆچوونی لەگەڵ ئەوان جیاوازە، پاڵپشتی بۆچوونی ئەوان دەکات. یانیش ئەگەر بابەتێکی نوێی گوێبیست بووایە ئەوا سەرسامی دەردەبڕی. من چەند مشتومڕێکی زانستیم هەڵبژاردووە بۆئەوەی سوودی خوێنەر و توێژەری هەبێت. ئەم گفتوگۆیانە بەڵگەی ئاکاری بەرزی ئەو زانایانەیە کە بەشدار بوون و قبووڵی بۆچوونی بەرامبەریان دەکرد، هەموو مشتومڕەکانیش بە خۆشەویستی و دۆستایەتی دەستی پێکردووە و تەواو بووە.

## مشتومڕ کردن لەگەڵ دکتۆر حوسێن عەلی مەحفووز

(حوسێن عەلی مەحفووز لە ساڵی ١٩٢٦ لەدایك بووە لە ساڵی ٢٠٠٧ مردووە. زانایەکی ئینسکلۆپیدی عێراقییە. لە زانکۆی تاران دکتۆرای لە ئەدەبی بەراوردکاری بەدەستهێناوە. لە زانکۆی لینینگراد بۆ چەندین ساڵ مامۆستا بوو، پرۆفیسۆر بوو لە زانکۆی بەغدا، زیاتر لە هەزار کاری بڵاوکراوەی لە وتار و کۆڕ و کتێب هەیە. ئەندامی بەشدار بوو لە زۆربەی کۆڕە زانیارییە عەرەبی و ڕۆژهەڵاتی و ئەورووپییەکان، تەنها کۆڕی زانیاری عێراقی نەبێت!) دکتۆر مەحفووز بۆ عەلی وەردی پێشنیاری بیرۆکەیەکی کرد، کە بیرۆکەیەکی زۆر گرنگ بوو هەر

سەبارەت بە کەسێتیی وەردی بوو. ئەویش ئەوەیە وەردی هەمیشە بەڵگە لە کتێبەکەی دیل کارنگی دەهێنێتەوە. وەردی پێی وایە ئەو خاڵە سەرەکییانەی کارنگی پیشتی پێ بەستووە بەکەڵك هەموو مرۆڤێك دێت بۆئەوەی بەتەواوی تێگەیشنەوە لەگەڵ کەسانی دیکە بژیت. وەردی پاڵپشتی ئەم قسانەی مەحفووزی کرد، دواتر مەحفووز وتی: وا باشترە ئەو بیرۆکانەی کە کارنگی پێشنیاری کردووە لەسەر خۆت جێبەجێ بکەیت، کە خۆت پشتگیری دەکەیت؟

وەردی سەرسام بوو، چونکە ئەو خەسڵەتی وەهایە لەماڵەکەی پێشوازی لە کەس ناکات، تەنانەت ئەگەر نەخۆش بێت تۆش سەردانی بکەیت، حەز ناکات کەس قسەی پێ ببڕێت، قبوولی زۆربەی داوەتنامەکان ناکات، حەز لە تەوقەکردن ناکات، لە کاتی سڵاوکردن رقی لە ماچکردنە، ئەگەر هاتوو ماچت دەکرد، بە دەنگێکی بیستراو دەیگوت" ماچ دەکات و دەموچاوی ئارەقی کردووە". وەك زانراوە رێبازی کارنگی ئەوها نەبووە، بەڵکو تەواو پێچەوانە بوو. وەردی پاڵپشتی قسەکانی مەحفووزی کرد وتی ئەرێوەڵا. ئینجا وتی: من وا ناکەم بەڵام دەبینم کۆمەڵگای عێراقیمان لە کوشکێشی و رووخۆشی زێدەرۆیی دەکات. ئەمە تەواو پێچەوانەی کۆمەڵگای ئەمریکییە کە ساردوسڕن، کوشکێشی کەم تێدایە. کارنگی داوا دەکات بگەڕێنەوە سەری. من هەوڵم داوە ئەو خەسڵەتانە لە خۆم بەدوور بگرم و دووەمیش دەمەوێ بانگەشە بۆ کۆمەڵگا بکەم بچنەوە سەر ئەو خەسڵەتانە. کەسێك لە کۆمەڵگای رۆژئاوایی بە جووڵەی سەر یان بەرزکردنەوەی دەست سڵاوت لێ دەکات، لەوانەیە سڵاوت لێ نەکات ئەگەر بینی تۆ سەرقاڵی یان خۆی بە کارێکەوە سەرقاڵ بێت، کەچی

کەسی عێراقی واز لە کارەکەی خۆی دەهێنێ و دێ سڵاوت لێ دەکات. گەرچی خۆی لە ئارەقەدا شەلال بووە کەچی زیاتر لە جارێک کولمت ماچ دەکات. زیاتر لە جارێک دەڵێ"چۆنی". ئەگەر تۆ وەڵامی بدەیتەوە، دووبارە دەڵێ"ئێ... چۆنی". کاتێک کەسێکی عێراقی دەچێتە مەجلیسێکەوە بە دەنگێکی بەرز سڵاو دەکات و دەڵێ"السلام علیکم" هەمووان بە هەمان دەنگ وەڵامی دەدەنەوە، کەچی هەندێک دەنگی بەرزدەکاتەوە و وەڵامەکەی درێژ دەکاتەوە بۆئەوەی ئەو سوننەتەی لەکیس نەچێ کە گوتراوە، وەڵامی سڵاو دەبێت لە سڵاوەکە چاکتر بێت. بەوەندەش ناوەستێ دەست بۆ تەوقەکردنی ئامادەبووان درێژ دەکات، یانیش لەگەڵ زۆرێکیان یەکتر ماچ دەکەن. هەرکە لەسەر کورسییەکەی حەسایەوە، ئەوا سەرلەنوێ دەنگ بەرزدەبێتەوە (بەخێر بێی) لەوانەیە یەکێک بڵێت" ئێوارەتان باش" ئینجا میوانەکەش وەڵامی دەداتەوە. توخوا پێم بڵێ ئەگەر کۆڕێک بکرێت و قسەکانیش بەمشێوەیە بێت، دوای ئەوەی چارەگە کاتژمێرێک بە بەخێرهاتنی کەسێکەوە خەریک بین، کە درەنگ هاتۆتە مەجلیس، تۆ چیت بیر دەمێنێ، جا ئەگەر هاتوو چوار کەس درەنگ بێن ئەوا دەبێت کاتژمێرێک بۆ سڵاوکردن و بەخێرهاتنیان بوەستین. دانای گەورەمان و مامۆستامان مەحفووز وتی: ئەگەر دیل کارنگی ئەو ڕەفتارەی عێراقییەکانی لە سڵاوکردن دەزانی، ئەوا کتێبێکی لە دژی دەنووسی!!

مامۆستا مەحفووز لە وەردی پرسی: دکتۆر ماوەی نیو سەدەیە نەخۆشییەکانی کۆمەڵگای عێراقی دەستنیشان دەکەیت، ڕۆشناییت خستە سەریان، لەگەڵت هاوڕابووین و لەگەڵت جیاواز بووین، باسی

دووفــاقی کەســێتیی عێراقیــت کــردووە، لێــت دەپرســین: تــۆ بــەو خەسڵەتەی کە زانایەکی کۆمەڵناسی، ئایا چۆن کۆمەڵگاکە لەو نەخۆشیانە چارەســەری دەبێــت؟ وەردی وتــی" ئــەرکی زانــای کۆمەڵناس نییە بەخێوکەری کۆمەڵگا بێت، بەڵکو ئەو دەردەکە دەدۆزێتەوە، ئەو توێژەری کۆمەڵگایە، ئەرکەکەی ئەوەیە ئاماژە بۆ دەردەکە و هۆکارەکانی بکات، دەرمان لەلای چاکسازی کۆمەڵایەتی و خاوەن دەسەڵاتە. ریفۆرمخواز بیرۆکەکان بە خەڵك دەگەیێنێ و هەوڵی چاککردنیان دەدات، خاوەن دەسەڵاتیش ئەو یاسایانە دەردەکات کە لەگەڵ چاکسازی کۆمەڵایەتی یەکدەگرێتەوە، تا کۆمەڵگاکە پابەند بێت بە یاساوە و ببێتە کۆمەڵگایەکی سوودبەخش. بەڵام ئەگەر هاتوو ریفۆرمخوازمان تێکدەر بێت و دەسەڵاتمان یاسای پێچەوانە دەربکات، تەنانەت بۆ سوودێکی کاتی رێگە بە تێکدانی کۆمەڵگا بدات، ئەوە کارەساتەکەیە.

دواجار ئەو تێکستە دەگوازمەوە کە بەشێکە لە دیمانەیەکی رۆژنامەوانی، ژنە رۆژنامەنووسی بەتوانا نەجات عەبدوڵڵا لەگەڵ دکتۆر حوسێن عەلی مەحفووزی ئەنجامداوە، بە ماوەیەکی کەم بەر لە مردنی مەحفووز، پرسیاری لەبارەی وەردی لێ دەکات و ئەویش بەمشێوەیە وەڵامی دەداتەوە: دکتۆر عەلی وەردی ئامۆزای باوکم و قوتابی ئەو بووە. خەڵك لەبارەی وەردی بۆچوونی جیاوازیان هەیە. ئەو مامۆستای ئامادەیی مەرکەزی بوو لە سەرەتای چلەکان، منیش ماوەیەك قوتابی ئەو بووم. وەردی ماوەیەك قوتابی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر بوو. چەندین تیۆری لە کۆمەڵناسی هەیە، لەوانە (شارنشینی و بیاباننشینی) (دووفاقی کەسێتی) (تیۆری عەقڵ)

هەروەها کتێبی (سروشتی کۆمەڵگای عێراق) سەرەڕای کتێبەکانی چەندین تیۆری هەیە، ئەم شتە گرنگانەی جێهێشتووە. ئەو نووسینانەی ئەو بە کتێبی سەردەم دادەنرێت لە ڕووی بابەت و بەشەکانییەوە. تەنانەت بە گرنگترین نووسینەکانی سەردەمەکە دادەنرێت. دیارترین بۆچوونی وەردی ئەوە بوو" ئیسلام لەگەڵ مردنی عەلی کوڕی ئەبوتالب نێژرا. کۆمەڵگا پێویستی بە شۆڕشێکی ئاکاری هەیە".

لە مەعریفەی خۆیدا بایەخی بە دوو سەرچاوە داوە، ئەویش قورئانی پیرۆز و فەرموودە و سوننەتی پێغەمبەرە. جێگەی داخە هەندێك خەڵك دەڵێن دوور بوو لە دین، بەڵام ئەو هەرگیز وا نەبوو... لێرەدا من قسە لەسەر پابەندبوون ناکەم، چونکە پابەندبوون بە ئایین بابەتێکی ترە... دەستنیشانکردنەکانی بۆ کۆمەڵگاکانی هاوچەرخ زۆر ورد بوو، لە بابەتە هەستیارەکانی ئەو: کەسێتیی تاکی عێراقی، بابەتی عەقڵی مرۆیی، شارنشینی و بیاباننشینی، دووفاقی کەسێتی بوو. ئەمانە ئەو بابەتانە بوون کە تیۆرە کۆمەڵایەتییەکانی خۆی لەسەر بونیاد ناوە. .. وەردی دۆستی کۆمەڵگا بوو، لەگەڵ خەڵکی سادە دادەنیشت و تێکەڵیان دەبوو، کاتێك گوێی لە بابەتێکی شیاو دەبوو، کاغەزی لە گیرفانی دەردەهێنا و بە دیقەت و بایەخەوە دەینووسیەوە.. خوالێخۆشبوو ڕازی نەدەبوو کەس لە کۆڕەکانی قسە بکات.. جارێکیان بینی یەکێك لەگەڵ هاوڕێیەکەی قسە دەکات. کاتێك پرسیاری لێکرد کابرا وتی" دەمەوێ کاغەزێك لە هاوڕێیەکەم داوا بکەم". وەردیش وتی" تۆ گوێ لە کۆڕ دەگری یان داوای کاغەز و قەڵەم دەکەی..". ئەمەش کارێکی ئاساییە بەلای کەسێك کە

موحازەرەیەکی زانستی دەدات. بەڵێ وەردی ڕقی لە نەحو (ڕێزمانی عەرەبی) بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کتێبەکانی هەڵەیەکی نەحوی تێدا نییە. لە ماڵەکەی خۆیەوە لە ناوچەی ئەعزەمیە بە پێ دەهات و ئایەتی (والليل إذا سجى) دەخوێند، بە دەنگێکی بیستراو دووبارەی دەکردەوە، کاتێك پرسیاری لێکرا وتی من نوێژ دەکەم، مەبەستی ئەوە بوو لە پردەکە دەپەڕێتەوە ئەو ئایەتە دەخوێنێتەوە.. چەندین نوکتە و بەسەرهاتی خۆش لە خوالێخۆشبوو دەگێڕنەوە.

ئەمە بۆچوونی مامۆستا مەحفووز بوو لەبارەی وەردییەوە، بە ئەنقەست ویستم هەمووی بێ دەستکاری بڵاوبکەمەوە، چونکە ئەو نووسینە لەگەڵ ئەو کتێبانەی لەبارەی وەردییەوە نووسراوە و دەڵێن مەی دەنۆشی و نوێژی نەدەکرد، دەمانخاتە دووریانێکەوە!! لەگەڵ نوکتەکانی وەردی تێکەڵ بووە، ئەو نوکتەی دەکرد بۆئەوەی بزانێ کاردانەوەکان لەبارەی قسەکانی ئەو چییە، گاڵتەی بە هەندێك تاکەکانی کۆمەڵگا دەکرد کە هیچ خەمێکی دیکەیان نییە تەنها خۆهەڵکێشان نەبێت لەبەردەم خەڵك، کە لەڕاستیشدا وەها نیین. بەڵام ئەوەی میتۆدێکی توێژینەوەی لەبارەی وەردی نییە، نوکتەکانی وەك خۆی گێڕاوەتەوە، وا دەزانێ پێشینەیەکی ڕۆژنامەوانی بەدەستهێناوە. من پێم وایە لەبارەی وەردی پێویست بەوە دەکات فەرهەنگ و ئەزموونی ساڵانێکت هەبێت تا هزری وەردی هەڵبوەشێنیتەوە و تێی بگەیت. ئەمە بۆچوونی مامۆستا مەحفووز بوو لەبارەی کوڕە خاڵ و هاوشاری و مامۆستاکەی، کە زیاتر لە شەست ساڵ لەگەڵی ژیاوە. تەنها گریمانەی ئەوە دەکەین کە بۆ خوێندن لەیەکتر دابڕاون یەکێکیان بەرەو ڕۆژهەڵات (ئێران و ڕووسیا)

ڕۆیشتووە، ئەویتریش بەرەو ڕۆژئاوا (ویلایەتە یەکگرتووەکان و پۆڵۆنیا) ڕۆیشتووە. ئەمە بابەتی یەکلاکەرەوەیە.

## مشتومڕکردن لەگەڵ دکتۆر عیسا خاقانی

دکتۆر عەلی وەردی لە مەجلیسی خاقانی کۆڕێکی لەبارەی عەقڵی مرۆیی سازکرد، دکتۆر شێخ عیسای خاقانیش لە کۆڕەکە ئامادە بوو. (شێخ عیسا کوڕی عەبدولحەمیدی خاقانی لە ساڵی ١٩٤٠ لەدایک بووە. زانای ئایین و فەلسەفەیە. لە نەجەف و قوم خوێندوویەتی. مامۆستای زانکۆی (دار التبليغ الاسلامي) بوو، لە قوم. لە زانکۆی سۆربۆن لە فەڕەنسا دکتۆرای وەرگرتووە. یەکێك بوو لە ڕێبەرانی شۆڕشی ئێران، بەڵام کاتێك شۆڕشەکە لە ئامانجەکانی دوورکەوتەوە، خاقانی لە شۆڕشەکە جیابۆوە. چواردە کتێبی چاپکراوی هەیە لەوانە: (ئێوە چاکترین ئوممەت بوون) ( هزری ئیسلامی) (ئاسایشی کۆمەڵایەتی) ( خێزان)...)

مامۆستا خاقانی لە ئیماراتەوە هاتبوو تا گوێ لە کۆڕەکە بگرێت. لەبەر گفتوگۆیە زانستییە نایابەکەی نێوان ئەم و وەردی، بەپێزترین کۆڕ بوو، هەتا ئێستاش هەندێك لە ئامادەبووانی خۆشەویست باسی دەکەن، کە شەوێك بوو لە شەوانی مەجلیسی خاقانی هەرگیز لەبیر ناکرێت. لەم کۆڕەدا وەردی عەقڵی بە هۆکاری هەموو ئەو خراپەکاریانە تۆمەتبار کرد کە لە جیهان ڕوودەدەن، ئەو هۆکاری هەڵگیرسانی جەنگەکان بوو، ئەو بەرپرس بوو لەو کاولکارییەی بەسەر گۆی زەوی هاتووە، ئەمەش لە ئەنجامی داهێنانەکانی بوو، کە چەکی کاولکاری دۆزیوەتەوە. سەرکەوتن و نوشستی پەیوەست نییە بە

عەقڵەوە، بەڵکو بەو لۆژیکەوە بەندە کە لە ئەستدا هەیە. هەروەها پێی وابوو عەقڵی مرۆیی بە سروشتی خۆی لایەنگری سروشتە کۆمەڵایەتییەکان و بەرژەوەندی تایبەت و سۆزە. جەختیشی لەسەر ئەوە کردەوە کە دژایەتییەك لەنێوان عەقڵی ناوەخن و عەقڵی ڕواڵەتی هەیە. عەقڵی ڕواڵەتی پەیوەستە بە ئارەزووە کۆمەڵایەتییەکان و سێکس، ئەمەش تواناکانی مرۆڤ ئیفلیج دەکات لەوەی ئەوەی هەیەتی دەریبخات.

عەقڵی مرۆیی بەڵایەکە بەسەر هەموو مرۆڤایەتی. ئەگەر عەقڵی نیچە نەبووایە ئەوا هزری هیتلەر دەرنەدەکەوت. ئەگەر مۆسۆلینی کتێبی (میر) ی میکیاڤیللی دەخوێندەوە، ئەوا بۆ داگیرکردنی جیهان لەگەڵ هیتلەر ڕێکنەدەکەوت. مرۆڤ بە عەقڵ ڕێگایەکی نامۆ دەگرێتەبەر، سەختییەکەش زیاتر دەبێت کاتێك زانایانی پەروەردە و ڕیفۆرمخوازان بە شێوازی ئەفلاتوونی تەژی دەکەن لە ئامۆژگاری و ڕێنمایی. لەوانەیە سەرکەوتنی کەسێك بدرێتە پاڵ بەخت، پەیوەندی بە عەقڵەوە نییە، بەڵکو کۆمەڵێك ڕێکەوتە کەسەکەی گەیاندۆتە سەرکەوتن، خودی خۆی خاوەن عەقڵێکی بلیمەتانە نییە.

شێخ عیسای خاقانی بەم شێوەیە وەڵامی کۆڕەکەی دکتۆر عەلی وەردی دایەوە و وتی: ئێمە بە وەعز و ڕێنمایی داوامان لە خەڵك نەکردووە بەدوای عەقڵەوە بن. بەڵکو ئامرازەکانی توێژینەوەی زانستی نوێ و میکانیزمەکانی بەکاردەهێنین بۆئەوەی بە بەهای عەقڵ بگەن، لە میانەی ئەزموون و ئەو هەڵەیەی کە دکتۆر وەردی باوەڕی پێیەتی. مرۆڤایەتیش لە توێژینەوەکانی دەیکاتە ڕێباز و جارنامەیەك بۆ هەڵکشان. بۆیە دەڵێین ڕێژەی ئەو کارەساتانەی بەسەر مرۆڤایەتی

هاتووە و وەك وەردی پێی وایە بۆ عـەقڵ دەگەڕێتـەوە، ئەمـە تـەنها ئاماژەیەکە بۆ جیانەکردنەوەی کاری عەقڵ و کاری غەریزە تـووڕە و ئاژەڵی و شەهوەتبازییەکان. عەقڵ داهێنانی کردووە و ئـەم دیارییـە سادەی بە مرۆڤ بەخشیوە، ئەمە ڕاستە! دواتر ئادەمیزادەکان خراپ بەکاریان هێنـاوە و ئـەم هۆکارانـەیان لـەپێناو کاولکـاری و بـەدکاری بـەکارهێناوە، ئەمەشـیان ڕاسـتە. لـە دینامیکـەوە تـا ئـەتۆم و هایدرۆجین، چەندین نموونەیە لە پێگەیشتنی عـەقڵ بـۆ شـکۆمەندی زانستی. عەقڵ فەرمانی بە خاوەنـەکانی نـەکردووە داهێنانـەکان بـۆ کاولکـاری زەوی و ئـەوەی لەسـەر زەوی هەیـە بـەکاربهێنن، بـەڵکو مرۆڤـی شـەڕانگێز پـەنای بـۆ غـەریزەی تـووڕەیی بـردووە لـەپێناو پارێزگاریکردن لـەخۆی ئەمـەی داهێنـاوە و کارەکـە ئـەو ئەنجامـەی لێکەوتۆتەوە.

بە کورتییەکـەی: غـەریزەی تـووڕەیی بەرپرسـی یەکەمـە لـە هـەر جەنگێك کە لە زەوی هەڵگیرساوە و خـوێنی تێدا ڕژاوە، غـەریزەی تووڕەیی پاڵی بە ستەمکاران ناوە تا ستەمکاری بکەن و سامانەکان تالان بکەن و واتاکانی دادپەروەری لەناوبـەرن، چـەمکی لـەناوبردنی جەستەیی دابهێنن. ئەمە غەریزەی تووڕەییە پاڵی بە ستەمکارەکانی زەوی ناوە تا هێرش بکەنە سـەر ئـاوەدانی و بـەناوی ئیسـتعمارەوە کاولکـاری بکـەن. وشـەی ئیسـتعماری عـەرەبی بـە سـتەمکاری بـۆ مەبەستێکی دیکە بەکارهاتووە، ئایا سـتەمکارتان بینیـوە ئـاوەدانی ئەنجام بدات (کە وشە عەرەبییەکە ئەمـە دەگـەیێنێ) یـان کاولکـاری ئەنجام دەدەن؟ مامۆستا عەلی وەردی لە سـایەی عەقڵـەوە زانسـتی بەدەستهێناوە، هەندێك جار قسەی تێکـەڵ دەکـات بـەهۆی غـەریزە

تووڕەیی و هەندێك جاریش بە غەریزەی شەهوەتە ئەم كارە دەكات.

عەقڵ لە زمانی عەرەبیدا بە مانای ئەوەی دێت (یعقل الامور) كە واتای جڵەوكردنی بابەتەكانە، ئەمەش وەك (عقالی) وشترە كە جڵەوی دەكات. بەمشێوەیە بابەتەكان لەلایەن عەقڵەوە دركیان پێدەكرێت و هەقیقەتەكانیان دەردەكەوێت. عەقڵ دوو مانای هەیە: ئەرێنی و نەرێنی. تۆ دەبینی ئەو درك بە شتەكە دەكات و دەگاتە قووڵایی زاتی شتەكە، دواتر بە ویستی خۆی جڵەوی دەكات. بۆیە دەبینی سرووش زانیارییەك ئاشكرا دەكات پێشتر پەنهان بووە، چەندین ڕەهەندی مەعریفی هەیە، لەوانە سەرەتای پێكهاتن و خاڵی دەستپێك لە جووڵەی دۆزینەوەدا عەقڵ بووە، وەك لە كتێبی پیرۆز ئاماژەی بۆ كراوە، یەكەم شت كە خودا دروستی كرد عەقڵ بوو[1]. وتەكانی خاقانی تەواو بوو من سەیری وەردیم كرد بۆئەوەی لە تێڕوانینی ئەو بطەم، ئەویش بە قسەكانی شێخی خاقانی سەرسام بوو. دواتر وەردی وتی: لە گەڵ هەموو ئەو قسانەدا نییم كە شێخ كردی، من پێم وایە عەقڵ بەرەو لەناوچوونمان دەبات، شتێكمان نەبینیوە تەنها كارەساتەكان نەبێت، شێخ وتی: من عەقڵم بەكارهێناوە تا گەیشتوومەتە ئەم ئەنجامانە، ئەو لەسەر هەقە، ئەمەش بەڵگەیە لەوەی كە من یەكێكم لە كارەساتەكانی عەقڵ!!

---

[1] ئەم گفتوگۆیە، گفتوگۆیەكی فەلسەفی و ئایینی بوو، دەقاودەق بە عەرەبییەكەی سەرجەم بۆچوونەكانی شێخی خاقانی دانراوە كە چەندین لاپەڕەیە، من لە وەرگێڕانە كوردییەكەی تەنها پوختەیەكم داناوە، پێم وابوو لابردنی كارناكاتە سەر ناوەڕۆكی كتێبەكە كە باس لە ژیان و هزری وەردی دەكات —وەرگێڕ

کاتێك لە مەجلیس پشووێکمان وەرگرت، وەردی پێی گوتم من زۆر دڵخۆشم بەو گفتوگۆیەی شێخ. زۆر سوودم لێ بینی. مامۆستا سەلام شەماعیش گوێی لەو قسانەی وەردی بوو. کاتێك بە منی وت: کە یەکەم جار شێخی خاقانیم بە جلوبەرگی ئاینی بینی پێم وابوو پیاوێکی کلاسیکی ئاینییە، بۆیە وامدەزانی کە کۆڕەکە دەگێڕم تەکفیرم دەکات، کەچی تووشی سەرسامی کردم کە بە شێوازی توێژینەوەی زانستی نوێ گفتوگۆی لەگەڵ کردم، لە گریمانەکانی پشتی بە بیرکردنەوەی فەیلەسوفانی ڕۆژئاوا دەبەست لە نموونەی کانت و دیکارت. مامە بەڕاستی من یەکەم جارە پیاوێکی عەمامە بەسەر دەبینم، باسی لە کێشە فەلسەفییەکانی لای دیکارت دەکات!.

## مشتومڕکردن لەگەڵ شێخ عەلی تەهرانی

(عەلی تەهرانی لە شاری مەشهەدی خۆراسانی ئێران لە ساڵی ١٩٣٢ لەدایك بووە، لە نەجەف خوێندوویەتی و مامۆستای عیرفان بووە لە قوتابخانە ئاینییەکانی تاران و مەشهەد. بەشداری شۆڕشی ئێرانی کردووە لە دژی شا، نوێنەری ئیمام خومەینی بوو لە تاران. دواتر بووە ئۆپۆزسیۆن لە دژی حکومەتی ئێران و لە سەروبەندی جەنگی عێراق و ئێران پەنای بۆ عێراق هێنا. هاوسەرگیری لەگەڵ خوشکی عەلی خامەنایی ڕێبەری شۆڕشی ئێران کردووە). دیداری وەردی لەگەڵ تەهرانی سەیروسەمەرە بوو، جگە لە من کەسێکی دیکە لەوێ نەبوو، بەڵام من و وەردی خوالێخۆشبوو، باسەکەمان بۆ ئازیزان و دۆستان گێڕایەوە.

قەدەر وابوو شێخ عەلی تەهرانی داوای لە حکومەتی عێراقی کرد لە

کازمیـەی پـیرۆز نیشـتەجێ بێـت. حکومـەتیش ماڵەکـەی ئـەوی لـە شەقامی موحیت دانا، کە دوای تەسـفیرکردنی هاوولاتیـان حکومـەت دەسـتی بەسـەر ئـەو شـەقامەدا گرتبـوو. جـا عـەلی تـەهرانی لـەوێ نیشتەجێ بوو، منـیش بـە حـوکمی دراوسـێیەتی و زمـانی فارسـی و پەیوەندی باوکم بە سـەرکردەکانی شۆڕشـی ئێرانـەوە، مـەحموودی کوڕی شێخ عەلیم ناسی، ئەوکات قوتابی کۆلیژی ئاداب بوو لە بەشی زمانی فەڕەنسی ( ئێستا وەك پزیشكێك لە پاریس كار دەكات). داوام لەو کوڕە کرد بە باوکیم بناسێنێ. ئەمەی کرد لە نزیکەوە شێخ عەلی تەهرانیم ناسی، هەندێك قسەی ئەوم لەبارەی سیاسەتەوە لێ بیست بۆ ڕاگەیاندن نەیکردبوو. لـەبارەی فەلسـەفە و عیرفانـەوە پرسـیارم لێکرد. ئەو شتانەی لێ فێربووم کە لە زانکۆ نەمخوێنـدبوو. ئـەویش لەبارەی مەجلیس و ئامادەبووانی مەجلیس پرسـیاری لـە مـن کـرد، منیش ناوەکانم پێگوت حـەزی دەکـرد دوو کەسـایەتییە گرنگەکـەی مـەجلیس مامۆسـتا مـەحفووز و دکتـۆر عـەلی وەردی بناسـێ، بـەڵام بابەتەکە سەخت بوو. من هێندە ئامادەیی سیاسیم تێدا نەبوو کە داوا لە حکومەتی عێراقی بکەم، ڕێگـە بـدات ئۆپۆزسـیۆنێکی ئێرانـی لـە مەجلیسێکی ئەدەبی عێراقـی ئامادەبێـت. لەوانـەبوو ئـەوکات ئەمـە ببووایە هۆکاری داخستنی مەجلیسەکە. بۆیە داوای لێبووردنم لێکرد، ئەویش بارودۆخەکەی لەبەرچاو گرت، منیش بە بیانووی کوڕەکەی بە دیـداری ئـەو دەگەیشـتم. تەنانـەت لایـەنی پەیوەندیـدار لـەبارەی دیدارەکانی من پرسیاریان لە کوڕەکەی کردبوو. ئەویش پاساوی ئەوە بـوو مـن فارسـی دەزانم و بـارودۆخی ئێـران شـارەزام و هـیچ هاوڕێیەکیشی لە عێراق نییە. شێخی تەهرانی داوای کتێبەکانی وەردی

کرد، ئەمەش کارێکی ئاسان بوو، بۆم ئامادە کرد. دوای ئەوەی تەنها بە هەفتەیەك کتێبەکانی خوێندەوە، داوای ڕێکخستنی دیدارێکی وەردی کرد، چونکە هەندێك هەڵەی لە کتێبەکانی وەردی دۆزیوەتەوە، دەیەوێ گفتوگۆی لەسەر بکات. هەروەها هەندێك تێبینی هەیە دەیەوێ بە وەردی ڕابگەینێ، منیش دیدارێکی بەیانیانم لە مەجلیس بۆ ڕێکخستن.

شێخ عەلی تەهرانی پێداگریی دەکرد بە زمانی عەرەبی قسە بکات، وایدەزانی بە شێوەیەکی دروست گۆی دەکات. منیش سوور بووم لەسەر ئەوەی وەرگێڕانی بۆ بکەم، چونکە جوولەی دەموچاوی وەردی لە هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە شێخ بە جۆرێك بوو خەریك بوو هاوسەنگیم لەدەست بدات. کاتێك لە بیرۆکەکە نەدەگەیشت دەمی بۆ لای ڕاست دەبرد، کاتێك شێخ قسەکانی دووبارە دەکردەوە، دەمی وەردی بۆ لای چەپ دەڕۆیشت، دواتر ڕووی لە من دەکرد و بە زمانێکی توند و فەرمانکەر دەیگوت" دەی تەرجەمەی بکە". منیش وەڵامم دەدایەوە دکتۆر شێخ بە عەرەبی قسە دەکات و پێداگریی دەکات بەردەوام بێت لە قسەکانی، دواتریش ڕووم لە شێخ دەکرد و بە فارسی دەمگوت" شێخ وا چاکتر ئێوە بە فارسی قسە بکەن و منیش وەرگێڕان بۆ دکتۆر وەردی دەکەم". کەچی ئەو بەردەوام بوو. ئەمەش بەشێکە لە گفتوگۆیەکە بەر لەوەی شێخ تەهرانی ڕازی بێت واز لە عەرەبی بهێنێ و بە فارسی قسە بکات، منیش بە تەرجەمە هەڵبستم و تەنگژەکە کۆتایی بێت.

شێخ عەلی تەهرانی وتی: دوکتر هناك خەلتون ما ئیندەکوم بین ما هو فەلەسەفەتون و ما هو مەنتغون.

دکتۆر عەلی وەردی بە سەرسامی دەمی بۆ لای ڕاست دەبرد!
شێخ عەلی تەهرانی دەیگوت: وەزعو عالمی فی بەیزەتون فەلسەفەتون ئەما کەیفتون وەزعی عالمی فی بیزەتون منتفون.
دکتۆر عەلی وەردی دەمی بۆ لای چەپ دەبرد، ئینجا ڕووی لە من دەکرد و دەیگوت" تەرجەمەی بکە شێخ چ دەڵێ لەوە دەچێ قسەکانی زانستی بێت".
منیش ڕووی قسەکانم لە شێخ تەهرانی دەکرد بە فارسی: شێخی ئێمە چەند جارێکە بابەتەکە دووبارە بکەمەوە، بەڵام دکتۆر تێی ناگات، ئایا ڕێگە دەدەن من تەرجەمەی بکەم؟
شێخ عەلی تەهرانی بە زمانی فارسی وتی: وا دەردەکەوێ دکتۆر وەردی عەرەبی فوسحا نازانێ!
منیش وتم: بەڵێ وا دەردەکەوێ، ڕێگە بدەن من تەرجەمەی بۆ بکەم بە زمانی عامیە نەوەک فوسحا!
دەستم بە تەرجەمە کرد. دکتۆری بەڕێزمان: شێخ عەلی تەهرانی دەڵێ ئێوە لە کتێبەکەتان فەلسەفە و لۆژیکتان تێکەڵ بەیەکتر کردووە. دەبوایە هەر زانستێك پێناسەی خۆی بۆ بکرایە، لەپێناو جیاکردنەوە ئەم نموونەیە دەهێنێتەوە، دانانی جیهان لە هێلکەیەك فەلسەفەیە، بەڵام چۆنیەتی دانانی جیهان لە هێلکەیەك ئەوا لۆژیکە (مەنتیق).
دکتۆر عەلی وەردی وتی: ئەرێوەڵا ئێستا تێگەیشتم!! دواتر وەڵامی دایەوە و وتی: لە زانستی نوێ لۆژیك بە لقێك لە فەلسەفە دادەنرێت، کەچی ئەرستۆ یەکەم کەسە کە کتێبێکی لەسەر لۆژیك داناوە بەو سیفەتەی زانستێکی سەربەخۆیە. ئەرستۆ قیاسی لە وێنەی بەڵگەهێنانەوە (استدلال) داناوە. توێژینەوە کۆنەکان دەستیان لە

لۆژیکی ئەرستۆ بەستووە کە من لە کتێبەکەمدا ڕەخنەم لێگرتووە. چونکە لەگەڵ ڕێنیسانسی ئەورووپی لۆژیک بۆتە زانستێکی تەواو جیاواز لە لۆژیکەکەی ئەرستۆ، ئەو کاتە ئیستقرا دەرکەوتووە کە بۆ خۆی ڕێبازێکە.

شێخی تەهرانی: ناکرێت سازش لە زانستی لۆژیك بکرێت. ئەو ڕێسا لۆژیکیانە زەین لە هەڵە دەپارێزن و بە بۆچوونی دروست دەگەن، عەقڵی دروست لەسەر ئەو ڕاستیە تەبایە. بەهۆی لۆژیکەوە هەڵە لە ڕاست جیادەکرێتەوە. زانستی فەلسەفە گەڕان بەدوای هەقیقەتی هەبووەکان (الموجودات) لەگەڵ سروشتی شتەکانە. هەموو شتێك لە ئیلاهیات گەڕانە بەدوای هۆکاری سەرەکی (العلة) و بزوێنەر کە ئەویش خودای گەورەیە، بۆیە پێویست ناکات فەلسەفە توێژینەوە لە ئاین بکات، بەڵام کۆششێکە لەپێناو مەعریفەی پەتی، لەو کاتەشدا جیاوازی نییە کاتێك هەقیقەتەکە سروشتی بێت یان ماتماتیکی.

بەڵێ ئەمە مشتومڕی نێوان کۆن و نوێ بوو، لەنێوان دوو قوتابخانەدا. شێخی تەهرانی زیاتر لە چل ساڵ لە حەوزە ئاینییەکان وانەی لۆژیکی کۆنی وتۆتەوە. دکتۆر عەلی وەردیش چل ساڵە بانگەشەی ڕەتکردنەوەی ئەم لۆژیکە دەکات و داوا دەکات ڕێبازە نوێیەکانی لە شوێن دابنرێت. بەر لەوەی کۆتایی بەم بابەتە بهێنم دەمەوێ ئاماژە بۆ شتێکی گرنگ بکەم، شێخ عەلی تەهرانی بۆ دکتۆر وەردی ئاماژەی بەوە کرد کە لە بەرگی چوارەمی کتێبی (چاوپێداخشانێکی کۆمەڵایەتییانە) ناوی شێخ عەبدولکەریمی جەزائیری هاتووە، بەڵام نووسراوە سەید عەبدولکەریمی جەزائیری. عەبدولکەریم سەید نەبووە چونکە لە بنەماڵەی پێغەمبەر نەبووە.

وەردی وتی دەزانم ئەو شێخ بووە، بڕوام وانییە بە (سەید) ناوی لە کتێبەکەم هاتبێ. داوای لێکردم کتێبەکە بهێنم، منیش هێنام شێخ عەلی تەهڕانی نیشانی وەردی دا کە جارێك ناوەکە بە سەید عەبدولکەریم هاتووە. وەردی پۆزشی هێنایەوە و بە منی وت:" ئەم موسیبەتەت لەکوێ هێناوە! هەموو عێراق ئەو کتێبەی خوێندەوە سەرەڕای زۆری ڕەخنەگرەکانی من کەچی کەس تێبینی ئەو هەڵە بێ مەبەستەی نەکردووە، تەنها شێخ عەلی تەهڕانی نەبێت".

## گفتوگۆیەک لە گەڵ عەبدولڕەزاق حەسەنی

یەکێك لە ئێوارەکانی ساڵی ١٩٩٠ مەجلیسی خاقانی ڕێزی لە مێژوونووسی گەورەی عێراق عەبدولڕەزاق حەسەنی گرت. (عەبدولڕەزاق حەسەنی لە ساڵی ١٩٠٣ لەدایك بووە لە ١٩٩٧ مردووە. یەکەم مێژوونووسی عێراقە، چەندین کتێبی هەیە: عێراق لەنێوان داگیرکردن و ئینتداب. شۆڕشی گەورەی عێراق، مێژووی وەزارەتەکانی عێراق[1] لە چەند بەرگێکدا، مێژووی ڕۆژنامەگەری عێراقی، نهێنییەکانی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی ١٩٤١، سابیئییەکان، ئێزدییەکان، بەهاییەکان.) شێخ عیسای باوکم و مامۆستا مەحفووز و دکتۆر وەردی لە پێشوازی مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنی بوون، کە خاتوو ئەحلامی کچی یاوەری دەکرد، ئەو ئافرەتە لە دوایین ڕۆژەکانی تەمەنی باوکیدا خۆی بۆ خزمەتکردنی باوکی تەرخان کردبوو، خودا پاداشتی بداتەوە.

---

[1] لە سەردەمی مەلەکی وشەی (الوزارة) هاتای (حکومەت) بەکارهاتووە – وەرگێڕ

ئێمە لەگەڵ بلیمەتەکانی مێژوو لە مەجلیسەکە بووین: وەردی لە کۆمەڵناسی، حەسەنی لە مێژوو، خاقانی لە ئایین و فەلسەفە، مەحفووز بە ئینسکلۆپیدیا زانستییەکەی، چەندین زانا و ئەدیبی عێراقیشیان بە دەورەوە بوو. وەردی قسەی لەبارەی حەسەنی کرد و وتی: ئەگەر حەسەنی لە وڵاتێکی دیکە بووایە ئەوا دەوڵەت پەیکەرێکی بۆ دروست دەکرد، ئەمەش لە بەرامبەر کارە دیارەکانی. ئەو مێژووی عێراقی بە چەندین کتێب نووسیوەتەوە لەوانە عێراق لەنێوان داگیرکردن و ئینتداب، دواتر لەسەر شۆڕشی بیستی نووسی، باسی لە مێژووی ڕۆژنامەگەری عێراقی کردووە، لەگەڵ شۆڕشەکانی عێراق بە نهێنییەکانیانەوە، باسی لە ئایینە جۆراوجۆرەکانی عێراق کردووە، تەنها ئەوەی نەقڵ نەکردووە کە لە کتێبە ئیسلامییەکان لەبارەی ئایین و مەزهەبەکان هاتووە، بەڵکو چۆتە لای ئەوان و دیداری کردوون و بۆ دەوڵەمەندکردنی بابەتەکە کتێبەکانی ئەوانی بەکارهێناوە. هێشتا لەبیرمە کە کتێبی بەیانی لەگەڵ پاشکۆی کتێبی بەهاییەکان بڵاوکردەوە، کتێبی بەیان باس لە باوەڕی بەهاییەکان دەکات، ئەو کاتە لە دژی حەسەنی قیامەت هەڵسا و کتێبەکانی بە گومڕایی وەسف کرد. چاکەی حەسەنی مەزن بە کتێبە نەمرەکەی مێژووی وەزارەتەکانی عێراق بەسەر مێژوو و کۆمەڵگای عێراقی دەمێنێتەوە. وێنای ئەوە بکەن ئەگەر حەسەنی ئەو مێژووەی نەدەنووسیەوە، لە کتێبێکی دانەدەنا ئەوا هیچی لێ نەدەمایەوە، چونکە لەگەڵ دانانی یەکەم حکومەت لە عێراق کەسێك نەبوو چاودێری ڕووداوەکان بکات و تۆماریان بکات. حەسەنی گرنگترین سەرچاوە بووە، من لە توێژینەوەم لەبارەی کۆمەڵگای عێراقی سوودم

لێ بینیـوە. حـەز دەکـەم سوپاسـی ئامـادەبوونی بکـەم، سـەرەڕای نەخۆشییەکەی، سوپاسی کچەکەشی دەکەم کە چاودێریی دەکات.

حەسەنی وەڵامی وتەکەی وەردی دایـەوە و وتـی: بـەڵێ هەسـتمان بەوە کردووە، مێژووی عێراق ڕاسپاردەیەکە لە ئەستۆماندایە. بەپێی توانا و تەمەنی خۆم ئەم ڕاسپاردەیەم هەڵگرتووە، کـە ئێسـتاش لـە کۆتاییەکانی ئەو ڕێگایەم. هیواخوازم کەسـانی دیکـە ڕێگاکـە تـەواو بکەن، بۆئـەوەی مێـژووی ئـەو وڵاتـە پـارێزراو بێـت. سـەرەڕای ئـەو قسـانەی دکتـۆر وەردی دەرهـەق بـە مـن کردوویـەتی، منـی بـە مێژوونووسـی عێـراق وەسـف کـرد، کەچـی مـن دەمـەوێ بـۆ مێـژوو بابەتێکی گرنگ ڕوون بکەمەوە. بەڵێ ئێمـە لـە مێـژووی عێـراق وەك ئەوە بووین لم و بـەرد و گـەچ و کـەرپووچ لـە شـوێنی دروسـتکردنی خانوو کۆبکەینەوە. ئەوەمان باسکردووە کە بینیومانە، چاودێریی ئەو شـتانەمان کـردووە کـە دەبووایـە چـاودێری بکرێـت، ئەمـە کـاری مێژوونووسـە، بـەڵام ئـەوەی کەرەسـتەکانی کـۆکردەوە بۆئـەوەی مێژووەکە دروست بکات، ئەو کەسە دکتۆر عەلی وەردی بوو. ئەو وەك ئێمە نەبوو کەرەسەی خانوو دروستکردن کۆبکاتەوە، بۆئەوەی خانوو دروست بکـەین، بـەڵکو ئـەو کۆکردنـەوەی هـەمووی ڕێکخسـتەوە. بەمەشـە بـووە یەکـەم زانـای کۆمەڵناسـیی مێـژوویی، لـە ناوچـەی عەرەبیدا توێژینەوە لەبارەی مێژوو دەکات وەك کۆنەکان نییە تەنها بیگێڕێتەوە، کە منیش یەکێك بووم لەوان. وەردی یەکەمین خشتی بۆ زانست لە عێراق دانـا، بـۆ پێشخسـتنی بـەگوێرەی میتـۆدی زانسـتە نوێیەکان..

ئەم وتانە وتەی ستایشکردنی دوو زانا نەبوو کە لە سەردەمی خۆیان

دەگمەن بوون. بەڵکو بەوردی دیارکردنی ڕۆڵی هەریەکەیان بوو لە توێژینەوەی زانستیدا کە هەردووکیان کولتوورێکی گەورەیان بۆ ئێمە جێهێشت ئاماژەیەکە بۆ هێزی زانستی میللەتەکە. میللەتانیش بە زانست پێوانە دەکرێن نەوەك شتی دیکە.

## مشتومڕ کردن لەگەڵ عەبدوڵلا فازڵ سامەڕایی

(خوالێخۆشبوو عەبدوڵلا فازڵ سامەڕایی لە هەشتاکان وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئایینی بوو. ئەندامی قیادەی قوتری حزبی بەعس بوو. لە ساڵی ۲۰۰۰ لە ناو ئۆتۆمبیلەکەی لەلایەن کەسانێکی نەناسراو تەقەی لێکرا و تیرۆر کرا) خوالێخۆشبوو مانگانە جارێك لە ژووری کلیلداری مەرقەدی کازمیە بە فازڵ شەبیبی دەگەیشت. ئەم بەسەرهاتە لەبەر گرنگییەکەی دەگێڕمەوە هەرچەندە لە مەجلیسی خاقانی ڕووینەداوە، بەڵکو لە ژووری کلیلدار بوو، ئەم شوێنەش زیاتر لە کیلۆمەترێك لە مەجلیسەکە دوورە.

دوای گۆڕینەوەی سڵاو و ڕووخۆشی نواندن، وەردی بینی وەزیر گوێی لە سکاڵا و کێشەکان دەگرێ. بەتایبەتیش دوای ئەوەی پرسیاری لە کلیلدار کرد چ کێشەیەکیان هەیە. سامەڕایی بەو سیفەتەی وەزیری ئەوقافە دەتوانێ چارەسەری کێشەکان بکات. لێرەدا وەردی چاکەی لە وەزیر بەدی کرد و ڕووی قسەکانی لە سامەرایی کرد و وتی: مامۆستا هەندێك پێداویستیی خەڵك هەیە هیوامان وایە چارەسەرێکی بنەڕەتییان بۆ بکەن. وەزیر وتی: باسی بکە ئەگەر چارە بەدەست من بێت، ئەنجامی دەدەم. وەردی یەکسەر وتی: من لە کازمیە بەدوای گۆڕێك دەگەڕێم بۆئەوەی تێیدا بنێژرێم. وەزیر بەم باسە سەرسام بوو وتی: دکتۆر تەمەن درێژ بیت. وەردی

دوای زەردەخەنەیەك، كە وەك زەردەخەنەی كەسێكی بێ هیوا بوو لە ژیـان، بـەردەوام بـوو لـە قسـەكانی وتـی: ئێمـەی خـەڵكی بەغـدا مردووەكانمان لە نەجەف دەنێژین. وەزیر وتی: چاكترین شوێنە نزیك باپیرمـان ئیمـام عەلییـە. وەردی وتـی بـەڵێ زۆرێـك لـە خـەڵك هیـوا دەخوازن لە نەجەف بنێژرێن كە نزیك میری موسڵمانانە، بەڵام بەلای جەنابتانـەوە شـاراوە نییـە، لـە سـایەی ئـەم ئابلۆقـە ئابوورییـە گواسـتنەوەی تـەرمێك بـۆ نەجـەف بەسـەر خـەڵكی بەغـدا گـران دەوەستێ، ئایا مرۆڤ لە عێراق سەرسام دەبێت لە ژیان و مردنیدا بۆ كوێ بچێت؟ وەزیر لەم پێشنیارە بوێرە سەرسام بوو، بەڵام لە دڵەوە لەگەڵ وەردی هاوڕا بوو. ئینجا وەڵامی وەردی دایەوە و وتی: دكتۆر حكومەتی شۆڕش گۆڕستانێكی گـەورەی ئامـادە كـردووە لـە نزیـك دەروازەی بەغدا، بیست كیلۆمەتر لە دەوروبەری بەغـدا دوور نییـە، ئەویش گۆڕستانی كەرخە، خەڵك بە گۆڕستانی محەمەد سەكراں ناوی دەبەن. بۆچی مردووەكانتان بۆ ئەم گۆڕستانە نابەن. وەردی وتـی: ئەم گۆڕستانە تایبەتـە بـە موسـڵمانانی سوننە. وەزیـر وتـی: بـەڵام هەندێك شیعەش مردووەكانیان لەو گۆڕستانە دەنێژن. وەردی وتـی: جەنابی وەزیر من ئەوە دەزانم، بەڵام قسە لـە سـەر زۆرینـەی خـەڵك دەكەم كە ناچنە گۆڕستانی سەكران. وەزیر وەڵامی دایەوە: جیاوازی لەنێوان شیعە و سوننە نییـە گۆڕسـتانەكە بـۆ هـەموو مردووەكانـە. وەردی وتی: جەنابی وەزیر تۆ پیاوێكی ڕۆشنبیری پێتوایە جیـاوازی لەنێوان مەزهەبەكان نییە، منیش پێم وایە جیاوازی لەنێوان ئایینەكان نییە، بەڵام من قسە لەسەر كێشە گشتییەكانی خەڵك دەكەم نـەوەك كەمینەیەكی ڕۆشنبیر. قسە لەسەر ئەو كەسانە دەكەم كە كولتوور و

مێژوویەکی خراپیان هەڵگرتووە، ئەوان لە ستەمی دەسەڵات دەترسن و قسە ناکەن، کە ڕۆژێك دادێت ئەم دەسەڵاتە لاواز دەبێت دەبینیت دەنگێکی زۆر بەرز دەبێتەوە.

وەزیر هەولێدا وەردی هێور بکاتەوە، وتی: ئێمە هەوڵ دەدەین کولتووری پێکەوە ژیان لەنێو پێکهاتە ئایینییەکانی گەل دروست بکەین. دکتۆری ئازیز ئەو کارانەی کردوومانە ئەنجامێکی باشیان هەبووە. وەردی وتی: کێشەکە ئەوەیە قەناعەتی ئێوەی بەو کارانەی کردووتانە پێچەوانەی ئەوەیە کە ئێمە لە واقیع دەیبینین، چونکە خەڵك لە ئێمە ناترسن و قسە لەبارەی مەینەتییەکانیان دەکەن و لەلای ئێمە گلەیی دەکەن. کاتێك ئێوە بە جلی سەربازی و پاسەوانەکان دەچنە لایان و پرسیار لە بارودۆخیان دەکەن، هەموویان چەپڵەتان بۆ لێدەدەن، بە دەنگی بەرز هوتاف بۆ شۆڕشەکەی ئێوە و خزمەتە دیارەکانتان لێدەدەن، ئەوان پێویستیان بە هیچ شتێك نییە تەنها سەلامەتی ئێوە نەبێت! کتێبێکی مێژوونووسێکی لوبنانیم خوێندەوە (موعجیزەیەك لەسەر لم، ئەحمەد عسە، بەیرووت، چاپخانەی ئەهالی لوبنانی ١٩٧٢) نووسەرەکە شانازی بەوە دەکات کە وەهابییەکان کاتێك هێرشیان کردۆتە سەر کەربەلا، گومەزی مزگەوتەکانیان تێکداوە و گۆڕەکانیان تەخت کردووە، ئەمەش وەك فەرمانی پێغەمبەر بووە. ئەم قسەیە ناکرێت دەرهەق بە کەسانی دیکە بکرێت، هەروەها ناکرێت ستایشی کارێکی دەبەنگانە بکرێت. هەر مرۆڤێك بیروباوەڕی خۆی هەیە، دەوڵەت دەبێت بە یەکسانی سەیری خەڵك بکات، نەوەك بیروڕای خۆی بەسەر خەڵك بسەپێنێ، گوایە تۆ باوەڕت بە جیاکردنەوەی مەزهەبەکان نییە. ئەمە بریتییە لە

دەستبەسەرداگرتنی بیروباوەڕەکان، ئەمەش ناکرێت. من قسە لەسەر ئەو کەسانە دەکەم کە ئایین و مەزهەبیان لە باپیرانەوە وەرگرتووە، بەو باوەڕ فێری خوداپەرستی بوون. قسە لەسەر ڕۆشنبیرێك ناکەم کە جیاوازی لەنێوان مەزهەبەکان نابینێ. ناکرێت هەموو کۆمەڵگا بکەیت بە کۆمەڵگایەکی ڕۆشنبیر، بۆئەوەی بتوانی بە شێوەیەك مامەڵەی لەگەڵ بکەیت تۆ و ئەویش ڕازی بێت!

بەمشێوەیە قسەکانی وەردی کۆتایی پێهات کە وا بۆ ئێمە و ئامادەبووانی ژووری کلیلدار دەرکەوت وەزیر پێی ڕازیبوو. وەزیر دانیشتنەکەی بەوە کۆتایی پێهێنا کە بابەتی گۆڕستان تاوتوێ دەکات، بەڵام بابەتەکە پێویستی بە ڕەزامەندی سەرکردایەتی هەیە. وەردیش یەکسەر وتی: کەواتە گۆڕستانم نەبوو!

## ئەو کتێبە بیانییانەی کە وەردییان کردۆتە سەرچاوەی خۆیان:

گەڕان بەدوای ئەو کتێبە بیانییانەی وەردییان کردۆتە سەرچاوەی خۆیان، کارێکی ئاسان نییە. پێویستی بە سەبر و کۆشش هەیە، هەروەها دەبێت پشت بە ئینتەرنێت ببەسترێت، کە زۆر بەکەڵکی من هات. من لێرەدا چەندین نموونە لەو سەرچاوانە بڵاودەکەمەوە کە وەردییان بەکارهێناوە، بۆئەوەی ماندووبوونی ئەو کەسانە کەم بکەمەوە کە لە دوای من توێژینەوە دەکەن. من ئەو سەرچاوانە بۆ سەر سێ گرووپ پۆلین دەکەم. گرووپی یەکەم ئەو نووسەرە بیانییانەیە کە وەردییان وەك سەرچاوە بەکارهێناوە. گرووپی دووەم ئەو نووسەرە عەرەبانەن کە بە زمانی ئینگلیزییان نووسیوە و وەردییان بەکارهێناوە. سێیەم ئینسکلۆپیدیا زانستییە بیانییەکانە کە

باسی وەردییان کردووە.

نووسەرە بیانییەکان:

Ibnkhaldun and Islamic id Bruce B. Lawrence
Political Thought in medir Erwin Rosenthal
IbnkhaldunRobert Simon
Ibnkhaldun Allen James Fromherz
Beyond Eurocentrism : A New View of modern world history peter gran
In the pas of god : Islamic and poltical power Daniel pipes 1983
The meadows of god : the Abbasids , paullundecaloline stone 1989
The continuity of village and orban cultural patterns ib 20 thjhongulik
Sociology oxford brookessusanjane 1977
Coercion , capital, and European states ad 1990-1992 charles tilly
Inventing Iraq toby dodge
The shi,is of Iraq yitzhalnakash 2003
Fundamentalisms and society : reclaiming the sciences the family , marty , r.scott Appleby 1997

هەندێک لەو نووسەرە عەرەبانەی بە زمانی ئینگلیزییان نووسیوە و وەردییان کردۆتە سەرچاوەی خۆیان:

Encounter of history and modernity ,mohammed jabber al nasari
The occupation of Iraq winning the war losing the peace aliallawi
Society , state and urbanism ibnkhaldun s sociological thought fuadbaali
Desiring arabs joseph a massad 2007

ExrremistShiites : the ghulatsectsmattimoosa 1987

**هەندێک لەو ئینسکلۆپیدیا جیهانییانەی باسی وەردییان کردووە، ژیاننامەی ئەویان داناوە:**

Middle east volume 2001
Studies of islam - volume 15-16
The science of human social organization
Social policy & sociology
Comparative studies of south asia , Africa, and the middle east – volume 19- 1999
Encyclopaedic historiography of the muslim world



# بەشی چوارەم

## وەردی و سیاسەت

- لە مێژوودا: جیاوازی ڕێبازەکان
- لە ئێستادا: سیاسەت هونەری ئەگەرە ڕەخساوەکانە، پڕاگماتیزم ڕێبازێکی ڕاستگۆیە
- دیموکراسی، هاوولاتیبون، دەسەلاتی یاسا
- لەگەڵ دەسەلاتدارانی عێراق
- فەیسەڵی یەکەم: سەرسامم
- مەلیک غازی: لە سیاسەت نازانا
- مەلیک فەیسەڵی دووەم: عەبدولئیلاە دەسەلاتی مەلەکی لە عێراق لەناوبرد
- عەبدولکەریم قاسم ڕێبەری گەل بوو کەڵکی سەرۆکایەتی عێراقی نەبوو
- عەبدولسەلام عارف یەکەم کەس بوو عێراقی لە ڕووی تایفییەوە پارچە پارچە کرد
- عەبدولڕەحمان عارف: هەلێک بۆ ئازادی لە کاتێکی تەنگدا
- ئەحمەد حەسەن بەکر و دەسەلاتی هۆز
- سەدام حوسێن: وەردیم خۆشناوآ. وەردی: ئەگەر لە سیاسەت تێناگەی وازی لێبهێنە و بڕۆ

## • وەردی و سیاسەت

لە بەشی سێیەم باسی ئەو شتانەم کرد کە پەیوەندی بە ئاراستەی وەردی هەبوو لە فەلسەفە و سیاسەتدا، وتم سیاسیەکی پراگماتی بوو، باوەڕی بەوە هەبوو کە سیاسەت هونەری مومکینەکانە. ئەمە لە بەشی پێشوو وتوومە دووبارەی ناکەمەوە. وەردی میتۆدێکی ژیانی سیاسی تایبەت بە خۆی هەبوو کەسێك هاوشێوەی ئەو لە دانانی میتۆدێکی وەها سەرکەوتوو نابێت. بەتایبەتی لە ساڵانی دوایی تەمەنی لەژێر دەسەڵاتی بەعسدا، کە پەیوەندی هەردوولا پچڕابوو، نە بەعسییەکان چارەی وەردییان دەویست و نە وەردیش چارەی ئەوانی دەویست دەگمەن نەبێت. من و مامۆستا مەحفووز یاوەریی وەردیمان کرد، بۆ ڕۆژنامەی جمهوریە، بۆئەوەی وەردی پاداشتی وتارەکانی وەربگرێت کە لە ڕۆژنامەکە بڵاوی دەکردەوە. وەك دەردەکەوت مامۆستا سەعد بەزاز کە ئەو کات سەرنووسەری ڕۆژنامەکە بوو، لە نهۆمی سێیەم ئێمەی بینیوە کاتێك دەچووینە ناو بارەگای ڕۆژنامەکە، لە پرسگە بە ئێمەیان ڕاگەیاند ئەوان یاوەریمان دەکەن بۆ نووسینگەی سەرنووسەر، کە لە چاوەڕوانی ئێمەدایە. لە نووسینگەکە چاومان بە عەباس جەنابی کەوت کە سەرنووسەری ڕۆژنامەی بابل بوو، دواتر مامۆستا زوهێر عامری بەڕێوەبەری نووسین و سەلام شەماع هاتنە نووسینگەی سەرنووسەر. دوای نیشاندانی ڕوویەکی خۆش مامۆستا عەباس جەنابی داوای لە دکتۆر وەردی کرد کاتێك بۆ دیداری عودەی سەدام حوسێن دیار بکات، کەچی وەردی مکوڕ بوو لەسەر ڕەتکردنەوە بە گاڵتەکردنەوە وتی" بابە بۆ پیاوی بەتەمەنی وەك من شیاو نییە لە بەرامبەر عودەی کڕنووش بەرم. من نابمە بابلی

(مەبەست لە ڕۆژنامەی بابلە) لێم گەڕێ با جمهوری بم باشترە. جیا لەمەش وشەی بابلی لەلای عەوامی خەڵکی بەغدا بۆ بەهاییەکان بەکاردەهات. جا ئەوانەی لە بەعس وەردییان خۆشدەویست، هەلێکیان دەقۆزتەوە بۆئەوەی گوێی لێ بگرن، دواتر ون دەبوون.

پەیوەندی حزبی بەعسی دەسەڵاتدار لە عێراق لەگەڵ وەردی هەڵکشان و داکشانی بەخۆیەوە بینیوە. هەر لە فەرامۆشکردنی وەردی لە سەرەتای کودەتای بەعسییەکان لە ساڵی ١٩٦٨ تا خانەنشینکردنی وەردی لە ساڵی ١٩٧٠ . وەردی لە درێژایی ماوەی حوکمڕانی بەعس هیچ کتێبێکی بڵاو نەکردۆتەوە، تەنها ئینسکلۆپیدیاکەی نەبێت بەناوی چاوپێداخشانێکی کۆمەڵایەتییانە بە مێژووی نوێی عێراق کە لە ساڵی ١٩٦٩ بڵاوی کردەوە، تا ساڵی ١٩٧٩، ئەمەش ئەو ساڵە بوو کە سەدام حوسێن جڵەوی دەسەڵاتی لە عێراق گرتە دەست. ئەو کاتەش وەردی لە نووسین وەستا، بەشی شەشەمی کتێبەکەی تەواو کرد کە لەبارەی ڕووداوەکانی ١٩٢٤ بوو لە عێراق، دواتر بە پاشکۆیەك بابەتی ئەشراف و ئیبن سعودی تەواو کرد. ئێمە دوای ئەوە تەواوکەری ئەم توێژینەوە کۆمەڵایەتییەمان نەبینیوە، تا کاتی مردنی وەردیش، میراتگرەکانی دەڵێن لە کتێبخانەکەی وەردی هیچ دەستنووسێکیان نەدۆزیوەتەوە.

ناوی عەلی وەردی ون بوو، تەنها لە وتارە ڕۆژنامەوانییەکان نەبێت کە لێرە و لەوێ بڵاو دەکرایەوە. قسە لەسەر دەرکەوتنی زانایانی نوێی کۆمەڵناسی دەکرا کە شۆڕشێکی فیکرییان ئەنجام داوە و خەڵاتیان بەدەستهێناوە... ڕووداوەکان لە بەدمەبەستی و نیازشاردنەوە، وەردیان وەلا نا. تا ئەو کاتەی ژنە ڕۆژنامەنووسی

ئەمریکی کریستین هۆڵمز بە دیداری سەدام حوسێن گەیشت لە ساڵی ١٩٨٣ ، لەسەر بۆچوونەکەی وەردی لەبارەی کۆمەڵگای عێراقی مشتومڕی لەگەڵ سەدام کرد. سەدام بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی وەردی وەڵامی دایەوە و وتی بڕواکەی تەواو پێچەوانەی دکتۆرە. لەو کاتەوە جارێکی دیکە بایەخ بە وەردی درایەوە، بەڵام ئەمجارەیان بە شێوەیەکی نێگەتیڤ. بۆ بەعسییە توندڕەوەکان دەرکەوت کە کەسێك هەیە لە عێراق سەرپێچی سەدام حوسێن بکات. ئەم سەرپێچیکارەش زانایەکی کۆمەڵناسە، بەساڵاچووە. ناکرێت بە فیشەك بکوژرێت، یان لە گۆڕەپانێکی گشتی لەسێدارە بدرێت، چونکە ئەمە کێشە بۆ دەوڵەت دروست دەکات. بۆیە بڕیاریان دا بەهێمنی بیکوژن، بۆ ئەمەش کەلوپەلەکانیان ئامادەکرد.

بۆئەوەی لەم بارەیەوە لەخۆمەوە قسە نەکەم. دەمەوێ دوو بەسەرهات بگێڕمەوە، یەکەمیان من شاهێد بووم و مامۆستا سەلام شەماعیش بەشدار بوو، دووەمیان خودی سەلام شەماع دەیگێڕێتەوە. پوختەی بەسەرهاتی یەکەم ئەوەیە: هەندێك لە دۆستان و ئازیزان پێیان ڕاگەیاندین کۆبوونەوەیەك لە مەجلیسی قیادەی سەورەی بەعس ئەنجام دراوە، باس لە مەسەلەی دیموکراسی کراوە لە عێراقدا، تا لە ئەزموونێکی نوێ کەمێك دیموکراسی بە گەل بدرێت، کەچی یەکێك لە بەرپرسان کە ئەندامی مەجلیسی قیادە بووە، ناڕەزایی دەربڕیوە لە کردنەوەی دەرگای دیموکراسی، ئەمەش لەبەر بوونی بیرمەندێکی وەك وەردی! بەمشێوەیە بیرۆکەکەمان پێگەیشت.... وتیان ئەم قسانە لە کتێبێك بڵاودەکرێتەوە کە تەنها بەسەر بەعسییەکان دابەش دەکرێت. دوای چەند ڕۆژێك مامۆستا سەلام

شەماع پێی ڕاگەیاندین کە کتێبەکەی لە یەکێك لە بەعسییەکان خواستووە دەبێت لە ماوەی هەفتەیەك بیگەڕێنێتەوە. کتێبەکەی بە وەردی دا، بۆئەوەی سەیری مشتومڕی مەجلیسی قیادە بکات کە لەبارەی دیموکراسییەوە ئەنجام دراوە. لە کتێبەکەمان خوێندەوە کە خودی سەدام حوسێن لە ساڵی ١٩٩٣ داوا لە مەجلیسی قیادە دەکات کەمێك دەرفەتی دیموکراسی بە عێراقییەکان بدرێت. وەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی ئەو کات کە لەتیف نوسەیف جاسم بووە، نارەزایی دەردەبرێت، پاساوی نارەزاییەکەشی ئەوەیە کەسێك لە نێو خەڵك دەژیت، ئەویش ناوی دکتۆر عەلی وەردییە، لە کتێبەکانی جنێوی بە خەلیفەکان داوە، وەردی لە یەکێك لە کتێبەکانی دەڵێ خەلیفە هاروونە ڕەشید ٢٠٠٠ کەنیزەی هەبووە! چۆن ڕێگە بە خەڵکانی هاوشێوەی وەردی بدرێت بۆئەوەی لە ژێر سایەی دیموکراسی قسە بە خەلیفە مەزنەکانی وەك هاروونە ڕەشید بڵێن... هەندێك لە ئەندامانی قیادە بە بیرۆکەکەی ڕەفیق لەتیف ڕازی دەبن... بەمەش بابەتی مشتومڕەکە دەگۆڕێت.. لەڕاستیدا دوای ماوەیەکی کورت منیش توانیم لە ڕێگای یەکێك لە برا بەعسییەکان دانەیەك لە کتێبەکە پەیدا بکەم. هەتا ئێستاش پاراستوومە، ناوەکەی (دیموکراسی، مشتومڕی مەجلیسی قیادەی سەورە، وێنەی بەرگەکەشی هی خودی سەدام حوسێنە) وەردی ماوەی مانگێك کتێبەکەی لە کتێبخانەکەی خۆی پاراستبوو، ئەمەش مامۆستا سەلامی تووشی شەرمەزاریی کردبوو، لە بەرامبەر ئەو کەسەی کە کتێبەکەی لێ خواستبوو. شەوێکیان مامۆستا شەماع گەیاندنەوەی وەردی کردە هەلێك سواری ئۆتۆمبیلەکەم بوو، تا گەیشتینە ماڵی

وەردی، لەوێ داوای کتێبەکەی کردەوە بۆئەوەی بە خاوەنەکەی بداتەوە. وەردی وتی: وەرنە ژوورەوە تا قسە لەبارەی کتێبەکەوە بکەین. چووینە کتێبخانە بچووکەکەی وەردی کە لە نهۆمی خوارەوە بوو، کتێبخانەیەکی گەورەشی لە نهۆمی سەرەوە هەبوو، کتێبخانە بچووکەکە گرنگترین کتێب و سەرچاوەکانی لەبارەی توێژینەوەکانی لەخۆگرتبوو. لەگەڵ مێزێکی نووسین، قەرەوێڵەیەکی یەك کەسی بۆ نووستن و ڕاکشان. سەرەڕای بوونی ڕۆپایەکی بچووك. وەردی لە کتێبخانەکە گەڕا و بەگاڵتەوە وتی" شتێك هەیە ئەم کەرە لەو قوڕە دەریبهێنێ". دەبێت خۆت وێنای بکەیت مەبەستی وەردی چی بووە ! دواتر کتێبەکەی دۆزییەوە و بە شەماعی دایەوە. ئەم مشتومڕانەی کە لە مەجلیسی قیادەی سەورە ڕووی دابوو، شتێك نەبوو، تەنها نموونەیەکی واقیعی بوو لە زەبروەشاندن لە فیکری وەردی.

بەسەرهاتی دووەم کە مامۆستا سەلام شەماع لە دیمانیەکی ڕۆژنامەوانی دەیگێڕێتەوە، یەکێکە لەو کارانەی لە ئەنجامی سیاسەتی بەعس لە دژی وەردی ئەنجام دراوە، وەك شەماع دەڵێ ئەم قسانە دڵدەگوشێ. من ئەم تێکستەی خوارەوە لە دیمانەکەی شەماع دەگوازمەوە کە بامیرە شێخلی لەگەڵی ئەنجام داوە، لە سایتی (دراسات في فكر الوردي) بڵاوکراوەتەوە. سەلام شەماع دەڵێ:"هێندەی من بزانم تەنانەت ئەو مێزە تایبەتەشیان هەڵگرت کە لە بەشی کۆمەڵناسیی کۆلیژی ئاداب تایبەت بوو بە وەردی. نەریتێك لە زانکۆی بەغدا هەبوو، هەر کەسێك پلەی (پرۆفیسۆری فەخری)ی هەبووایە، ئەو مێزەکەی تایبەت دەبوو، لە دوای ئەویش هەڵنەدەگیرا نەدەبوو کەس بەکاری بهێنێ. پرۆفیسۆرەکە خۆی هەر کاتێك

دەیویست دەیتوانی بەکاری بهێنێ، ئەمەش وەك ڕێز و پێزانین بوو بۆ خزمەتە زانستییەکەی. جگە لەمەش لە کۆڕ و کۆبوونەوەکان بانگهێشتی وەردی نەدەکرا، وەك چۆن بانگهێشتی پرۆفیسۆرەکانی دیکە دەکرا. ئەگەر ئەو نامەیە بخوێنیتەوە، کە وەردی ئاراستەی تەها نعێمی سەرۆکی زانکۆی کردووە لە بەرواری ١٩٨٩/٩/١٤، کە بە دەستخەتی وەردی لە کتێبەکەم بڵاوکراوتەوە، تەنها لەبەر شێواز و گلەییەکەی وەردی دڵتەنگ دەبیت. بەتایبەتی لە کۆتایی نامەکەیدا هاتووە" بەڕێزم سەرۆکی زانکۆ... من بەلامەوە گرنگ نییە پرۆفیسۆری فەخری بم، یان خانەنشین، هەردووکیان بۆ کەسێکی وەك من کە لە ڕۆژانی دوایی تەمەنیەتی وەك یەکە. بەڵام ئەوەی بەلامەوە گرنگە ڕاستیەکە بزانم، من لە بەرگی ئەو کتێبەی لە ساڵی ١٩٧٠ دەرچووە نووسیومە- لەسەر داوای خۆی خانەنشین کراوە- من پرۆفیسۆری فەخرییم، لەوانەیە لە دوایین ڕۆژەکانم کتێبی دیکەم دەربچێ. تکایە ڕاستیەکەم بۆ دەربخەیت، بۆئەوەی بۆ خوێنەرانی ئاشکرا بکەم، فێڵیان لێ نەکرێت. بەهەرحاڵ خودا پەنامانە".

ئەم نامەیەی مامۆستا سەلام شەماع دەیگوازێتەوە، نامەیەکی ئاسایی نییە، ئەگەر هاتوو کەسێك بیخوێنێتەوە، دەزانێ وەردی بۆ مێژوو بە ڕوونی چی وتووە. وەردی بە حکومەت دەڵێ" فەرامۆشکردنم لەلایەن ئێوە، بەلامەوە گرنگ نییە، جا پرۆفیسۆر بم یان خانەنشینکراو، بە دیدی من وەك یەك، ئێوە بەلای من شتێك نین، ئەوەی بەلامەوە گرنگە درۆ لەگەڵ خوێنەران نەکەم، بە من فریو نەخۆن، ئەو لەم نامەیەدا بە پلەی ئیمتیاز ئەوە دیار دەکات، لە ساڵی ١٩٧٠ لە نووسین و دەرکردنی کتێب وەستاوە، جەختیش

دەکاتــەوە وەك ئــەوەی هەڕەشــە بکــات، لەوانەیــە کتێبــی دیکــە دەربکات، واتە ڕایدەگەینێ کە کتێبی دیکە هەیە هێشتا دەرنەچووە. بۆیە دەیەوێ هەقیقەت بە خوێنەرانی خۆی بگەینێ، بۆیــە تکا لــە ســەرۆکی زانکــۆ دەکــات هەقیقەتەکــەی بــۆ ڕوون بکاتــەوە، لــە کۆتاییەکەشدا وەك ئەوەیــە لــەوە بترســێ نامەکە بگاتــە دەســتێکی سیاسی، بۆیە وەردی بە بۆمبێك دەیچنێتەوە و دەیداتە دەست سەلام شەماع کە دەڵێ" بەهەرحاڵ خودا پەنامانە..". بەڵێ خوا تەنها پشت و پەنامانە ئەمەش نامەیەکی ئاسایی نییــە، بــەڵکو زۆر لــەوە نزیکــە کتێبێك بێت بۆ ڕیسواکردنی ســەردەمێکی تــەواوی سیاسی لەلایــەن وەردییەوە. سوپاسی خوا دەکەین مامۆستا سەلام شەماع توانی ئەم نامەیە بگەینێتە خەڵك و بە ئەمانەتەوە بڵاوی کردەوە.

ئەم نامانە بە تەنها بەڵگەی ناکۆکی نێوان دەسەڵات و وەردی نییە، بەڵکو لە دووتوێی ئەم کتێبە بۆچوونی هەریەکەیان لەبارەی ئەویتریان دەزانــی. بۆچــوونی وەردی لــەبارەی دەســەڵاتی بــەعس و ســەدام حوسێن، هەروەها بۆچوونی سەدامیش لەبارەی وەردییەوە، کە من لە سەرچاوەیەکی ئاگادار بەدەستم گەیشتووە.

وەردی لــە دوایــین بەشــی کتێبــی چاوپێداخشــانێك وەك ئــەوەی پێشبینییەکی بۆ کۆمەڵگا هەبێت کە چی ڕوو دەدات، ئەمە لەبارەی کۆمەڵگاکەوە دەڵێت کە لەم تێکستەدا هاتووە" دەکرێت لەم ڕووەوە کۆمەڵگا بە کەسێتیی مرۆڤی پێگەیشتوو بشوبهێنی، کە لە ئێستایدا کاریگــەری ڕابــردووی لەســەرە، لەوانەیــە ئــەم کاریگەرییــە لــە ڕووی نەستەوە بێت، بەڵام بەهەرحاڵێك بێت بوونی هەیە، بە شێوەی گرێی دەروونی دەردەکەوێت کە پاڵ بە مرۆڤەکــەوە دەنــێ هەنــدێك کاری

پڕوپووچ ئەنجام بدات، جا ئەو کارە بەهۆی هاندەرێکەوە ئەنجام دەدا، کە لە ویستی ئەودا نییە، خەریکە باوەڕ بەمە بهێنم کە کۆمەڵگا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەم تاکە نییە، چونکە زۆرجار ڕووداوەکانی رابردوو لە کۆمەڵگادا گرێیەکی وەك گرێی دەروونی دروست دەکەن. بە شێوەیەك دەبینی خەڵکەکە بە پاڵنەری نەستەوە بەرەو هەندێك نەریت و بیرۆکەی باو دەڕۆن، کە ئەمەش بەرەو نەهامەتییان دەبات، کەچی وا دەزانن کارێکی چاك دەکەن، لەم کتێبەشدا چەندین نموونەی واقیعی دەبینین". بەڵێ وەردی ئەمەی وت، ئەوەی پێشبینیشی کرد هاتەدی. ماوەی نێوان پێشبینی و ڕووداوەکە بیست و سێ ساڵ بوو. ئێمە گوێمان لە خۆی و بۆچوونەکانی گرت، کە بەداخەوە نەنووسراو لەبەر ئەو بارودۆخەی کە وەردی بەخۆی لێکدانەوەی بۆ کردووە، ئەوەی وەردی چەندین جار دووبارەی دەکردەوە کە لە کتێبێکدا دەینووسێ کە دوای مردنی چاپ دەکرێت، هەڵبەتە هەر بەمشێوەیەی دەنووسی، کەچی میراتگرەکەی هیچ دەستنووسێکی ئەویان نەدۆزییەوە.

لەم بەشە کورت و پوختەدا، کە لەگەڵ جومگەکانی ڕووداوەکانی ژیانی سیاسی وەردی یەك دەگرێتەوە، کە لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد، لەگەڵ بەسەرهات و چیرۆکەکانی بەشی دووەم، ئینجا تاوتوێکردنی هزری سیاسی وەردی کە لە بەشی سێیەمدا باسکراوە، شتێك نەماوە تەنها بۆچوونی وەردی نەبێت لەبارەی سیاسەت و سیاسەتمەداران جا لە ڕابردوو بێت یان هاوچەرخ. ئەوەی لە مێژوودا بێت دووانەی ئیمام عەلی و معاویە لەگەڵ هزری وەردی شیاو بوو، بەنزیکەیی لە هەموو کتێبەکانی باسی کردووە. دواتر لە مەجلیسی

خاقانی کۆڕێکی لەسەر ئەم بابەتە گێڕا، هەندێك بیرۆکەی نوێی خستە سەر بیرۆکە کۆنەکە، هەرچەندە هیچ شتێکی نەگۆڕی بوو، بەلام بێگومان گەشەی بە بابەتەکە دابوو. ئەوەی ئێستا لێرەدا دەیگوازینەوە، بێگومان جێگیربوونی دوایین بۆچوونی وەردی بوو لە سەر بابەتەکە. وەردی ناکۆکی نێوان عەلی و معاویە بە جیاوازی رێبازی سیاسی دەزانێ، وەردی دەڵێ ئەو مەبدەئیەتەی ئیمام عەلی لە بەرامبەر معاویە نیشانی داوە، لە بەرامبەریشدا ئەو پراگماتییەی لە دەوڵەتی ستەمکاریی معاویە هەبووە، هەردووکیانی ناچارکردووە بەریەکتر بکەون و هەریەکەیان داکۆکی لە بیرۆکەکەی خۆی بکات.

کەچی لە حاڵەتی هەنووکەییدا رێبازی وەردی ئەوە بوو" سیاسەت هونەری ئەگەرە رەخساوەکانە" جەختیشی لەسەر ئەوە دەکردەوە، ئەم بابەتە نایەتەدی ئەگەر سیاسەت پراگماتی و سوودگەرایی نەبێت، بۆئەوەی بتوانێ ئەگەرە رەخساوەکە لە بەرژەوەندی ئەو بێت، تۆش ئەگەر لەگەڵ وشەی سوود و بەرژەوەندی ناتەبایت، بەلام ئەمەیان واقیعە. کەچی ئەوانەی خۆیان بە پرەنسیپەکان هەڵدەکێشن و بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن دەست بە ئەخلاق بگیرێت، هەرکە جڵەوی دەسەلاتیان دەکەوێتە دەست هەرچی ئەخلاق و پرەنسیپە دەخەنە ژێر پێیەکانیانەوە. وەردی دەیەوێ کەسی سیاسی لەگەڵ خۆی و کارەکەی و لەگەڵ خەڵکیش راستگۆ بێت. واتە بە شێوازی سوودگەرایی میکیاڤیللی کارنەکات و دواتریش بانگەشە بۆ مەبدەئیەت و ئایدیالیزم بکات. هەر مەبدەئێکیش کە کەسێکی نەتەوەخواز، ئایینپەروەر، ئایدیۆلۆژی بانگەشەی بۆ دەکات، بە تێڕوانینی وەردی وەك یەکن.

هــەر لــەم بەشەشــدا بــاس لــە تێڕوانینــی وەردی دەکــەین بــۆ دەسەڵاتدارانی عێراق، هەر لە مەلیك فەیسەڵی یەکەمەوە تـا سـەدام حوسێن. بەدەستهێنانی بۆچوونی وەردی لەسەر ئـەم کەسایەتییانە ئاسان نییە، چونکە ئەم پیاوە بۆچوونەکانی خـۆی بـۆ کتێبەکـەی هەڵدەگرت، بەڵام هەندێك لە نهێنییەکانی بۆ من درکاندووە لـەبارەی هەندێك فەرمانڕەوا. منیش بۆ مێژوو تۆماری دەکەم، جا هەر کەسێك تووڕە دەبێـت یـان لێـی ڕازی دەبێـت، چـونکە ئێمـە لـەو دونیایـەدا دەڕۆین و مێژووەکەمان بەڵگـەی ئێمـە دەبێـت و لەسـەرمان دەبێتـە بەڵگە. تەنانەت لەوانەیە من خۆم لەگەڵ هەندێك لەم بۆچوونانە نەبم، بەڵام دەبێت بگوترێت چونکە ئەمە بۆچوونی وەردییە.

## لە مێژوودا: جیاوازی ڕێبازەکان

وەردی لە کۆڕە بەناوبانگەکەی کـە لـە ڕەمـەزانی سـاڵی ١٩٩٢ بـە بۆنـەی یـادی شـەهیدکردنی ئیمـام عـەلی کـوڕی ئـەبوتاڵب گێـڕای، جەماوەرێکی زۆر ئامادە بوو. مامۆسـتا حوسـێن عـەلی مـەحفووز لـە دیمانەیەکدا کە لەگەڵ ژنە ڕۆژنامەنووس نـەجات عەبـدوڵڵا ئـەنجامی داوە، باس لە چەند برگەیەکی کۆڕەکەی وەردی کردووە. وەردی لەم کۆڕەدا ڕێبازی بەراوردکاریی بۆ دوو کەسایەتیی سەرەتای ئیسـلامی پەیڕەو کرد، تاوتوێکردنەکەی بە شێوەی زانستی سیاسی بوو. دکتۆر عـەلی وەردی پێـی وابـوو ئیمـام عـەلی کەسـێتییەکی کـەماڵی مرۆیـی هەبووە، وتیشی لە بەدبەختی معاویە بـووە ئـەم هـاتووە ململانێـی لەگەڵ کردووە و لە دژی جەنگاوە. یاساکانی مرۆیی دەڵێن دەبووایە عەلی و معاویە لەگـەڵ یـەکتر بجـەنگن، چـونکە هەریەکـەیان لەسـەر ڕێگایەك دەڕۆیشتن بەر ئـەویتر دەکـەوت. ئەگـەر بمانـەوێ لـە ڕووی

مێژووییەوە بەراورد لە نێوان ئەم دووانە بکەین دەبینین معاویە پێچ و پەنای هەبوو، کەچی ئیمام عەلی لەسەر ڕێگایەکی ڕاست دەڕۆیشت. معاویە پارەی بەسەر کەسوکاری و خەڵك دەپشت، بە سامان دڵی خەڵکی دەبرد، سیاسەتی ترساندن و ئارەزووکردنی پەیڕەو دەکرد. کەچی عەلی پارەی لە خۆی و خەڵکەکەشی قەدەغە دەکرد، لە هەر کوێیەك بووایە لەسەرهەق بوو. معاویە سیاسەتی پڕاگماتی دەنوێنی لە دەوڵەتێکدا کە کوشتاری نەیارانی ئەنجام دەدات و بە سامان فریویان دەدات. عەلی نوێنەرایەتی مەبدەئێك دەکات سڵ لە حەق ناکاتەوە.. هەر بۆیە عەلی کوڕی ئەبوتاڵب دەڵێ بەخوای معاویە لە من زۆرزانتر نییە، بەڵام ستەم و بەدکاریی دەکات، ئەگەر ڕقم لە ستەم نەبووایە ئەوا من زۆرزانترین کەس دەبووم. کەچی معاویە دەڵێ خەڵك گوێڕایەڵی بە ئێمە داوە، ئێمە سەلامەتیمان پێیان داوە، ئەوەی گوێڕایەڵ نەبێت لە دەوڵەتی معاویە سەلامەتی بۆ نابێت.

وەردی دەڵێ کتێبێکم لەبارەی کارە چاکەکانی معاویە خوێندەوە لە حوکمڕانیدا، نووسەرەکەی دەڵێ سەلەفی ساڵح ستایشی شێوازی حوکمڕانی معاویەیان کردووە دواتر معاویە سروشنووس (نووسەری وەحی) بووە تا مردنی پێغەمبەر، پاشان خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب معاویەی کرد بە میری موجاهیدان، لە سەردەمی ئەودا ئاژاوە نەماوە، دەسەڵاتی ئیسلام فراوان بووە، چاکەخوازی لە زەویدا بڵاوکردۆتەوە، سەربووردەیەکی چاکی هەبووە و جیهادی کردووە. نووسەرەکە پاساو بۆ معاویە دەهێنێتەوە لە کوشتنی حەسەن کوڕی عەلی، عەممارى کوڕی یاسر، محەمەدی کوڕی ئەبوبەکر، مالیکی کوڕی ئەشتەر، حەجەری کوڕی عودەی. لە هەموو پاساوەکانیش معاویە لە

کوشتنی ئەوان لەسەر هەق بووە.

ئەوەی نووسەر دەڵێ لە تێڕوانینی خۆی زۆر ڕاست بووە، ستەمکاری شوێنێك بۆ ئاژاوە ناهێڵێتەوە. دەسەڵاتداری ستەمکار هەر وشەیەکی هەق بخوازرێ، ئەو بە ئاژاوەی دەزانێ و دەبێت دابمرکێتەوە، دەبێت بەسەر شۆڕش زاڵ بێت. بەلای دەسەڵاتداری زۆرداریشەوە هەموو شێوازەکان ڕەوایە بۆ زیندەبەچاڵکردنی ئاژاوەیەك کە هەڕەشە لە دەسەڵاتەکەی دەکات. بۆئەوەی لە دەسەڵاتەکەشی بۆ ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە، خراپترین خەڵك دەستنیشان دەکات تا پلانەکانی جێبەجێ بکەن. هەرچەندە معاویە ئەهلی بەیتی پێغەمبەر و سەحابەکانی کوشتووە، وەك نووسەر دەڵێ کەچی ئەو پانتایی ئیسلامی فراوان کردووە و جیهادی کردووە. نووسەر لەوە ئاگادار نییە، کە ناکرێت نەفرەت لە سەحابە بکرێت، کەچی لەگەڵ کوشتنی سەحابە تەبایە، بەڵام بە مەرجێك دەبێت بکوژەکە معاویە و سوپاکەی بێت. وەردی داوای لە گوێگران کرد لەم تێزەی نووسەرەکە سەرسام نەبن، ئەمە سروشتی ئەو کەسانەیە لە هەر کات و شوێنێکدا پاساو بۆ هەڵسوکەوتی دەسەڵاتداران دەهێننەوە. هەر بۆیە کاتێك ڕێبازی معاویە کارا دەبێت کە ستەمکاری و دەوڵەتی پۆلیسی دەردەکەوێت. هەرچەندە لەوانەیە ئەم دەوڵەتە بانگەشەی ئەوە بکات دادپەروەریی عومەری کوڕی خەتاب پەیڕەو دەکات و کارگێڕیی عەلی کوڕی ئەبوتاڵب دەکاتە ئاڕاستەی خۆی، کەچی هەڵسوکەوتە پۆلیسی و شێوازە ستەمکارییەکەی هەر بە شێوازەکەی معاویەیە. خاوەنی کتێبەکە پاساو بۆ نزاکەی پێغەمبەر لەسەر معاویە دەهێنێتەوە کە فەرموویەتی" خوا سکی تێر ناکات! ".

گوایە ئەم نزایە بۆ معاویە زۆر سوودی هەبووە، ڕۆژانە حەوت جار قاپێکی پڕ گۆشت و پیازی بۆ هاتووە و ئەویش خواردوویەتی، ڕۆژانە حەوت جار گۆشت و میوە و شیرینی خواردووە. نووسەرەکەش دەڵێ بەخوا تێر نەبووە بەڵکو شەکەت و ماندوو بووە، ئەمەش نیعمەتێك و گەدەیە، هەموو پاشاکان ئەم ئارەزووەیان هەیە!

بێگومان معاویە کەسێك بووە لە خواردن شەکەت و ماندوو بووە، کەچی ئەو نووسەرە بە نیعمەتی دەزانێ گوایە ئارەزووی هەموو پاشایەکە. لەوانەیە نموونەی ئەو نووسەرە لەنێو ئێمەدا بژیت، ئامادەیە پاساو بۆ هەموو کارێکی ستەمکار بهێنێتەوە. ڕۆڵە کاسەلێسییەکەی وا دەکات بەمشێوەیە بێت، بەدەست خۆی نییە، بەڵکو ئەمە سروشتی خۆیەتی.

لە بەرامبەر ئەم زۆرداریی و خواردنە، عەلی کوڕی ئەبوتاڵب دێتە کوفە و خوتبەیەك بۆ خەڵك دەدات و دەڵێ" ئەم جلەم هی مەدینەیە هێناومە، لەلایەن کەسوکارمەوە دووراوە، لەمە زیاترم نییە!" کەواتە دەبێت بەرکەوتنەکە هەر ڕوویدات لە نێوان عەلی کە خاوەن یەك ژەمە خواردنە، لەگەڵ معاویە کە خوانێکی ڕازاوەی هەیە، عەلی یەك جلی هەیە کە لە دوورینی کەسوکارییەتی، معاویە ئاوریشمی نەخشێنراو دەپۆشێ. عەلی لەگەڵ هاوڕێیانی لەسەر زەوی دادەنیشێ، معاویەش لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنیشێ کە لەوەتەی عومەری کوڕی خەتاب کردوویەتی بە والی شام، دەستبەرداری تەختەکەی نابێت. عەلیش قبووڵی ئەوە ناکات، لەپێناو چەند درهەمێك ئایینەکەی بفرۆشێ. یاسای سروشتیش دەڵێ ئەگەر یەکێکیان ملکەچی ئەویتر نەبێت ئەوا بەرکەوتن ڕوو دەدات.

عـەلی کـوڕی ئـەبوتاڵب سیاسـەتێکی بنـەمایی تونـدی دانـا بـۆ جێبەجێکردنی پلانەکانی ئیسلام. لەلایەکەوە بۆ ئەوە دەجەنگێ هەق بەرقەرار بکات، کاتێك جەماعەتێك لە سیستەمی دەوڵەت یاخیبوون و ترسیان بەنێو خەڵك بڵاوکردەوە و خەبابی کوڕی ئەرەتی سەحابەیان کوشت عەلی وتی: بەخوا ئەگەر خەڵکی زەوی هەموو بەیەکەوەبن بۆ کوشـتنی خـەباب، ئـەوا مـن لـە دژی هـەموویان دەجـەنگم، لەگـەڵ هـەموویان جـەنگا و وتـی مـن چاوی ئـاژاوەم کـوێر کـرد. ئەوانـەی بانگەشـەیان بـۆ خوداوەنـدی ئـەو کـرد، ئـەوانی بـە ئـاگر سـووتاند. لەلایەکی دیکەوە داکۆکی لە نەسڕانییەك کرد کاتێك بینیی دەست بۆ خـەڵك درێـژ دەکـات، لـە کـاری دەوڵەتەکـەی تـووڕە بـوو چـونکە نەیتوانیوە مافی نەسڕانییەك بپارێزێ کە پیاوێکی پیر بوو. دەسـتی عەقیلی برای سووتاند، بە دەسـەڵاتی ئـیبن عـەباس ڕازی نـەبوو کـە ئـامۆزای خـۆی بـوو. خـاوەن دوکانەکـەی دارکـاری کـرد کاتێـك دەستکاریی پارەی بـەیتولمالی کردبـوو، هەرچـەندە ئـەم پیـاوە لـە لایەنگرانی خۆی بوو.

عەلی کوڕی ئەبوتاڵب لە جەنگەکەدا عەممارِی کوڕی یاسـری کـردە هاوڕێی خـۆی، کەچـی معاویـە عـەمرو کـوڕی عاسـی کـردە هـاوڕێ. جیاوازییـەکی زۆر لـە نێـوان ئـەم دوو پیـاوە هەیـە، عـەممارِ بـە مەبدەئیەتەوە ناسراوە، کەچـی عـەمرو کـوڕی عـاس بـە چـەپەڵی و زۆرزانی. معاویە فێڵێکی هەڵبژارد، بڕوای بەوە نەبوو ئەم فێڵە سوودی بۆی هەبێت، بەڵکو دەیزانی عەلی کوڕی ئەبوتاڵب ئاکاری سوارچاکی هەیە. فێڵی یەکەم بەرزکردنەوەی قورئان بوو، فێڵی دووەم ئەوەبوو" دەسەڵات تەنها بۆ خودایە" کاتێك ئەوە بە ئیمام عەلی گەیشـت کـە

جەماعەتێك هەیە دەڵێن" دەسەلآت تەنها بۆ خودایە". ئەو وتی" وتەیەکی ڕاستە، بەڵام مەبەستیان ڕاست نییە". بەڵێ ڕاستە تەنها دەسەلآت بۆ خودایە، بەڵام دەبێت بۆ خەڵك میرێکی چاك یان خراپیان هەبێت جا باوەڕدار گوێڕایەڵ بێت، تا کافریش چێژ لە دەسەلآتەکەی وەربگرێت. خوا چارەنووسی دیار دەکات، داهات کۆبکاتەوە، لەگەڵ دوژمن بجەنگێ، ڕێگاکان دیار بکات، ئەوەی هی بێدەسەلآتەکانە لە بەهێزەکان وەربگرێتەوە. ئەو کاتەش چاکەخوازان لە سایەی ئەو دەحەسێنەوە و لە خراپەکارانیش دەحەسێتەوە. عەلی کوڕی ئەبوتاڵب بە ژماردنی ئەو خاڵانە ڕێبازی بەڕێوەبردنی وڵات و خەڵکی داناوە.

پوختەی قسەکان ئەوەیە عەلی کوڕی ئەبوتاڵب تەنها پیاوی شمشێر نەبووە، بەڵکو سیاسییەکی شارەزاش بووە. نەوەك بەو شێوەیە بێت کە واعیزەکان وێنەیان کێشاوە گوایە خۆی نەدەخستە کاروباری سیاسییەوە و بەدکاری و ستەم ناکات. وەك بەمشێوەیە بێت ئەوەی معاویە ئەنجامی دەدا سیاسەت بێت و ئەوەی عەلی کوڕی ئەبوتاڵبیش دژە سیاسەت بێت. عەلی کاری سیاسی لە ئۆپۆزسیۆن و لە دەسەلآتدا کردووە، پۆلیسی ناوخۆی دانا، لە جەنگدا هەوالگری سەربازی. بۆیە پیاوێکی سیاسیی مەبدەئی بوو، ڕێبازێکی تایبەتی بۆ خۆی دارشتبوو کە خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب ستایشی کردووە. نەریتی عەلی ئەوەبوو هەموو شتێك جێبەجێ بکات کە لە پێغەمبەر فێری بووە. کەچی دەرفەت نەبوو ئەو ڕێنماییانە جێبەجێ بکات، من پێم وایە ئایینی محەمەد لەگەڵ عەلی لە گۆڕەکەی نێژرا.

## لە ئێستادا: سیاسەت هونەری ئەگەرە ڕەخساوەکانە، پراگماتیزم ڕێبازێکی ڕاستگۆیە

وەردی چەندین جار لە مەجلیسی خاقانی و مەجلیسەکانی دیکە ئەوەی دووبارە کردۆتەوە کە سیاسەت هونەری ئەگەرە ڕەخساوەکانە. سیاسەتمەدار وەك ئەوەیە ئەسپێك دەستەمۆ بکات، بۆیە لە زمانی عەرەبی وشەی (سیاسی) بۆ بەکاردێت. زۆربەی پێغەمبەران ئەوانەی لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا سەرکەوتوو بوون، ئەسپەوان و شوانکارە بوون. کاتێك توانیان بەسەر ئەسپ و مەڕ زاڵبن و جڵەویان بکەن ئەوا خودا توانای بەڕێوەبەردنی کۆمەڵگای پێ بەخشین. دەکرێ سیاسی کاتێك لە کارێکی سیاسی سەرکێشی دەکات پێشبینی دەسەڵات بکات یان پێشبینی لەسێدارەدان بکات، لەوانەیە سێدارەدانی زیاتر لە وەرگرتنی دەسەڵات بەناوبانگی بکات، ئەمانە هەموو شتی چاوەڕوانکراون لە سیاسەتدا دەکرێت ڕووبدەن. ناکرێت دوژمنی وەهمی دروست بکرێت بە دابڕانی هەمیشەیی لەگەڵ هەر یەکێك کۆتایی بێت. هەروەها ناکرێت پشت بە یەککگرتنی دراوسێیەك ببەسترێ گوایە تاکە دەوڵەتە، چونکە بەرژەوەندییەکان لەیەکتر هاوگیر دەبن. بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە بۆ ماوەیەکی کاتی دوژمنایەتی هەبێت بۆ بەرژەوەندییەکی کاتی و یان یەککگرتنێکی کاتی بۆ ئامانجێکی دیارکراو هەبێت لە بەرژەوەندی هەردوولا بێت. وەك ئەوەی یەکێتی ئەورووپا ئەنجامی دا، دوای ئەوەی درکیان بەوە کرد جەنگ و داگیرکردنی دەوڵەتان بە هێز بێ سوودە. ئەوکات لەسەر تێگەیشتن و تەواوکاریی ئابووری ڕێککەوتن بەگوێرەی هەرلایەك کە بەرژەوەندییەك لەم یەکێتییە دەبینێ.

وەك وەردی پێی وابوو هەمیشە لەبەردەم كەسێكی سیاسی پانتاییەك لە بەرژەوەندییەكان هەیە، دەبێت بەپێی بارودۆخ و شوێنەكان هەلی بقۆزێتەوە، بۆئەوەی سەركەوتوو بێت. لە سیاسەت دوژمنداری هەمیشەیی و دۆستایەتی هەمیشەیی نییە، بەڵكو بەرژەوەندی هەمیشەیی هەیە. ئەمەش تەواو لەگەڵ ڕێبازی پراگماتی دەگونجێ كە بە سوودگەرایی (النفعية) و پاساوگەرایی تەرجەمە دەكرێت. پراگماتی پێی وایە پێوەری ڕاستگۆیی بابەتێكە ئەنجامە كردەییەكەیە، نەوەك چەند لەگەڵ واقیع یەك دەگرێتەوە. پێوەر هەقیقەتێكی سەركەوتنی بیرۆكەكەیە لە ڕووی كردارەوە، بەمەش بە پەیوەستكردنی هەقیقەت بە ڕاستگۆیی بیرۆكەوە، ئەنجامی كردەیی و ڕەزامەندی و بەرژەوەندی دروست دەبێت بە ڕێژەیی هەقیقەت و جۆراوجۆرییەكەی.

وەردی بۆ كۆڕێك بانگهێشتی زانكۆی كوفە كرا، شاندێكی گەورە لە مەجلیسی خاقانی بۆ نەجەف یاوەری وەردی كرد. لەوێ وەردی هێڵە گشتییەكانی هزری سیاسی خۆی كێشا. ڕووی لە ئامادەبووان كرد لە مامۆستا و قوتابیان، وتی ئەو هزرەی دەگاتە خەڵك دەبێت كردەیی بێت و لە واقیعدا شیاوی جێبەجێكردن بێت. بەڵام كاتێك ڕیفۆرمخوازێك سەدان ساڵ دوور دەوەستێ و ئامۆژگاری خەڵك دەكات تەنها كەمێك ئاوڕی لێ دەدەنەوە. كاتێك پێغەمبەر محەمەد بانگەوازی كرد لایەنگرانی لە حەوت كەس زیاتر نەبوون، بەڵام كاتێك كۆچی كرد بۆ مەدینە و جەنگ هەڵگیرسا، هزرەكەی بەنێو خەڵك بڵاو بۆوە، جا بە تۆقاندن بێت یان ئارەزووپێدان، لەبەر ترس بێت یان تەماعكاریی وەك لە قورئاندا باسكراوە. وەردی ویستی گاڵتەیەك لەگەڵ خەڵك

بکات وتی: ئەگەر ئێستا من بانگتان بکەم بۆ ئەوەی بۆ ڕیفۆرم دەرکەوین، تەنانەت حەوت کەسیش بەدەست ناهێنم! ئەمە ئەگەر هاتوو کەسانێك نەبن بڵێن ئەوە خاینە و دەیەوێ دووبەرەکی بخاتە نێو میللەتەوە.

وەردی دەڵێ دەبێت فەرمانڕەوات دیکتاتۆر نەبێت، شەیدای هێز و عاشقی دروشمە بریقەدارەکان نەبێت. چونکە ئەمە بەسەر خۆی ترسناك دەبێت ئەگەر هاتوو کۆمەڵێك هەڵپەرست بە دەوری کۆبوونەوە. چونکە ئەوان گوێڕایەڵی دەبن و سەرپێچی ناکەن، بەڵکو بۆ ناهەقیش پاڵپشتی دەکەن نەوەك بەرژەوەندیی خۆیان لەلای ئەو لەکیس بچێت. بەڵکو دەبێت دەسەلاتدار گەلەکەی بکاتە بنەمای هەرە گرنگ لە هەموو کارەکاندا. دواتریش دەست بۆ گرنگترین کێشەکان ببات. جا ئەوەی دەتوانێ فەرمانڕەوا لەو چوارچێوەیە دابنێ، ئەوا ڕێکەوتنی مرۆڤەکانە لەسەر یاسای لیبڕالی سیاسی و سوودگەرایی لە چوارچێوەی دیموکراسیدا، کە ئەمە چاکترین نموونەیە بۆ بەڕێوەبردنی وڵات. چونکە لە سیاسەتدا بەدوای ئایدیالیزم و ئاکار ناگەڕێیت، بەڵکو دەبێت بەدوای بەرژەوەندی دەوڵەت و گەلەکەتەوە بیت، کۆشش بۆ بەدەستهێنانی بکەیت. وەردی قسەکەی جۆن ستیوارت میل دەگوازێتەوە کە دەڵێ: ئەگەر هەموو مرۆڤ لەسەر بۆچوونێك بوون، تەنها کەسێك لەگەڵیان نەبوو، ئەوا ناتوانن بێدەنگی بکەن. بە هەمان شێوەیش ئەو کەسە ناتوانێ ئەوان بێدەنگ بکات، هەرچەندە هێز و دەسەلاتیشی هەبێت. چونکە ئەگەر ئێمە دەنگێکمان کپ کرد ئەوا هەقیقەت بێدەنگ دەکەین. لەوانەیە بۆچوونی هەڵە لە ڕەهەندەکانی خۆیدا هەقیقەتی شاراوەی هەبێت.

ئەو بۆچوونەی خەڵکیش لەسەری کۆکن ناکرێت لەسەر بنەمای عەقڵی قبووڵ بکرێت تەنها ئەو کاتە نەبێت کە دەخرێتە بواری تاقیکردنەوە و پشکنینەوە. ئەگەر ئەم بۆچوونەش ناوە ناوە ڕووبەڕووی ئاڵەنگاری نەبێتەوە ئەوا گرنگی و کاریگەرییەکەی لەدەست دەدات. چونکە ڕەفتاری مرۆیی شتێك نییە تەنها ئەنجامی کاریگەرییەکی ژینگە نەبێت بەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگاوە.

## دیموکراسی، هاووڵاتیبوون، دەسەڵاتی یاسا

وەردی دەڵێ ئەم سێیانە (دیموکراسی، هاووڵاتیبوون، دەسەڵاتی یاسا) لە میانەی ئەزموونی مرۆیی دەرکەوتووە، کە ئەم سێیانە سەرکەوتووترین سێگۆشەن بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاکانیان. دیموکراسی بریتییە لە دەسەڵاتی زۆرینە کە ملکەچی ئایین و نەژاد نابێت، بەڵکو هاووڵاتیبوون بنەمای سەرەکییە. سەبارەت بەو شتانەی کە خەڵك لە باوانیان وەریانگرتووە، لە نموونەی ڕەنگی پێست و باوەڕی ئایینی، ئەوانەی پەیوەندییان بە دیارکردنی شوناسی هاووڵاتیبوونەوە نییە. ئەگەر هاتوو زۆرینەش ستەمیان لە کەمینە کرد، ئەوا یاسا دەبێت زۆرینە لە ئاستێك بوەستێنێ. ئەم جۆرە دەسەڵاتەش لە دەوڵەت نایەتەدی تەنها ئەو کاتە نەبێت بە ڕێککەوتنێکی دەستووری هەرسێ دەسەڵات لەیەکتر جیاکرابێتەوە، بە شێوەیەك دەسەڵاتی جێبەجێکردن لەلایەن سەرۆك یان سەرۆك وەزیران نوێنەرایەتی دەکرێت، دەسەڵاتی یاسادانان لەلایەن پەرلەمان یان ئەنجوومەن و دەستەی دامەزراندنەوە نوێنەرایەتی دەکرێت، دەسەڵاتی دادوەرییش سەربەخۆیی دادوەریی دەنوێنێت. کە ئەو کات نابێت لە بەردەم دادوەریی جیاوازی لە نێوان سەردار و ژێردەست

بکرێت. هەر کەسێك سەرپێچیی یاسا بکات دەبێت دەسەڵاتی دادەوەری لێپێچینەوەی لەگەڵ بکات، ئەگەر هاتوو لە دەوڵەتاندا ئەم شێوازە پەیڕەو بکرێت ئەوا بە شێوەیەکی تەواو زۆرداری و ستەمکاری ریشەکێش دەکرێت.

لە سیستەمی دیموکراسیدا زۆرینە پرۆگرامی کاری خۆی پێشکەش دەکات و جەماوەر بەوە ڕازی دەکات ئەگەر هاتوو دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت ئەوا پرۆگرامەکەی جێبەجێ دەکات. کەمینەش بە ئۆپۆزسیۆن ناودەبرێت لە پەرلەمان چاودێریی کاری دەوڵەت دەکات. عەقڵی مرۆیی بە شێوەیەکی گشتی ناتوانێت بە تێڕوانینێکی بێلایەنانەی ڕەها سەیری بابەتەکان بکات، چونکە چەندین هۆکاری نەست هەیە، بێئەوەی درکی پێ بکات کاریگەری بەسەر بیرکردنەوەی دەبێت، لەوانە ئەو بیروباوەڕەی لەسەری پەروەردە بووە، بەرژەوەندی، خۆویستی، سنووری مەعریفەکەی، ئەزموونی لەبیرکراو، گرێی دەروونی و چەندین هۆکاری دیکە. جا مرۆڤ کاتێك بیر دەکاتەوە وا وێنای خۆی دەکات کە لە بیرکردنەوەکەی ئازادییەکی ڕەهای هەیە، چونکە نازانێ چەندین هۆکاری نەستی هەیە کاریگەرییان بەسەر عەقڵیەوە هەیە. ئەگەر کەسێك پێچەوانەی ئێمە بێت ئەوا بە دەمارگیر و کەللەڕەق و نەزان وەسفی دەکەین، ناشزانین ئەویش لەلایەن خۆیەوە بە هەمان ئەو تۆمەتانە تۆمەتبارمان دەکات. هەر ئەمەشە قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ کردووە کە دەفەرموێ" كل حزب بما لديهم فرحون". کەچی لەسەر ئێمە پێویستە ڕێز لە هەموو بۆچوونێك بگرین، کۆمەڵگای دیموکراسی ئەوەیە گوێ لە بەرامبەر دەگرێت و ئەو کەمینەیە دەپارێزێ کە جیاوازی هەیە. ئەوەی

هەمووانیش دەپارێزێ یاسایە. سنووری تۆ لە دیموکراسیدا لەو شوێنە دەوەستێ کە سنووری کەسانی دیکە نەبەزێنێ، ئەگەر ئەمەش نەبوو ئەوا یاسا هەیە بۆ دوورخستنەوەی زیان لە زیانکەوتووەکان.

جیهــان دوای ئــەوەی دوو جــەنگی بەخۆیــەوە بینیــوە، بــەرەو دیموکراســی دەڕوات بۆئــەوەی ڕێگــری لــە دروســتبوونی دەســەڵاتی زۆرداری بکات. من وەك خودی خۆم پێشبینی ئەوە دەکەم لە وڵاتانی دەوروبەر لەدایکبوونی ئەم حاڵەتە ببینین، لەوانەشە بگات بە ئێمە. زۆری ئــەو جەنگانــەی کــە ئــەنجامیان نــەبوو، ونبــوونی دەوڵــەتی ئایدیۆلۆژی لەسەر نەخشــە، وا دەکــات بــەرەو شــێوازی دیموکراســی بــڕۆین کــە چــاکترین شــێوازە بــۆ حــوکمڕانی. بــەڵێ لەوانەیــە بڵــێن ئەمەشیان شێوازێکی ناتەواوە لەوانەیە کۆمەڵێکی زۆری خەڵك ستەم بکــات. منــیش لــەم بۆچــوونەدا هــاوڕام، بــەڵام لەگــەڵ دەســەڵاتی هاووڵاتیبوون لەژێر سێبەری یاسادا، پرۆژەیەکی چاکترمان لەوە نییە. لەوانەیە هەندێکتان پێتــان وابــێ ویلایەتــە یــەکگرتووەکانی ئــەمریکا چــاکترین دەوڵەتــە لــە جێبــەجێکردنی دیموکراســیدا، بــەڵام مــن پێچەوانەی ئەم بۆچوونەم هەیــە. چــونکە ویلایەتــە یــەکگرتووەکانی ئەمریکا بە هەڵبژاردنی سیستەمی دوو حزبی، بــێ بەشــداری ئــەوانی دیکە، پرۆگرامێکی داناوە، کە گەیشتن بە دەســەڵات ئەســتەم بێــت، ئەمەش وا دەکات ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئــەمریکا خــراپترین وڵات بێت لە جێبەجێکردنی دیموکراسیدا. بەتایبەتیش ئەگەر بزانن چەندین پــارە بــۆ هەڵمــەتی هەڵبــژاردن و بەدەســتهێنانی کورســییەك لــە کۆنگریس خەرج دەکرێت. لەوانەیــە پاڵپشــتیم بکــەن ئەگــەر هــاتوو زانیتان سەدان ڕەچەڵەك و مەزهــەب و ئــایین و بــیروڕا هەیــە، بــەڵام

هەموویان لە چوارچێوەی هاووڵاتیبوون حسێبیان بۆ دەکرێت، ئەمەش وا دەکات هەر هاووڵاتییەك لەسەر خاکی ئەمریکی بژیت، ئەوەی بۆ خۆی زامن کردووە کە کەس رێگەی پێ نەگرێت. سەرەڕای ئەمەش یاسایەکی توند هەیە وادەکات خودی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەژێر چاودێریی هەمیشەیی بێت. ئابڕۆچوونەکەی (وتەرگێت) بەڵگەیەك بوو لەسەر ئەم قسانە کە وایکرد یاسا سەرۆك نیکسۆن لابدات، ئەمەش دوای ئەوەی بە سیخوڕیکردن لەسەر حزبی ڕکابەر تۆمەتبار کرا. (با بێن سەیری بکەن لەلای ئێمە چۆنە!) ئەوان مافیان بۆ هاووڵاتیان دەستەبەر کردووە، سنووریان بۆ بەرپرسیارێتییەکانی سەرۆك داناوە.

## لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عێراق

نەمتوانی بە تەواوی بۆچوونی وەردی لەبارەی فەرمانڕەواکانی عێراق بزانم یان با بڵێین وەك پێویست بۆچوونی ئەوم لەو بارەیەوە نەزانیوە، چونکە لەسەر ئەم بابەتە بەکورتی وەڵامی پرسیارەکانی منی دەدایەوە. جگە لەوەش دەرفەتی ئەوەم بۆ نەڕەخسا بۆچوونەکانی ئەو بە تەواوی بنووسمەوە. تەنها لەبارەی مەلیك فەیسەڵی یەکەم و دوایین سەرۆك نەبێت کە سەدام حوسێن بوو. لەبارەی یەکەمەوە وەردی سەرسامی خۆی نەدەشاردەوە، تەنانەت یەکێك لە کوڕەکانی ناوناوە (فەیسەڵ). سەبارەت بە دووەمیش (سەدام حوسێن) وەردی بەهیچ شێوەیەك ئەم سەرۆکەی بەدڵ نەبوو، هەمیشە ڕقی خۆی لەبارەی بڕیار و شێوازی بەڕێوەبردنی وڵات لەلایەن سەدامەوە دەردەبڕی. تەنانەت جارێکیان بە ئامادەبوونی عەبدولموتەڵیب مەهدی عەبوود و سەلام شەماع وتی: حوکمڕانی

سەدام خراپترین حوکمە لە تەواوی مێژووی عێراقدا، بۆیە عێراق بەرەو کاولکاری دەبات. بەم نزیکانەش ئەنجامی ئەم فەرمانڕەواییە دەبینن. لەوانەیە من لە کاتی هەڵکردنی گێژەلووکەکان بەسەر عێراق لەگەڵتان نەبم، ئەگەر ئێوەش پێی گەیشتن ئەوا قسەکانی منتان لەبیر بێت.

## مەلیک فەیسەڵی یەکەم: سەرسامم

مەلیك فەیسەڵی یەکەم، فەیسەڵ کوڕی حوسێن یەکێك بوو لەو کەسایەتییانەی کە وەردی پێیەوە سەرسام بوو. مەلیك فەیسەڵی یەکەم کوڕی شەریف حوسێنی هاشمی بوو لە ساڵی ١٨٨٣ لەدایك بووە و لە ساڵی ١٩٣٣ مردووە. لە شاری تائیف لەدایك بووە سێیەم کوڕی شەریفی مەککەیە. فەیسەڵی یەکەم ماوەیەکی کەم لە ١٩١٨ تا ١٩٢١ مەلیکی سووریا بوو. دواتر لە ١٩٢١ تا ساڵی ١٩٣٣ بوو بە مەلیکی عێراق. وەردی پێی گوتم ئەو بە کارەکتەری کاریزمی مەلیك فەیسەڵی یەکەم کاریگەر بووە. ئەمەش لە میانەی بەڕێوەبەردنی وڵات بووە. چونکە لەگەڵ باوکی لە سیاسەت شارەزا بووە سەرەتا لە مەککە و دواتریش لە شۆڕشی عەرەبی. بەتایبەتی لە ماوەی مانەوەی لە ئەستەنبۆڵ فێری زمانی تورکی و ئینگلیزی و فەڕەنسی بووە. لەسەر دەستی شارەزاترین مامۆستا گەورە بووە، دواتر دەگەڕێتەوە حیجاز و سووریا. لەوێ تووشی نوشستی دەبێت نەوەك سەرکەوتن، بەتایبەتی دوای دۆڕانی جەنگی مەیسەلۆن.

وەردی دەڵێ فەیسەڵی یەکەم هەموو ئەزموونی ژیان و سیاسی خۆی لەگەڵ گەورەترین ڕاوێژکارەکانی لە نموونەی نوری سەعید و ڕۆستەم حەیدەر و دکتۆر ئەحمەد قەدری و فایز غصین و تۆماس ئیدوارد لۆرانس هێنایە عێراق. بۆئەوەی حکومەتێکی سەرکەوتوو لە عێراق

دابمەزرێنێ بۆ گەلێك كە چاوەڕوانی زۆر شتیان لە مەلیك دەكرد. بەتایبەتی عێراق تازە لە ئەنجامی شۆڕشێكی خوێناوی كە چوار ساڵی خایاندبوو لەژێر دەسەڵاتی بەریتانییەكان دەربازی ببوو. فەیسەڵی یەكەم بە دووانەیی بەریتانییەكان و عێراقییەكان بە شێوازی (ببە و داوابكە) مامەڵەی دەكرد بۆئەوەی مافی عێراقییەكان لە بەریتانییەكان وەربگرێت و ڕێگەش نەدات بەریتانیا دەست بەسەر عێراقدا بگرێت. ئەمەش لە كاتێك دابوو دەسەڵاتی داگیركاریی كەم ببۆوە بۆ گرووپێك ڕاوێژكار كە هەوڵیان دەدا وڵاتەكە بەڕێوەبەرن، تا تەنگژە دروست نەبێت. تا ئەو كاتەی لە ساڵی ١٩٣٠ پەیماننامەی لەگەڵ بەریتانییەكان بەست كە بە پەیماننامەی ١٩٣٠ ناسرا. بەپێی ئەم پەیماننامەیە دان بە سەربەخۆیی عێراق نرا و كۆتایی بە حاڵەتی ئینتداب هات. لەو ماوەیەدا مەلیك فەیسەڵی یەكەم پرۆسەی سیاسی لە دەرەوە و ناوەوە بە سەركەوتنێكی نایاب بەڕێوە دەبرد. ڕۆژنامەكانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی، بەریتانیای بە هۆكاری مردنی دەزانی بەهۆی ئەو ژنە سستەرەی یاوەری مەلیكی كردووە لە گەشتی چارەسەركردن بۆ بیرنی سویسرا، گوایە ژەهری بۆ خستۆتە چاوە. كەچی ڕاپۆرتی مردنەكە هۆكارەكەی بۆ ڕەقبوونی خوێنبەرەكان گێڕاوەتەوە. وەردی كوشتنی مەلیكی بەدوور نەدەزانی، لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی نەبوو كە كوژرابێت، ئەو زانیاری تایبەتی لە ئەندامێكی تیمەكە بەدەست كەوتبوو كە یاوەری مەلیكی كردبوو، گوایە مەلیك بۆیە مردووە چونكە كۆششێكی زۆری كردووە (..........) كە بۆ تەمەنی ئەو شیاو نەبووە! .

ئەو كات ڕاپۆرتە پزیشكییەكەی وا بڵاوكراوەتەوە كە مردنەكەی

بەهۆی ڕەقبوونی خوێبنەرەکان بووە، کەچی هەندێك پێیان وایە مردنەکەی بەهۆی ژەهراوییبوون بووە بەهۆی ماددەی زرنیخەوە، تەنانەت ئەو نیشانانەی لە سەرەمەرگ لە مەلیك دەرکەوتووە، نیشانەی ژەهراویبوون بووە بە زرنیخ. لاشەکەی لە ڕێگای ئیتاڵیاوە دواتر بۆ حەیفا و عەککا و ئینجا لە ڕێگای فڕۆکەوە گەیاندرایە شاری ڕوتبەی عێراقی، لە ١٥ سێپتێمبەری ١٩٣٣ گەیشتەوە بەغدا. لە بەغدا لە گۆڕستانی مەلەکی لە ئەعزەمیە نێژرا. وەردی دەڵێ ئەو وەسیەتنامەی مەلیك فەیسەڵ کە بڵاوکرایەوە بەڵگەی نیشتیمانپەروەری ئەو پیاوە بوو کە دەڵێ" من ئاسوودەم بە ئەرکی خۆم هەڵسام. بە هەموو هێزی خۆم خزمەتی میللەتەکەی خۆم کرد بۆئەوەی لە دوای من بەهێز و یەکگرتوو بن" ئەمە گرنگترین قسەکانی وەردی بوو لەبارەی مەلیك فەیسەڵەوە، جیا لەو قسانەی کە لە بەشی سێیەم باسم کردووە، وەردی کاریگەر بووە بە کەسایەتیی مەلیك فەیسەڵ و شێوازی بەڕێوەبردنی وڵات لەلایەن فەیسەڵەوە.

## مەلیک غازی: لە سیاسەتی نەدەزانی

غازی کوڕی گەورەی فەیسەڵی یەکەمە (غازی لە ساڵی ١٩١٢ لەدایك بووە لە ساڵی ١٩٣٩ مردووە. دووەم پاشای عێراقە، فەرمانڕەوایییەکەی لە ساڵی ١٩٣٣ دەست پێدەکات تا ساڵی ١٩٣٩ . ئێزگەی لە ماڵەکەی خۆی لە کۆشکی زهوور دانا، بە ڕووداوی ئۆتۆمبیل مرد، کاتێك ئۆتۆمبیلەکەی بەر ستوونی کارەبا کەوت) وەردی دەڵێ کەسایەتییە زاڵبووەکەی فەیسەڵی یەکەم کاریگەری بەسەر کوڕەکەی هەبوو، بۆیە غازی کەسێکی ڕاڕا و کەسێتییەکی لاوازی هەبوو. باوکی کە لە ژیان مابوو هەوڵیدا قەرەبووی لاوازی

کەسێتیی غازی بکاتەوە، بۆیە کۆمەڵێك ڕاوێژکاری لە ئەفسەران و سیاسەتمەدران بۆ دانا، کە هەندێکیان لە ئاستی بەرپرسیارێتی نەبوون، بۆیە غازییان بەرەو ڕابواردن و شەوانی سوور برد، ئەمەش لەگەڵ لاوازی کەسێتییەکەی وایکرد چارەنووسەکەی پێشبینیکراو بێت. بۆیە ئێزگەی دانا و پێچەوانەی باوکی بوو کە کەس نەیدەزانی چی دەکات، بەڵام غازی لە میانەی ئێزگەکەی کە لە کۆشکی زهوور بەرنامەکانی پەخش دەکرا ڕۆشن بوو، بەداخەوە ئەو بۆچوونەی کە لەو ئێزگەیە پەخش دەکرا بۆچوونی خۆی نەبوو بەڵکو بە کاریگەری کەسانی دەوروبەری بوو.

وەردی پێی وابوو، بەڕاستی لەوانەیە غازی کوژرابێ، ڕووداوی ئۆتۆمبیلەکەش پیلانێك بێت، ئەمەش بەهۆی ئێزگەکە بوو کە لەگەڵ بەیاننامە فەرمییەکانی دەوڵەتی عێراقی نەدەگونجا، کە ئەم دەوڵەتە پابەند بوو بە کۆمەڵێك هاوپەیمانی لەگەڵ بەریتانیا. کەچی بەرنامەی ئێزگەکە باسی یەکێتیی هەرێمە عەرەبییەکانی دەکرد، لەگەڵ یەکێتی نێوان عێراق و کوێت. لەگەڵ پاڵپشتیکردنی فەلەستین لە دژی داگیرکاریی بەریتانیا. دواتر لەگەڵ دەرکەوتنی هیتلەر و هەڕەشەکانی بۆ سەر جیهان لەوانەبوو دەسەلاتی غازی بمێنێتەوە. ئەمەش وا دەکات باوەڕ بکەین کە ڕووداوەکە پیلانگێڕی بووە.

## مەلیک فەیسەڵی دووەم: عەبدولئیلاە دەسەڵاتی مەلەکی لە عێراق لەناوبرد

مەلیك فەیسەڵی دووەم ( فەیسەڵ کوڕی غازی کوڕی فەیسەڵ لە ساڵی ١٩٣٥ لەدایك بووە و لە ساڵی ١٩٥٨ مردووە. سێیەم پاشای عێراق بووە و دوایین پاشای هاشمییەکان بوو لە عێراق. سەرەتا لەژێر

ڕاسپاردەیی عەبدولئیلاهی خاڵی بووە تا ساڵی ١٩٥٣ لەو ساڵەدا بوو بە پاشای عێراق) بۆچوونی وەردی لەبارەی مەلیك فەیسەڵی دووەم ئەوەبوو ئەم کوڕە دەسەڵاتی کردەیی لە عێراق نەبووە، ئەوەی دەسەڵاتی هەبوو عەبدولئیلاهی خاڵی بوو. تەنانەت ئەو کاتەی فەیسەڵی دووەم تاجی پاشایەتیشی لەسەر نا هەر ملکەچی خاڵی بوو. سەرەڕای ئەمەش وەردی گومانی لە ڕاسپاردەییەکەی عەبدولئیلاه هەبوو لە عەرشی عێراقدا، چونکە لە مەزندەی کەس نەبوو پاشایەکی گەنج کە مەبەست غازییە، بە ڕووداوێکی لەناکاو یان بەکوشتن لەناوبچێت تا ڕاسپاردەیی بۆ بکرێت. کەچی عالیەی شاژن و خوشکی عەبدولئیلاه لەبەردەم ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق شایەتی دا کە مەلیك غازی وەسیەتی کردووە لە حاڵەتی مردنیدا عەبدولئیلاه بکرێتە وەسی لەبری فەیسەڵی دووەم، تا گەورە دەبێت. وەردی پێی وابوو ئەم وەسیەتە ساختەیە و بنەمایەکی دروستی نییە، بەڵکو تەنها پیلانگێڕی خودی عەبدولئیلاه بووە.

وەردی دەڵێ دووانەی عەبدولئیلاه و نوری سەعید هۆکاری کەوتنی دەسەڵاتی پاشایەتی بوون لە عێراق، فەیسەڵی دووەم هیچ دەسەڵاتێکی لەم کەوتنە نەبوو. ئەو دوو کەسە وایانکرد مەلیکی بچووك لە حاڵەتێکی دوودڵی بێت. ئەو هەرچەندە هەوڵی دەدا کارێك بکات کەچی لە هەموو هەنگاوەکانی ڕووبەڕووی کێشە دەبۆوە و لەو کاتەشدا پەنای بۆ خاڵی دەبرد، کە خۆی مەڵاس دابوو، دوای دەستلەکارکێشانەوەکەشی لە کاری سیاسی بەردەوام بوو. وەردی دەڵێ دەبووایە نوری سەعید زیاتر ئاگاداری دەسەڵات بێت، هەرچەندە ئەویش لە ڕۆژانی کۆتاییدا فەرامۆش کرابوو، هەرچەندە لە

جیلی یەکەمی دەسەڵاتداران بوو. کۆتاییە تراژیدییەکەی فەیسەڵی دووەم زۆر نیگەرانی کردم، دەبووایە ڕێگە بدرێت لە وڵات بڕوات وەك چۆن عەبدولناسر ڕێگەی پاشای میسری دا بڕوات.

## عەبدولکەریم قاسم ڕێبەری گەل بوو کەڵکی سەرۆکایەتی عێراقی نەبوو

وەردی بارودۆخی کۆمەڵایەتی دوای شۆڕشی تەمموزی ١٩٥٨، بە کۆگایەکی باڕووت دەشوبهێنێ کە کەس نازانێ کەی دەتەقێتەوە. ئەمەش هۆکار بوو لەوەی حکومەتە دەمارگیرەکان بەسەر کەسێتیی عێراقی زاڵ بکەن، نەشتوانن چارەسەری کۆمەڵایەتی پێشکەش بکەن. تەنانەت لە ساڵانی دواییدا بەر لە مردنی وەردی، بارودۆخی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەك چڕ بۆوە و بەو ئاستە گەیشت حکومەت پاڵپشتی بەها و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان و دەمارگیریی تایفی و عەشایەری و حزبی دەکرد، ئەمانەش لە ناخی هاووڵاتیان چەسپا. بۆیە وەردی دیکتاتۆریەت و سیستەمی حوکمڕانی بەوە تۆمەتبار دەکرد کە پاشماوەی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی کۆنی زیندووکردۆتەوە و دووبارە لە کۆمەڵگای عێراقی چەسپاندۆتەوە.

وەردی دەڵێ زەعیم عەبدولکەریم قاسم کاریزمای ڕێبەرایەتی هەبوو، بەڵام شارەزایی و توانای دەسەڵاتداریی و کارگێڕی نەبوو (عەبدولکەریم قاسم، یان عەبدولکەریم بەکر زوبەیدی لە ساڵی ١٩١٤ لەدایك بووە، لە ساڵی ١٩٦٣ مردووە. یەکەم فەرمانڕەوای دوای دەسەڵاتی پاشایەتی بوو، بوو بە سەرۆك وەزیران و فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکان و وەزیری بەرگریی عێراق، هەر لە ساڵی ١٩٥٨ تا شوباتی ١٩٦٣، قاسم ئەندامی ڕێکخستنی ئەفسەرانی ئازادیخواز بوو

کە لە دژی ڕژێمی پاشایەتی شۆڕشی کرد.) وەردی دەیگوت بەو خەسڵەتەی زەعیم کەسێکی سەربازی و نیشتیمانپەروەر بوو، وڵاتەکەی خۆشدەویست و لایەنگری چینی هەژاری گەل بوو، کەچی بەتەنیا نەیدەتوانی جڵەوی دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت، لەگەڵ شیوعی و قەومییەکان حسێبی ورد نەبوو.

ئەوەی مێژووی عێراق بخوێنێتەوە، هەست دەکات عەبدولکەریم لە ماوەیەك شیوعییەکانی نزیك کردۆتەوە، کە دەبووایە لە دەسەڵات دووریان بخاتەوە، هەروەها قەومییەکانی دوورخستەوە کە دەبوو نزیکیان بکاتەوە. سەیرترین بڕیار کە لە ماوەی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم دەرچوو، ئەو بڕیارە بوو کە لەبارەی عەبدولسەلامی هاوڕێی درا، کە پیلانگێڕیی لە دژی ئەو کردبوو. لە عورفی سەربازی عێراقی بڕیاری لەسێدارەدان بۆ ناپاك و پیلانگێڕ دەدرێت، عەبدولسەلام عارف بەم تۆمەتانە تۆمەتبار کرا، کەچی عەبدولکەریم بڕیاری لێبووردنی بۆ هەموو ئەو کەسانە دەرکرد کە پیلانیان لە دژی ئەو گێڕابوو، عەبدولکەریم وتی" عفا الله عما سلف" ئەمەش شێوازێکی نموونەیی نییە بۆ بەڕێوەبردنی وڵاتیکی وەك عێراق بەتایبەتی لەو کاتدا. ئەم قسانەی من بەم مانایە نەزانن کە خوانەخواستە داوای دەرکردنی بڕیاری لەسێدارەدان بۆ کەسێك دەکەم. بەڵام مەبەستم ئەوەیە کاتێك بەزم و ڕەزم زۆر دەبێت پێویستە دەسەڵاتدار ڕشت و یەکلاکەرەوە بێت. ئەوەی ڕوویدا ئەوەبوو عەبدولسەلام گەڕایەوە و کودەتای لە دژی کرد و کوشتی بەزەیی پێی نەهاتەوە، ئەوەی لەبیر نەبوو کە عێراقییەکان ناویان ناوە (سیاسەتی عفا الله عما سلف).

کاتێك عەبدولکەریم قاسم خوازیار بوو ببێتە ڕابەری نیشتیمان و تاکە زەعیمی عێراق، دەبووایە دوای بچووککردنەوەی حزبەکان و ناکۆکی لەگەڵیان هەموو دەسەڵات بۆ خۆی قۆرخ نەکات. دەبووایە بڕیاری دانانی دادگای مەهداوی پووچەڵ بکاتەوە، یان هەر لە بنەڕەتەوە بڕیاری ئەم دادگایە نەدات. کە لەو سەردەمەدا ببووە سەرچاوەی گاڵتەپێکردنی خەڵك. بە شێوەیەك لەم دادگایە فازڵ جەمالی سەرۆك وەزیرانی پێشووی سەردەمی پاشایەتی بە سیخوڕی سەردەمی پاشایەتی تۆمەتبار دەکرێت. کەچی فازڵ بە بەڵێ وەڵام دەداتەوە و دەڵێ" من تەنها سیخوڕ نەبووم بەڵکو لە حکومەتەکە کارم دەکرد و تا پۆستی سەرۆك وەزیرانیشم وەرگرت"!!!. ئایا بابەتێکی لەم شێوەیە لە دادگا دەچێتە عەقڵ؟! کەچی هەر دادگای مەهداوی لەسەر کوشتارگەکەی موسڵ و کەرکووك دادگایی شیوعییەکان ناکات. قاسم لە دژی قەومییەکان دەوەستێ کە لە شۆڕشدا پاڵپشتی ئەو بوون، دواتریش شۆڕشی کوردی هەڵگیرسا. هەموو ئەمانە لە ئەنجامی نەزانی عەبدولکەریم قاسم بوو لە حوکمڕانیدا، کە ئەمەش بە لۆژیکی سیاسی بە بێسەروبەری ناودەبرێت.

بەڵێ لە ماوەی حوکمڕانی قاسمدا زۆر دەستکەوت هەبوو، بەڵام زۆربەیان ناعەقڵانی و بێ ئەنجام بوون، لەوانە دەستی کرد بە دروستکردنی شوێنی نیشتەجێ بوون بۆ جووتیارە هەژارەکان، کە لە دەرەوەی بەغدا هاتبوون لەنێو ئەوانەشدا ناوچەی سەورە بوو. بە شێوەیەك زیاتر لە یەك ملیۆن کەس زەوی کشتوکاڵی خۆیان جێهێشت و بەرەو بەغدا هاتبوون. ئەمەش کاریگەری لەسەر ئاستی کشتوکاڵ

هەبوو، ئەم کەسانەش بوونە هێزێکی بێکاری لە بەغدا کە دواتر یاسای تایبەتیان هەبوو جا لە هەر ناوچەیەکی پایتەخت بن کێشە بوون.

بۆ من جێگەی داخە ئەم پیاوە نیشتیمانپەروەرە پاکە شارەزایی و توانای لە بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسی نەبوو. کاتێک دواتر عەبدولسەلامی هاوڕێی لێی دەچێتە ژوورەوە دوای ئەوەی ئابلۆقە دەدرێت، ئیمزا لەسەر گوللەبارانکردنی دەکات. دواتریش ڕێز لە لاشەکەی ناگیرێت وێنەی کوشتنەکەی لە تەلەفزیۆن نیشان دەدرێت هەندێك سەربازیش لەسەر کورسییەکە گاڵتەی پێ دەکەن.

**عەبدولسەلام عارف: یەکەم کەس بوو عێراقی لە ڕووی تایفییەوە پارچە پارچە کرد**

## " وەردی بانگی ئەمن دەکرێت"

بۆ مێژوو شایەتی ئەوە دەدەم، دکتۆر عەلی وەردی ڕقی لە باسکردنی عەبدولسەلام عارف بوو. (عەبدولسەلام عارف لە ساڵی ١٩٢١ لەدایك بووە و لە ساڵی ١٩٦٦ مردووە. دووەم فەرمانڕەوای ڕژێمی کۆمارییە. لە شۆڕشی چواردەی تەمموز دووەم کەسایەتی بوو. چەندین جار هەوڵی داوە کودەتا بەسەر عەبدولکەریم قاسمدا بکات. ئەمەش بووە هۆی دوورخستنەوەی بۆ ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و دواتریش زیندانیکردن و بڕیاری لەسێدارەدانی، کەچی عەبدولکەریم قاسم لێی خۆشبوو، بەڵام عەبدولسەلام عارف بە هاوکاری حزبی بەعس گەڕایەوە و کودەتای بەسەر قاسم کرد و خۆی بوو بە سەرۆك کۆمار)، دکتۆر عەلی وەردی دەیگوت یەکەم کەس عێراقی لە ڕووی تایفییەوە دابەشکرد عەبدولسەلام عارف بوو. پێشتر لە سەردەمی پاشایەتی و سەردەمی عەبدولکەریم قاسم ئەو کێشە سیاسییانەی ڕوویان دەدا

حزبی بوون. لە نێوان شیوعیەکان و قەومییەکان بوو، یان دواتر لەگەڵ بەعسییەکان بوو، ئەم حزبانەش نوێنەری هەموو تایفە و مەزهەب و ئایینەکان بوون. تا عەبدولسەلام عارف هات جیاکردنەوەی تایفی ئەنجام دا و دەرگای دۆزەخی بە ڕووی عێراق کردەوە. زانیاری ئەوە لە دانیشتنە تایبەتەکانی دزەی کردووە کە ڕەخنەی لە پیاوانی شیعە گرتووە، بەوەش ناسراوە دینداریکی توندڕەو بووە. دوورخستنەوەی شیعە لە فەرمانگەکانی حکومەت لە سەردەمی ئەو بوو. یەکێك لەو کەسانەی یاوەری عەبدولسەلام عارفی کردبوو بۆ میسر بۆی گێڕامەوە کاتێك عەبدولسەلام عارف داوای لە عەبدولناسر کرد یەکێتی لە نێوان عێراق و سووریا و میسر ئەنجام بدات، عەبدولناسر بەمشێوەیە وەڵامی دایەوە و وتوویەتی" من لەگەڵ پارێزگای ڕومادی یەککرتن ئەنجام نادەم! !".

کاتێك پرسیار لەبارەی هەڵسوکەوتەکانی کرا، بە یەکێك لە وتە بەناوبانگەکانی وەڵامی دایەوە کە لە یەکێك لە وتارە پڕ حەماسەکانی هاتووە، دەڵێ" من دژی شیعە نیم، یان دژی هیچ لایەن و توێژێکی عێراق نیم. بەڵام دژی ڕەفتاری تایفەگەرییم. پەیوەندیم بە مەرجەعەکانی شیعە کردووە، جیا لەمەش پەیوەندیم بە سوننەکانیش کردووە، بە مەبەستی نوێکردنەوەی یاسای عێراق لە میانەی سەرچاوە شەرعییەکانی ئیسلامەوە". سەرەڕای ئەمەش وەردی لەبارەی عەبدولسەلامەوە دەڵێ" بە دیارکردنی ڕەفتاری تایفەگەری لەلای تاکە تایفەیەکەوە عارف تایفەگەریی خۆی دەرخستووە، ئەو وەك سەرۆکێکی عێراق نەدەبوو تاکە تایفەیەك دەستنیشان بکات، بەڵکو تەنها دەبووایە بڵێ من دژی ڕەفتاری تایفەگەرییم".

کاتێك فرۆکەکەی عەبدولسەلام کەوت (هەلیکۆپتەری جۆری mi ڕووسی) زۆرینەی گەل کە گوێبیستی هەواڵەکە بوون دڵخۆش بوون. سەرۆك ڕەفتاری توند بوو. بەهۆی بەعسییەکانەوە گەیشتە دەسەڵات کەچی بە (ڕاستکردنەوەی شۆڕش) لە بەعس پاشگەزبۆوە. بەو سیفەتەی دیندار بوو دژی شیوعییەکان بوو. دواتر بەهۆی بیرکردنەوەی سەید قوتب بەرەو ئیسلامی ئیشتراکی دەڕۆیشت. ئەم ئیسلامیبوونەش لە قەومییەکانی دوورخستەوە، بەڵام بە ئاستێکی کەمتر لەو دابڕانەی کە لەگەڵ شیوعی و بەعسییەکانی هەبوو. هەموو ئەمانە و سەرەڕای چەوساندنەوەی شیعەکان. بۆیە دەبینی زۆرێك لە میللەت بەوە دڵخۆش دەبن کە لە بارودۆخێکی نادیار سەرۆکەکەیان لەگەڵ هەندێك وەزیر و یاوەرانی ژیان لەدەست دەدا. کاتێك فرۆکەکەی لەنێوان قورنە و بەسرا دەکەوێتە خوارەوە، ئەم ڕووداوەش جێگای داخە.

وەردی چەندین جار باسی ئەو بەسەرهاتەی دەگێڕایەوە کە لە سەردەمی عەبدولسەلام عارف بانگی ئەمنی عام کراوە. وەردی دەیگوت" بەڕێوەبەری ئەمنی عام داوای لێبوردنی کرد لەبەر ئەوەی بانگی ئەمن کراوم. نەیدەزانی من بەو بانگکردنە دڵخۆش بووم کە برەوی من لەنێو گەل بەرزدەکاتەوە، چونکە گەل ئەو کەسە بە پاڵەوان دەزانێ کە ئەمن بانگی دەکات، بۆیە وەك قارەمانێکی نەتەوەیی چەندین جۆری پاڵەوانێتی بۆ هەڵدەبەستن. بەڕێوەبەر ئەم تایبەتمەندییەی بە من بەخشیوە و داوای لێبوردنیش دەکات دوای ئەمە پرسیارێکی سەیری لێکردم: دکتۆر دەزانی هەر باڵوێزێکی بەریتانی یان ئەمریکی لە عێراق دادەمەزرێت پابەند دەکرێ بەوەی

کتێبەکەی تۆ: سروشتی کۆمەڵگای عێراقی. بە زمانی ئینگلیزی بخوێنێتەوە، ئینجا دێتە عێراق. لە ڕێگای سەرچاوەکانی خۆمان لەو زانیارییانە دڵنیابووین کە ڕاستە؟ منیش وتم نازانم و ئاگادار نیم. بەڕێوەبەری ئەمن وتی پێتوایە ئەم دەوڵەتە گەورانە بۆ وا دەکەن چییان لە کتێبەکەی تۆ دۆزیوەتەوە؟ منیش وتم "چونکە ئەوان دەزانن و ئێوە نازانن. ئەوان فیکر دەخوێننەوە و ئێوە ناخوێننەوە. ئەوان ڕێزم لێ دەگرن و کتێبەکانم دەخوێننەوە، کەچی ئێوە وەك تاوانبار بانگی ئەمنم دەکەن، ئەمە هۆکارەکەیە، ئەمەیە جیاوازی نێوان ئێوە و ئەوان! " بەمەش عەلی وەردی بەڕێزەوە ڕەوانەیماڵەوە دەکرێتەوە. (بەڵگەی ڕێگەدانی سەفەر بە عەلی وەردی لەلایەن ئەمنی عام لە ساڵی ١٩٦٥ لە پاشکۆی ئەم کتێبە بڵاوکراوەتەوە.)

## عەبدولڕەحمان عارف: هەلێک بۆ ئازادی لە کاتێکی تەنگدا

عەبدولڕەحمان عارف لە ساڵی ١٩١٦ لەدایك بووە، لە ساڵی ٢٠٠٧ مردووە. ئەفسەرێکی عێراقی بوو، دوای مردنی براکەی (عەبدولسەلام عارف) لە ساڵی ١٩٦٦ تا ساڵی ١٩٦٨ بوو بە سەرۆك کۆماری عێراق. ئەمەش بە بڕیاری سەرکردە و ناوەندەکانی هێز بوو لە عێراقدا) وەردی دەڵێ ماوەی نێوان ١٩٦٦ – ١٩٦٨ جوانترین کات بوو لە ڕووی ئازادییەوە کە عێراق بەخۆیەوەی دیوە. عەبدولڕەحمان ئازادییەکی بەخشی کە لە سەردەمی براکەی نەبوو، لەگەڵ بوونی دەزگایەکی ئەمنی بەهێز کە بە هەمان شێوەی سەرۆکی پێشوو بوو، بەڵام سەرۆکی نوێ دەستی دەخستە کاروباری ئەمنی و فەرمانی ئازادکردنی زیندانییەکانی بیروڕای دەکرد.

لە کۆتاییدا وەردی دەڵێ بەو ئازادییەی عەبدولڕەحمان عارف بە

سیاسییەکانی بەخشی، دەسەڵاتەکەی خۆی لەسەر دانا. ئەوان پیلانیان لە دژی گێڕا، لەپێناو خستنی وەزارەتەکانیان لە ژێرەوە کۆنترۆڵ کرد، ئەویش بەدوای بیرۆکەی بەخشینی ئازادی زیاتر بوو، بەڵام کودەتاکەی بەعس دەسەڵاتی ئەوی ڕووخاند. سوپاس بۆ خودا ئەو پیاوە ڕووداوێکی بێ وێنەی لە مێژووی عێراق تۆمار کرد کە سەرۆک دوای کودەتاکە نەکوژرا.

## ئەحمەد حەسەن بەکر: فەرمانڕەوای هۆز

**(ئەمن ئاگاداری وەردی دەکاتەوە خۆی لە هەڕەشەی ئاسایشی ناوخۆ بەدوور بگرێت)**

ئەحمەد حەسەن بەکر لە ساڵی ١٩١٤ لەدایک بووە، لە ساڵی ١٩٨٢ مردووە. لە ساڵی ١٩٦٨ تا ساڵی ١٩٧٩ فەرمانڕەوایی عێراقی کردووە. پێشتر لە سەردەمی عەبدولسەلام عارف، بەکر ماوەی دە مانگ سەرۆک وەزیران بوو، بەڵام عەبدولسەلام عارف لە بەعسییەکان هەڵگەڕایەوە و دواتریش بەکر کودەتای بەسەر عەبدولڕەحمان عارفی برای کرد.

دکتۆر وەردی دەڵێ ئەگەر سەیری ناوی ئەندامانی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بکەین، لە دوای ئەو کودەتایەی بەسەر عەبدولڕەحمان عارف کرا، دەبینین زۆربەی وەزیرەکان لە یەك هۆزن، لە کۆی هەشت کەس دووانیان دوور بخەوە کە بەعسی نەبوون، ئەوانیش نایف و داود بوون، ئەوانیتر هەموویان لە یەك هۆز بوون کە دەستیان بەسەر وەزارەتە گرنگەکان داگرتبوو، لەوانە: ئەحمەد حەسەن بەکر سەرۆك – حەردان تکریتی جێگری سەرۆك – سەدام

حوسێن تکریتی جێگری سەرۆك – سەعدوون غێدان تکریتی وەزیری ناوخۆ – حەماد شەهاب تکریتی وەزیری بەرگری. دوای ئەمانە چینی دووەمی شۆڕشگێڕان دێن کە زیاتر لە ٪۷۰ خەڵکی تکریت بوون. سەرەڕای ئەوەی خەڵکی یەك شار بوون، ژن و ژنخوازیشیان لە نێوان هەبوو.

ئەو ماوەیە پارێزگای سەلاحەددین ڕۆڵێکی گەورەی لە مێژووی حوکمڕانی عێراق هەبوو. بە شێوەیەك شار و شارۆچکەکانی سامەڕا و دۆرە و عۆجە و تکریت ببووە نازناوی سەرجەم فەرمانڕەواکانی عێراق. کەسێك نازناوی تکریتی بووایە ئەوا خەڵك حسێبی بۆ دەکرد. وەك دەردەکەوێت بەعسییەکان درکیان بەو مەسەلەیە کردووە، بۆیە بڕیارێك دەردەچێ نازناوی هۆز بەکارنەهێنرێت تەنها ناوی سیانی نەبێت. بەمەش ناوی سەرکردەکانی عێراق گۆڕا. سەدام تکریتی بوو بە سەدام حوسێن، عیزەت دووری بوو بە عیزەت ئیبراهیم، سەعدوون تکریتی بوو بە سەعدوون غێدان، حەماد تکریتی بوو بە حەماد شەهاب. ئەو کارەش هەنگاوێکی سەرکەوتوو بوو بۆ پەردەپۆشکردنی دەسەڵاتی هۆز لە عێراقدا. دوای ماوەیەك هۆزەکە بەوە ڕازی نەبوو هۆزەکانی دیکە لە دەسەڵات بەشدار بن، بۆیە لە عەبدولخالق سامەڕایی هەڵگەڕایەوە و ڕێگەیان نەدەدا خەڵکی سامەڕا لە پۆستە گرنگەکان نزیك ببنەوە، دوای ئەمەش ناوی نوێ دەرکەوتن لەوانە عەدنان خەیروڵڵا تکریتی بوو (هەڵبەتە بێ نازناوەکە) ئەم پیاوە برای هاوسەری سەدام بوو، زاوای بەکر بوو، لەگەڵ دەرکەوتنی تەها یاسین جزراوی کە ئەم دووانەش خرانە ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش.

بەمشێوەیە عێراق لە ماوەی فەرمانڕەوایی بەکردا تەنها لە پارێزگای

سەلاحەددین قەتیس ببوو. نکۆڵی لەوە ناکرێت کە چەندین وەزیر هەبوو وەزارەتی گرنگیان بەدەستەوە بوو، خەڵکی تکریتیش نەبوون، بەڵام ئەمانە بە توانای حاجی خەیروڵڵا تلفاح بوو کە باوکی عەدنان و ساجیدەی هاوسەری سەدام بوو. ئەو فەرمانی دەکرد ئەوانی تریش گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەبوون، چونکە خاڵی جێگری سەرۆك و خزمی سەرۆك بوو. کاتێك خەڵکی تکریت خواستیان بۆ دەسەڵات زیاتر بوو بەدوای پۆست و دەسەڵاتەوە دەهاتنە بەغدا، ئینجا بازنەکە فراوانتر بوو، کاتێکیش دەسەڵاتە تایبەتەکەی خۆیان دروستکرد داوایان لە سەرۆك بەکر کرد لەماڵەکەی خۆی پشوو بدات!!

لە یەکێك لە دیدارە ڕۆژنامەوانییەکان پرسیار لە مامۆستا سەلام شەماع کراوە ئایا ڕاستە بەڕێوەبەری ئەمن بانگی وەردی کردووە و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کردووە یان زیندانی کردووە؟ شەماع ڕەتی دەکاتەوە بەو باوەڕەی ئەم بابەتە لە ماوەی حوکمڕانی سەدام حوسێن ڕوویدابێ. بەپێی زانیارییەکانی ئەو لە سەردەمی سەدام حوسێن ئەمن بانگی وەردی نەکردووە. دکتۆر عەبدولئەمیر وەرد لە پێشەکی کتێبەکەیدا وتوویەتی ئەمن بانگی وەردی کردووە، سەلامیش بەدووری دەزانێ.

شێخ سەلیم جبووری یەکێك لە بەڵگەکانی ئەمنی عامی پێداوم، بەڵگەکە ئەوە دەسەلمێنێ ئاگاداری وەردی کراوەتەوە لە موحازەرەکان ئاگاداری خۆی بێت، ئەمەش تەواوی زانیارییەکانی بەڵگەکەیە: (لە وەزارەتی ناوخۆ - بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی عام - ژمارە ٤٥س /٦٦٤٣٦ لە ڕێکەوتی ١٩٧٩/٤/٣٠ ، بابەت نهێنی، ئاڕاستەی بەڕێوەبەرایەتی توێژینەوە و پێشخستن کراوە.. تێیدا

هاتووە: تکایە ئاگاداری دکتۆر عەلی حسین وەردی بکرێت لەوەی ئاگای لە موحازەرەکانی بێت، خۆی لە باسکردنی ئەو شتانە بەدوور بگرێت کە خەڵکانی دیکە لێی سوودمەند دەبن و هەڕەشە لەسەر ئاسایشی ناوخۆ دروست دەکات – مەبەست لە موحازەرەکانی پۆڵۆنیایە) تکامان هەیە... ئیمزای بەڕێوەبەر ٤٥ . ئەم بەڵگەیەش لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا هەیە".

نازانم چۆن ئاگادارکردنەوەکە بە دکتۆر عەلی وەردی دراوە، ئایا بانگی باڵەخانەی ئەمن کراوە، لەبەر ترسناکی بابەتەکە و پەیوەستبوونی بە شێوەیەکی ترسناک بە ئاسایشی ناوخۆ. یان ئاگادارکردنەوەکەی بۆ ڕەوانەی ماڵەوە یان زانکۆ کراوە. شێخ سەلیم جبووری بەڵگەکانی دیکەی نیشان نەدام، بۆئەوەی لەوە ورد ببمەوە کە چۆن ئاگاداری وەردی کراوەتەوە.

## سەدام حوسێن

(سەدام حوسێن عەبدولمەجید تکریتی، پێنجەم سەرۆک کۆماری عێراق بوو. ساڵی ١٩٣٧ لەدایك بووە و لە ساڵی ٢٠٠٦ مردووە. لە ساڵی ١٩٧٩ حوکمڕانی عێراقی کرد تا کەوتنی ڕژێمەکەی بە دەستی ئەمریکییەکان لە نیسانی ٢٠٠٣ . پێشتر سەدام جێگری سەرۆك کۆماری عێراق بوو، ئەستێرەی سەدام لە ساڵی ١٩٧٥ دەرکەوت. لە سەرەتای حوکمڕانی خۆیدا گەشەپێدانی گەورەی ئەنجام دا کەچی هەر زوو کەوتە جەنگێکی هەشت ساڵە لەگەڵ ئێران و دواتریش کوێتی داگیرکرد، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هێرشی کردە سەر کوێت و هێزەکانی عێراقی وەدەرنا. کاتێك هێزەکانی عێراق لە کوێت

دەرچوون، ژێرخانی عێراق کاول بوو، مووشەکە ئەمریکییەکان کردیان بە خاك. نەتەوە یەکگرتووەکانیش ئابڵووقەیەکی ئابووری سەختی بەسەر عێراق سەپاند ئەمەش وایکرد عێراق ببێتە وڵاتێکی هەژار و نەدار. تا ساڵی ٢٠٠٣ هێزەکانی ئەمریکا گەیشتنە بەغدا و ڕژێمەکەی سەدامیان ڕووخاند).

وەردی دەیگوت ماوەی حوکمڕانی سەدام خوسێن لە ناوخۆدا قۆناغێکی قورس بوو. بەتایبەتی دوای ئەوەی ڕۆڵی هۆزی لە حوکمڕانی کۆتایی پێهێنا و دەسەڵاتی ڕادەستی گوند کرد. بە شێوەیەك هەموو کەسوکاری ئەوانەی خەڵکی عۆجە بوون جڵەوی دەسەڵاتی عێراقیان بەدەستەوە گرت. بەرزان تکرینی زڕبراکەی سەدام بووە سەرۆکی موخابەرات، وەتبان ئیبراهیم تکریتی بووە وەزیری ناوخۆ، سەبعاوی بووە بەڕێوەبەری ئەمنی عام کە ئەم دووانەش براکانی سەدام بوون. حوسێن کامل لە چەندین وەزارەت وەزیر بوو، ژیان دەرەفەتی نەدام لە ماوەی حوکمڕانی ئەوانیتر لەگەڵ وەردی بم، بۆئەوەی ڕاستەوخۆ بۆچوونی ئەو لەبارەی ئەوان بزانم.

بەخت یاوەرم بوو بەڕۆشنی و بەئاگایی تەواو کە ئەو کات تەمەنم سی ساڵ بوو، گوێی لێ بگرم، دوای بیست ساڵیش بۆچوونی ئەو تۆمار دەکەم. بێ هیچ کاریگەرییەکی سۆز و باوەڕ ئەم کارەم دەکەم. ئەو قسانەی ئێستا دەیکەم وەردی بە ئامادەبوونی مامۆستایان عەبدولموتەڵیب مەهدی عەبوود و سەلام شەماع کردوویەتی، کە ئەم دووانەش هێشتا لە ژیان ماون. وەردی دەیگوت ماوەی حوکمڕانی سەدام حوسێن خراپترین قۆناغە لە مێژووی عێراق. بۆ مێژوو دەڵێم لەوانەیە جاوازیمان لەگەڵ بۆچوونەکانی وەردی هەبێت، لەوانەیە

هەندێکمان لەگەڵ تێزەکانی وەردی نەبین، بەڵام مێژوو ئەوەمان بەسەر دەسەپێنێ ڕاستگۆ بین نەوەك شتی تر. جا لە میانەی ئەوەی ئێستا دەیگێڕمەوە، بۆمان دەردەکەوێ سەدامیش ڕقی لە وەردی بووە ! وەك دەردەکەوێت پەیوەندی نێوانیان کۆتایی پێهات بێئەوەی کەسێکیان دەردەدڵ لەویتر بکات. بۆ مێژوو ڕاستییەکە دەگوازمەوە وەك ئەوەی بیستوومە.

## سەدام حوسێن : وەردیم خۆشناوێ.

ئەو (..........) شاعیرێکی ناسراوە، نووسەرێکی ڕۆژنامەوانە، ئەدیب و دیپلۆماتکارێکە بە پلەی ئیمتیاز. ئەم پیاوە بەعسییەکی پابەند بوو بە بنەماکانی حزبی بەعس. ئەو بنەمایانەی بە دڵ و جەستە لەگەڵیان دەژیا نەیدەهێشت بەرەو دەسەڵاتی زیاتر بڕوات. دوای ئەوەی هۆز دەستی بەسەردا گرتبوو، لە ماوەی دووەمی حوکمڕانی بەعس لە عێراقدا. ئەم پیاوە بە کودەتای ڕاستکردنەوە هەڵنەسا، لەگەڵ ئەو کەسانەش بەشدار نەبوو کە هەوڵی جووڵانەوەی ڕاستکردنەوەی شۆڕشیان دا و ڕوحی خۆیان کردە قوربانی هەوڵەکانیان. بەتایبەتیش هەوڵێك لەبەردەم ئەو پیاوە نەبوو لە هەموو گۆڕانکارییەکانی سێ قۆناغەکەی بەعسدا لە ساڵی ١٩٦٨ – ١٩٧٥ – ١٩٧٩ کە لە قۆناغی یەکەمدا: بەعسی عەرەبی بوو بە بەعسی عێراقی، دواتریش بوو بە بەعسی هۆز و دواجاریش بوو بە بەعسی گوند. یان لە چاکترین حاڵەتدا یەك شاری نوێنەرایەتی دەکرد.

ئەو هاوڕێ ئەدیب و شاعیر و دیپلۆماتکارە دەچووە سەر ڕەچەڵەکێکی ئیسلامی شیعی، ماوەیەکی زۆر لە وڵاتێکی پێشکەوتووی ڕۆژئاوا کاری دیبلۆماسی دەکرد. لەو ماوەیەی

گۆڕانکاریی سیاسی توند لە شێوەی کودەتا و دژە کودەتا لە نێوان حزب و سەرکردایەتی و دەوڵەت ڕوویدەدا، ئەو پیاوە دوور بوو لە عێراق. کاتێك ئەو هاوڕێیەمان گەڕایەوە لەلایەن دەسەلآت و گەل ڕێزی هەبوو. بە بێدەنگی خزمەتی خەڵکی دەکرد، بێ هەراوزەنای ڕاگەیاندن لەگەڵیان بوو، خواستێکی زۆری بۆ پۆست یان پێگەیەکی بالآی دەوڵەت نەبوو. قەدەری سیاسی ئەو وەها بوو لەسەر کەرپووچ نووست و کەرپووچیش لەسەر ئەو (مەسەلەی ئەم کەرپووچە ئیدیۆمێکی سیاسی عێراقییە بۆ ئەو کەسانە بەکاردێت کە لە پۆستی بەڕێوەبەری گشتی یان بریکاری وەزیر دەوەستێ، ئەگەر بەرزیش بکرێتەوە ئەوا دەکرێت بە ڕاوێژکار – نووسەر). هۆکاری ئەو چەقبەستنەی هاوڕێیەکەمان وەك ئەو کات باس دەکرا ئەوە بوو فەرمانێکی سەرۆکی ڕەتکردۆتەوە کە داوای کردبوو ببێت بە وەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن. پاساوی ئەم پیاوە ئەوە بوو لەبەر ئاڵەنگاریی قۆناغەکە دەبێت وەزیری ڕۆشنبیری جەنگاوەر بێت نەوەك ڕۆشنبیر. ئەم پاساوەش سەرۆکی وڵات ڕازی دەکات بۆیە لەجیاتی ئەو، ژنێکی جەنگاوەر بۆ پۆستەکە دادەنێت. هەرچەندە ئاستی ڕۆشنبیریی ئەو وەزیرە لە قۆناغی ناوەندی تێپەڕی نەدەکرد بەڵام ئەو ژنە باشتر بوو لە شاعیرێك، هەرچەندە شیعرەکانی بۆ چەندین زمانی بێگانە وەرگێڕدراوە، کەچی لە هونەرەکانی جەنگ تێناگات! ئەمەش وایکرد ئەو هاوڕێیەمان ساڵانێکی زۆر لە چوارچێوەیەکی تەسك بمێنێتەوە نەیتوانی بۆ بازنەیەکی فراوانتر بڕوات، ببێت بە ڕاوێژکار یان بەڕێوەبەری گشتی.

ڕووداوەکانی عێراق هەمیشە بۆ هەموو لایەك قورسە. کوڕی گەورەی

سەرۆك گەورە بوو ناوی عودەی بوو. ئەم كوڕە ویستی دەسەڵاتی سیاسی هەبێت. سەرەتا یانەیەكی وەرزشی دانا، دواتر هەر زوو بەرەو كارگێڕیی وەرزشی ڕۆیشت و سەرۆكایەتی یەكێتیی تۆپی پێی دەكرد، ئینجا لیژنەی ئۆلۆمپی عێراقی خستە ژێر دەستی خۆی و ببوو بە سەرۆكی لیژنەكە. لە باوكە كۆنە شۆڕشگێڕەكەی هیچ ناڕەزایی و پەستی نەبینی، بۆیە بەرەو ڕۆژنامەگەری ڕۆیشت. بوو بە نەقیبی ڕۆژنامەنووسانی عێراق، ڕۆژنامەیەكی فەرمی دەركرد، كە زمانحاڵی خۆی بوو، لەگەڵ چەندین ڕۆژنامەی دیكەی یەكێتی و سەندیكاكان كە هەمووی لەژێر دەسەڵاتی ئەو بوو. سەرۆكی فەخری یەكێتیی گشتی لاوان و یەكێتیی قوتابیان بوو. دواتر كۆمەڵەیەكی بۆ خۆی دانا بەناوی كۆمكاری ڕۆشنبیریی عێراقی، یەكێتیی نووسەران و ئەدیبانی خستە سەر ئەم كۆمەڵەیە. جیا لەمەش تەلەفزیۆنێكی دانا بەناوی (الشباب) دوای ماوەیەكی كورت ئەم كەناڵە لە هەردوو كەناڵە فەرمییەكەی دیكە بینەری زیاتر بوو. وەك لاساییەكی ڕۆژئاوا چۆن لە پاڵ حكومەتی ڕاستەقینە، حكومەتی سێبەریش هەیە. ئەو كوڕەش سەرۆكی سێبەر بوو، یاوەرەكانی دەیانتوانی پشتملی هەر وەزیرێك بگرن بۆئەوەی لەبەردەم ئوستاز ئامادەبێت (وشەی ئوستاز ئەو كات نازناوێك بوو بۆ عودەی بەكاردەهات).

داوای لێبووردن لە خوێنەران دەكەم یەكێك لە پۆستە داهێنراوەكانی ئوستاز عودەیم بیرچوو، ئەویش فەرماندەی سوپایەك بوو بەناوی (فیدائییەكانی سەدام) مووچەیەكی بە سەربازەكانی دەدا كە زۆر لە مووچەی سوپای عێراقی زیاتر بوو!

عودەی سەدام بایەخێكی زۆری بە ڕۆژنامەگەری دەدا، هەوڵی دەدا

زۆرترین ژمارەی ڕۆژنامەنووسان لەژێر دەسەڵاتی خۆی کۆبکاتەوە. کاتێك زانی ڕۆژنامەنووسە گەورەکان ناچنە ژێرباری ئەو، ئوستاز فەرمانی بە نووسەرانی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی خۆی کرد، هێرش بکەنە سەر ڕۆژنامەنووسە کلاسیکییەکان، ئەوانەی بە مشك و ئاژەڵ قرانکەوتوو، مۆمیاکراو ناوی دەبردن، لە وتارێکدا کە وەك سەروتاری ڕۆژنامەی بابل بڵاوکرایەوە داوای (لە ڕۆژنامەنووسە دێرینەکان کرد واز لە یەکێتیی ڕۆژنامەنووسان و یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی عەرەب بهێنن، و با دوایین ڕۆژگاری خۆیان لە ماڵەوە بەسەر بەرن...) هەر بەمشێوەیەش بوو.

دوای ئەوەی هاوڕێیەکەمان کەرپووچی لەسەر دانرا، لە سەردەمی ئوستاز عودەی کوڕی سەرۆك، خۆڵی بەسەر داکرا. عودەی ئەو لاسارەی بۆ هەر کوێیەك دەچێ جڵەو ناکرێت و سڵ لە هیچ شتێك ناکاتەوە. لە دڵ و زەینی ملیۆنان گرێی دەروونی و کۆمەڵایەتی هەڵگرتووە. ئەمەش بە هۆکاری خوێندنەوەی میتۆدێکە هەڵە تێگەیشتووە. ئەم ڕێبازە ئاوەژووەی مێژوو کە خوێندنەوەکەی دواجار دەبێتە هۆی دەرکەوتنی دیاردەی (ئوستاز). هیچ شتێك لە ژیان تێناگات و هەمیشەش لە هەموو زانستەکان دەزانێ. ئوستاز ئەندازیاری مەدەنی بوو، دکتۆرای لە سیاسەت هەبوو. تیپی تۆپی پێی بەڕێوەدەبرد، سەرۆکی سەندیکای ڕۆژنامەنووسان بوو، سوپایەکی هەبوو بە هەزاران چەکدار دەخەملێندرا. هیچ ڕەقیب و لێپرسینەوەیەکی بۆ نەبوو. ئەم سەرۆکی حکومەتی سێبەری دیکتاتۆرەکە بوو کە خەریك بوو باڵی بەسەر هەموو عێراق دەکێشا.

هاوڕێیەکەمان چووە ماڵەوە، بە هێمنی دەژیا و بە وریایی چاودێری

رووداوەکـانی دەکـرد. ئـەوکات کۆنفرانسـەکانی عـودەی بـۆ ڕۆژنامەنووسان ببووە نوکتە. جارێکیان فەرمانی بە داردەستەکانی خۆی کرد، کارگێڕیی سەندیکای ڕۆژنامەنووسان کە لە کۆنگرەی گشتی بوون، بەر تەمامە بدەن. هەڵبەتە خۆی لەوێ نەبوو، کاتێک هەواڵەکەیان پێ ڕاگەیاند وەك کەسێکی نزیك بۆی گێڕامەوە، عودەی لەبارەی ڕووداوەکە وتبووی" بۆچی بە شتی گران لە شتی هەرزان دەدەن".

سوپاس بۆ خودا هاوڕێیەکەمان لە کۆبوونەوەکە نەبوو، سەرۆك ئەوی پاراستبوو، کردبووی بە ڕاوێژکاری رۆژنامەوانی خۆی، ئەمەش ئاماژەیەك بوو بۆ کوڕە بێ ئابڕووەکەی تا لەم پیاوە نزیك نەکەوێتەوە. چەندین کەس بۆیان گێڕامەوە کە ڕۆژێك عودەی پرسیار لەو ڕاوێژکارە دەکات ئاخۆ لەو قسە سووکانە پەست نەبووە کە لە ڕۆژنامەکان لەبارەی ئەو کراوە، ئەویش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ" بەڵێ پەست بووم، بەڵام وەك ڕێزێك بۆ باوکت وەڵامم نەدایتەوە". عودەیش قین لەدڵ دەمێنێتەوە و دەڕوا!

لەوانەیە سیمای ئەو پیاوەی باسی دەکەم، لەلای خوێنەرانی مێژووی عێراق ناسراو بێت. بەتایبەتی ئەوانەی لە هەشتا و نۆهەدەکانی قۆناغی بەعس ژیاون. لەبەر ئەوەی من مۆڵەتم لێی وەرنەگرتووە بۆیە ناوم نەهێناوە. هەوڵم داوە وێنەیەکی نزیك بکێشم، تکام وایە ئازاربەخش نەبێت. ئەم خاوەن چاکەیە بەسەرمانەوە، هەرگیز لەبیر ناکرێت. لەوانەشە ئەگەر مۆڵەتی لێ وەربگرم و ڕازی بێت ئەوا ڕۆژێك بێت ناوی دەهێنم.

ڕۆژێك لەو هاوڕێیە ڕاوێژکارەم پرسی ڕۆڵی ڕاوێژکاری ڕۆژنامەوانی

سەرۆك چییە؟ وتی سەرۆك بانگی ڕاوێژكار دەكات، لەبارەی بارودۆخی ڕۆشنبیریی وڵات پرسیاری لێ دەكات، ئاخۆ چی دەگوزەرێ. لەوانەیە پرسیار لە شتێكی دیاركراو بكات ڕاوێژكاریش كتێبی لەبارەی ئەو شتانە بۆ ئامادە دەكات كە داوای كردووە، یان شتێك هەیە ڕاوێژكار بە گرنگی دەزانێ بگات بە سەرۆك. وتم ئایا ڕۆژێك سەرۆك لەبارەی ئەو كەسایەتییانەی لە مەجلیسی خاقانی ئامادە دەبن، پرسیاری لێ كردوون، بۆ نموونە دكتۆر حوسێن عەلی مەحفووز و دكتۆر عەلی وەردی؟ ڕاوێژكار وتی" من لەلای ئەو باسم كردوون، وتم بۆچوونت لەبارەی ئەوانە چییە؟ سەرۆك وتی هزری مەحفووز ئاڵۆزە خوێندنەوەی ئەوم پێ خۆش نییە! كاتێك وتم عەلی وەردی، سەدام بە دەست ئاماژەی كرد و وتی خۆشم ناوێ من عەلی وەردیم خۆشناوێ. ئەمەیە" كاتێك سەرۆك یەكێكی خۆشناوێ نابێت لەلای ئەو باس بكرێت. ئەمە نەریتی گشتی فەرمانڕەواكانی ڕۆژهەڵاتە.

لێرەدا دەچمە سەر بابەتێكی دیكە وەك ڕاوێژكار پێی گوتم لە توانای كەس نییە پرسیار لە سەرۆك بكات هۆكاری چییە ڕقی لەو كەسەیە. بەتایبەتی كەسەكە لە ئاستی وەردی بێت. ئەو وتەیەی سەدام ڕاست دەركەوت كاتێك لە تەلەفزیۆن لە دیمانەیەك دەركەوت، جەختی لەسەر ئەوە كردەوە كە بۆچوونەكانی ئەو پێچەوانەی بۆچوونی وەردییە لەبارەی كەسێتیی تاكی عێراقییەوە. لەبەر ئەوەی ئەم بابەتە چەندین جار باس كراو و گێڕدراوەتەوە، لە چەندین كتێب هاتووە، لەبەر ئەوەی ئەوانەی دەیگێڕنەوە هزریان تێكەڵ بە بیرۆكەكە كردووە، باوەڕیان تێكەڵ بە بیروڕا كردووە، من لێرەدا

بەتـــەواوی وردەکارییـــەکانی ڕووداوەکـــە دەگێڕمـــەوە، دوای ئەمـــە ڕووداوەکە بۆ مێژوو و بەراوردکردن جێدەهێڵم.

لە کاتژمێر هەشتی ئێوارە وەك نەریتی خۆی سەرۆك سەدام حوسێن لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن دەرکەوت، پێشوازی لە ژنە ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی کریستین هۆڵمز کرد، کە هاتبوو دیمانەیەك لەگەڵ سـەرۆك بکات لەبارەی سیاسەت و ئـابووری و دەسـەڵاتی تاکەکـەس و تاکـە حزب کە هەموو ئەمانە لە چوارچێوەی دەستوور بـوون. سـەرۆکیش بەوە وەڵامی دەدایەوە کە ئەمە تەوافوقی نیشتیمانی و ڕاپرسی بووە. گوایە خۆی و حزبەکەی مافی دەسەڵاتیان بەدەستهێناوە. لێرەدا ژنە ڕۆژنامەنووسـەکە لـەناکاو بـە سـەدامی وت" زانایـەکی کۆمەڵناسـی عێراقی هەیە، بەناوی عەلی وەردی دەڵێ کەسێتیی عێراقی بە ئاسانی پاڵپشتی و وەلائی خۆی بە دەسەڵاتدار نـادات، دەبێـت دەسـەڵاتدار بزانێ ئەو کەسێتییە دووفاقییە، لەوانەیە بارودۆخی ئێستا وایکردبێ وەلائی بە دەسەڵات بدات ئەگینا ڕاستەقینە نییە".

سەدام سەرسام بوو، تیۆرەکەی وەردی ئەوی خستە دووڕیانێکەوە. لـە ڕووی مێژووییـەوە کەسـێتیی تـاکی عێراقـی پاڵپشـتی خـۆی بـە دەسەڵاتدار نادات، ئەگەر پێی دا ئەوا لەبەر هەر هۆیـەك بێـت ناچـار بووە، بە شێوەیەکی کاتی ئـەم کـارە دەکـات، تـۆش ئـەی جـەنابی سەرۆك دەڵێی هەموو عێـراق دەنگـی بـە تـۆ داوە و پیرۆزبایيـان لـێ کردووی، ئەی چی لەبارەی ئەو وتە زانستییەی کەسێك کردوویەتی کە ڕۆژنامەنووسەکە بە زانایەکی کۆمەڵناسی عێراقی ناوی دەبات؟

سەدام پـڕ بـەدەمی وتـی" مـن لەگـەڵ بۆچـوونەکەی وەردی نـیم" ئەمەی بە فەرمی لەسـەر شاشـەی تەلـەفزیۆن وت. جـەنابی سـەرۆك

جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، ئەو کەسێتییەی وەردی قسەی لەسەر کردووە کەسێتییەکی مێژووییە، فەرمانڕەوای ئەوتۆی نەدۆزیوەتەوە تا متمانەی پێ بکات، ئەم کەسێتییە لە ڕابردوودا لەسەر هەق بووە، بەڵام کەسی عێراقی ئەمڕۆ جۆرێکی دیکەیە دەستکەوتەکانی حزبی بەعسی لە هەموو ڕووەکان بینیوە، بە تێپەڕبوونی ساڵان و هاتنەدی خەونـــەکانی تـــاکی عێـــراق متمانـــەی بـــە ســـەرکردایەتییەکەی کردووە....لێرەدا دەقە ئینگلیزییەکەی پرسیارەکە دەهێنمـەوە کە لەلایـەن دار مـەئموون چـاپکراوە و لەلایـەن وەزارەتـی ڕۆشـنبیری و ڕاگەیانـدنی عێراقـی بڵاوکراوەتـەوە، بـە ژمـارە ١٠٢٥ی کتێبخانـەی نیشتمانی پارێزراوە بە ناونیشانی:

President Houssien interviewed by American researcher

پرسیار و وەڵامەکەش لـە لاپـەڕە (٣٧) ی کتێبەکـە دایـە کـە ئەمـە تێکستەکەیەتی:

**President Houssien interviewed by American researcher**

(**Helms**: The Iraqi sociologist Ali Al-Wardi says that the Iraqi personality is a double personality. On the one hand the Iraqi may be severe, decisive and strong, but then he may be loving, temperamental and generous. Do you agree with this opinion? How do you justify this? Does this have historical reasons?

**President**: Double personality is different from what you have described. A double personality means that the same personality bears two different nest: at certain times it appears human and ?ovens good deeds, while at there times, without a basic change of situation, it appears hateful of life, good and humanity. This could take the form of a social disease effecting any society, in accordance, of course, with its historical conditions. You may find those affected by this disease in the Iraqi society more or less in number than those in the French or Libyan society, for instance, more or less than what you find in the Greek society. The case is connected with historical development and the conditions of society. There is no doubt that political development, together with the aspects connected with social, economic, and political life, including the question of democracy and its circumstances, has an influence on the number of people affected by this disease. But the example you just referred to, if mentioned by Al-Wardi,

is not a case of disease. You may even find the leader himself more delicate than a vial of perfume or a rose. But you may also find him sharper than a sword's edge. In all these cases he is not of a double personality. Take me for instance: as a human being I suffer when I sign a sentence of death on the military commanders you have mentioned, that is on the human and personal levels. But acting from a position of responsibility, I find their behaviour deserving such punishment, which I wish it did not take place. So you find me and every official in the State and the Party: we feel as we should on the human level, yet we are strong and balanced enough to behave as officials towards responsibility)

ئەمە چیرۆکەکەیە کە ڕوویداوە. داوا لەو مامۆستایانە دەکەم ئەوانەی چیرۆکەکەیان لە وتار و کتێبەکانیان گێڕاوەتەوە، بەمشێوەیە ڕاستی بکەنەوە کە لێرەدا هاتووە. من هەر لێرەدا باس لە کاردانەوەی دوای بەسەرهاتەکە دەکەم و باسی ئەو تێکەڵکردنەش دەکەم کە لەلایەن هەندێك نووسەر ئەنجام دراوە. کاتێك کاردانەوەکانی سەرکردایەتی عێراقیان لە دژی وەردی لە ساڵی ١٩٨٣ بە ڕووداوێك بەراورد کردووە کە لە نێوان وەردی و دەسەڵات لە ساڵی ١٩٩١ ڕوویداوە. ئەم جیاوازییەش نزیکەی دە ساڵە. جا تکام وایە ئەوانەی شتی دیکەیان نووسیوە با ڕاستی بکەنەوە، بۆئەوەی سەربووردەی وەردی بە تەواوی بە مێژوو بگات، چونکە خەڵکانێك دوای ئێمە دێن نووسینەکانی ئێمە دەخوێننەوە، زانیارییەکان بەراورد دەکەن ئینجا بە بەڵگە بێت یان بەراوردکاری ئەوا ڕاستییەکان دەردەخەن.

ئێستا دێمەوە سەر ئەو کاردانەوەیەی کە لە دیمانە سەیرەکەی کەوتەوە. لەم دیمانەیەدا سەدام حوسێن بۆچوونی خۆی لەبارەی یەکێك لە زانا زیندووەکانی عێراق وت، کە هێشتا لەسەر خاکی عێراق ماوەتەوە. لێرەدا دەبووایە دکتۆر وەردی کۆمەڵێك کار ئەنجام بدات: یەکەم: وەردی دروستی تیۆرەکەی پووچەڵ بکاتەوە و پاڵپشتی بۆچوونەکەی سەرۆك بکات. ئەمەش مامۆستا سەلام شەماع بە (خۆنەجاتدان) ناوی دەبات. بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەبوو وەردی نەجاتی نەبوو، بەڵکو قوڕەکەی خەستتر کرد. دەبینین بەو ڕۆژنامەنووسە دەڵێ کە دیمانەی لەگەڵ کردووە: زۆرێك لە تیۆرەکانی گۆڕیوە بەتایبەتی ئەوەی وەردی زۆر جەختی لەسەر زانستیبوونی

دەکردەوە (وەردی دەڵێ: تیۆرە زانستییەکە هەڵەیە و قسەی سەرۆك ڕاستە) پێم وایە ئەگەر دەینووسی ئەوا نیشانەی پرسیاری دادەنا. چۆن دەکرێت تیۆری زانستی هەڵە بێت و قسەی سەرۆك ڕاست بێت!! بەڵام ڕۆژنامەوانانی دەهۆڵژەن ئەوکات ئەمەیان وەك دەستکەوتێکی سەرۆك و بیرکرنەوەی سەرۆك لەقەڵەم دا.

دووەم: مامۆستا موئەیەد عەبدولقادر بەرپرسی سانسۆری کتێب لە وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن، پێی ڕاگەیاندم ئەوان ڕێنماییان پێگەیشتووە ناوی وەردی لەسەر هەموو کتێبەکان قەدەغە بکرێت، بە هەموو تێزە جیاوازەکانییەوە، هەر لە واعیزەکانی سوڵتان کە ناوەڕۆکەکەی لەگەڵ ئارەزووی بەعس دەگونجا، لە چاپ و فرۆشتن و دەستاودەستکردن قەدەغە کرا، تا کتێبی خەونەکان کە تاوتوێی بابەتی خەون دەکات لەگەڵ کتێبی کارە نائاساکانی نەست.

سێیەم: ڕێگری لە دکتۆر عەلی وەردی کرا سەفەر بکات. بەمەش هەلی سەفەرکردنی بۆ زانکۆی وارشۆ لەدەستچوو، کە مامۆستایەکی میوان بوو لە زانکۆکە. بەمشێوەیە مایەوە تا سەدام لە ساڵی ١٩٩١ دانی بە دروستی تیۆرەکەی وەردی نا. ئەو کات یاوەری خۆی کە ئەرشەد یاسین بوو ناردیە لای وەردی و داوای کتێبەکانی لێکرد، بۆئەوەی سەرۆك بیانخوێنێتەوە... دواتریش دێینە سەر وردەکاری ئەم بابەتە.

وەك دەردەکەوێ بەڕێوبەرایەتی ئەمنی عام، ئەم ماوەیە لێکۆڵینەوەکانی لەسەر وەردی چڕ کردۆتەوە و ئەوەی ئاشکرا کردووە کە وەردی سەر بە حزبی شیوعی عێراقییە! ئەمەش لەو بەڵگەیە هاتووە کە شێخ سەلیم جبووری بە منی داوە. بەڵگەکە لە

١٩٨٥/٤/١٠ دەرچووە، واتە دوو ساڵ دوای دیدارە ڕۆژنامەوانییەکە. ژمارەی نووسراوەکە ١٠٠ ی ئاستی گرنگ (مهم) نووسراوە. بەڵگەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە عەلی حوسێن موحسین وەردی لەدایکبووی ١٩١٣ بەغدا، چالاکوانی شیوعییە مامۆستای زانکۆی بەغدایە. لە کازمیە دادەنیشێ، خانووی ژمارە ١٨/٣، ژمارەی تۆمارەکەی لە ئەمن ٨٨- ٥١٤٧١٨ یە. مولازم حەمید ڕەشید باس لەوە دەکات کە وەردی سەر بە حزبی شیوعی بەکرێگیراوە، چالاکوانی ئەم حزبەیە. ئەمەش لە میانەی زانیاری ئیزبارەکەی دەرکەوتووە. پێشتریش ڕێگری سەفەری لێکراوە بۆ وڵاتانی عەرەبی، بە نووسراوی ٤٥-٣٦٥٧٤ لە ڕێکەوتی ١٩٧٠/٧/٧ ( ئەم بەڵگەیە لە پاشکۆدا هەیە).

وەك نەریتە پیاوانی ئەمن دەتوانن تۆمەتی نوێ بۆ هاووڵاتیان بدۆزنەوە، بۆیە حەمید ڕەشیدی ئەفسەر دەتوانێ تۆمەتی ئەندامێتی شیوعی بۆ دکتۆر وەردی بدۆزێتەوە، گوایە بەپێی ئیزبارەکەی یەکێکە لە چالاکوانانی شیوعی، کەچی ئەو کات زانرابوو کە بۆچوونەکانی وەردی پێچەوانەی ئاراستەکانی حزبی شیوعی عێراق بوو. تەنانەت ڕەخنەکانی وەردی بۆ فیکری مارکسی لە دووتوێی کتێبەکانی بڵاو کراوەتەوە. وەردی لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا خوێندوویەتی، کاتێ گەڕایەوە عێراق، بە سیاسەتی پراگماتی ئەمریکی کاریگەر بوو، کە ئەم سیاسەتەش بە ورد و درشتیەوە لە گەڵ بنەماکانی حزبی شیوعی جیاوازە. بەڵام ئەمە قەدەری هەموو بیرمەندانە لەگەڵ پیاوانی ئەمن! بەمشێوەیە پەردەیەکی ئاسنی

بەسەر وەردی دادرایەوە. ئەم ڕووداوە ساڵێك بەر لە دامەزراندنی مەجلیسی خاقانی بوو. لەبیرمە لە سەرەتای هاوینی ١٩٨٩ یاوەری وەردیم کرد بۆ باڵوێزخانەی پۆڵەندی کە لە ناوچەی مەسبەحی بەغدا بوو. لەلایەن کونسوڵی پۆڵەندی بە چاکترین شێوە پێشوازیمان لێکرا. مۆر لەسەر پەساپۆرتی عەلی وەردی درا کە لەدایکبووی ١٩١٣ بوو، ڤیزەی چوونە وارشۆی پێدرا. ئەمەش لەسەر بانگهێشتنامەیەك بوو کە لەلایەن زانکۆی وارشۆوە ئاڕاستەی وەردی کرابوو. لەگەڵ ئەوەشدا وەردی سەفەری نەکرد، چونکە ڕێگەی سەفەرکردنی لێ گیرابوو، ئەمەش کاردانەوەی ئەوەبوو بۆچوونی سەرۆك پێچەوانەی بۆچوونی وەردی بوو. من پێم وایە وەردی سزاکەی پەسەند کرد و پێی ڕازی بوو، چونکە کاتێك بە سزای کەسانی دیکەی بەراورد دەکرد، ئەوا سزاکەی خۆی وەك ڕێزلێنانێك دەبینی!

وەردی پێی وابوو مرۆڤ لە کۆمەڵگای عێراقی بەهای زیاتر دەبێت کاتێك حکومەت دژی بێت، بەتایبەتی لەنێو عەوامی خەڵکدا. بۆیە خوالێخۆشبوو هەمیشە بەسەرهاتی ئەو پیاوەی دەگێڕایەوە کە پێڵاوەکەی دەخستە ئەو ماڵانەی دزییان تێدا دەکرا. بۆئەوەی پۆلیس بانگی بکات و شکۆی لەناو خەڵك زیاتر بێت، کاتێك ئەفسەرەکە فەرامۆشی دەکرد، دەچوو پرسیاری دەکرد ئاخۆ بەڵگەیان لەسەر دزەکە دۆزیوەتەوە؟ تا گەیشتە ئەو ئاستەی ئەفسەرەکە ڕۆژێك وتی: بەڵێ پێڵاوی تۆمان دۆزیوەتەوە، بەڵام ئاسوودەت ناکەم، ناتخەمە زیندانەوە، تا بەهۆی منەوە بەناوبانگ بیت!!

وەردی و هەموو خەڵکی ڕۆژهەڵات پێیان وایە هەموو شتێکی

قەدەغەکراو، برەوی هەیە. بۆیە کاتێك خەڵك زانیان بۆچوونی سەدام لەبارەی وەردی چییە و دواتریش کتێبەکانی قەدەغە کرا، ئەوا بەدوای کتێبەکانی دەگەڕان و وەردی دڵخۆش بوو کاتێك دەیبیست خەڵك کتێبەکانی کۆپی دەکەنەوە و دەیفرۆشنەوە. بۆیە وەردی بەشێك لە خەونەکانی بەهۆی ڕقی سەدام بەدی هێنا. بەڵام خەونی گەورەی بەدی نەهاتووە کە بۆ منی درکاندووە، لە کۆتایی ئەم بەشە باسی دەکەم.

سەبارەت بەو نووسەرەی ئەم ڕووداوەی لەگەڵ ڕووداوی سەردانی یاوەری سەدام بۆ ماڵی وەردی تێکەڵ بەیەکتر کردووە، کە داوای کردووە، کتێبەکانی بۆ سەدام پێ بدات. گوایە ئەمە کاردانەوەی گفتوگۆی سەدام بووە لەگەڵ ڕۆژنامەنووسە ئەمریکییەکە. ئەمە تێکەڵکردنی ڕووداوەکانە، ساختەکردنی هەقیقەتەکانە! بە بەڵگەی قسەی نووسەرەکە:

" کاتێك یاوەری سەدام سڵاو لە وەردی دەکات، وەردی بەمشێوەیە وەڵامی دەداتەوە (لا سلام عليك، ولا رحمته ولا بركاته) کاتێك یاوەری سەدام دەپرسی بۆچی دکتۆر؟ وەردی وەڵامی دەداتەوە من نەخۆشم و تۆش ڕێگری سەفەرم لێ دەکەی تا چارەسەر وەربگرم"

بەسەرهاتەکە بەمشێوەیە لە یەکێك لە کتێبەکان هاتووە...تاد

" دوای مشتومڕێکی زۆر لە بەردەرگا. گەورە یاوەری سەرۆك وتی بۆ کتێبەکانت هاتووم، وەردی دەڵێ هیچ کتێبێکم لا نییە. کاتێك دەڵێ جەنابی سەرۆك کتێبەکانی تۆی دەوێ. وەردی دەڵێ کەواتە بۆ سەرۆك بێت خۆم دەبم بە کتێب هەموو کتێبەکانی پێ دەدا" بەپێی

ئەم قسانەی نووسەرەکە بێت دەتوانین ئەم ئەنجامانەی خوارەوە هەڵبهێنجین:

یەکەم: کاتێك کۆنترین و گەورەترین یاوەری سەدام دێتە ماڵەکەی وەردی، ئەو کاتە وەردی ڕێگای سەفەرکردنی لێ قەدەغەکرابوو. بە بەڵگەی ئەوەی وەڵامی یاوەرەکەی سەرۆك ناداتەوە و ئەویش بە وەردی دەڵێ" بۆ لا سلام، ئەی دکتۆر" وەردی وەڵامی دەداتەوە نەخۆشە و ئەویش ڕێگای سەفەری دەرەوەی لێگرتووە تا خۆی چارەسەر بکات.

دووەم: لە میانەی بەسەرهاتەکە وەها دەردەکەوێت ئەم یاوەرە بەڵێنی هەڵگرتنی قەدەغەکردنی سەفەری بە وەردی داوە، بەلام لە واقیعدا ئەمە بەدی نەهاتووە، ئەمەش وایکردووە وەردی وەڵامی سڵاوەکەی نەداتەوە، ئەمەش بە ڕوونی لە ڕستەکەی وەردی دیارە" تۆش ڕێگری سەفەرم لێ دەکەیت". نەیگوتووە تۆ واسیتەم بۆ بکە تا قەدەغەکردنی سەفەرەکەم هەڵگیرێت.

سێیەم: لە میانەی قسەکانەوە دەردەکەوێت، ئەم نووسەرە هەندێك بەسەرهاتی دیکەی وەردی تێکەڵ کردووە. بۆیە بێ سەروبەرییەك بە چیرۆکەکە دیارە. ئێمە مێژووی وەردی دەنووسینەوە، بۆیە دەبێت بەدیقەت بین، گوزارشتێك دەرکەوتووە گوایە دەوڵەت شکۆی بۆ وەردی داناوە، ئەمە قسەیەکی هەقە، بەلام دەوڵەتی عێراق وەردی خستۆتە خانەی کوژرانەوە، ئەمەش لە میانەی ئەو هەنگاوانەوە بوو: بە پۆستێکی فەخری خانەنشینی کرد و دواتر نازناوەکەی لێ سەندەوە، ڕێگری لە دەستاودەستکردنی نووسینەکانی کرد، ناوی

وەردی قەدەغە کرا، نەوەك کتێبێك لە کتێبەکانی، واتە هەموو کتێبە زانستییەکانیشی قەدەغە کرا، دواتر چاپکردنەوە و بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی قەدەغە کرا، ئەو کورسیە تایبەتەی لە زانکۆی بەغدا بۆی دانرابوو، لێی سەندرایەوە. چەندین جار هەڕەشەی لێکراوە، وەك سەلام شەماع باسی دەکات، یەکێك لە هەڕەشەکان لەلایەن ڕاگری یەکێك لە کۆلیژەکان بوو، هەڕەشەی ئەوەی لە وەردی کرد ئەگەر موحازەرەکەی نەوەستێنێ پەیوەندی بە پۆلیسەوە دەکات دەستگیری بکەن. دواتر ڕێگری لێ کرا، سەفەر بکات بۆئەوەی وەك مامۆستایەکی میوان لە زانکۆکانی دەرەوە کار بکات و لە کۆنگرە زانستییەکان ئامادە بێت. دواتر دەوڵەت وەك زانایەك فەرامۆشی کرد، بە شێوەیەك لە هیچ بۆنەیەکی زانستی و ئاهەنگێك وەك مامۆستا و مێژوونووس و نووسەرانی دیکە بانگهێشت نەدەکرا. ئینجا دەوڵەت لە سەروبەندی جەنگی نێوان عێراق و ئێران دەنگۆی ئەوەی بڵاوکردەوە گوایە وەردی ئێرانی و فارسە. لێرەدا ئێمە ئەو قسانەی مامۆستا سەلام شەماع دەگێڕینەوە کە لە کتێبەکەی هاتووە" خاوەنی کتێبی (الادب وما الیە) دەڵێ بە بڕوای من وەردی دەچێتەوە سەر ئەو جیلە تازەیەی کۆچبەرانی فارس کە هاتوونەتە عێراق. دکتۆر عەبدولئەمیر وەرد وەڵامی ئەم تۆمەتەی داوەتەوە و بەتەواوی پووچەڵی کردۆتەوە، ئەمەش لە پێشەکی کتێبەکەم هەیە لە چاپی دووەم و سێیەم دا" شەماع ڕووداوێکی دیکە دەگێڕێتەوە بۆئەوەی بیسەلمێنێ دانەپاڵی ڕەچەڵەکی فارسی بۆ وەردی لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە بە ئەنقەست بووە. سەلام شەماع دەڵێ" سەبارەت بەو

تۆمەتە من لەگەڵ وەردی ڕووداوێکی گرنگم بینیوە. لە کاتی جەنگی نێـوان عێـراق و ئێـران وەردی داوای لێکـردم یـاوەری بکـەم بـۆ بەڕێوەبەرایەتی پەساپۆرت، بۆئەوەی پەساپۆرتەکەی نوێ بکاتەوە. کاتێـك چـووینە لای ئەفسـەری بـەرپرس لـە پەسـاپۆرت کۆمـەڵێك ئافرەتی لەلا بوو، بۆیە ئەفسەرەکە ویستی سووکایەتی بە وەردی بکات. پەساپۆرتەکە بە دەستەوە دەگرێت و بەگاڵتەوە دەڵێ" ئێوەی بنەماڵەی وەردی ڕەچەڵەکتان چییە، ئایا تەبەعیەی ئێرانن بۆئەوەی تەسفیرتان بکەین؟ ئێوە خەڵکی کوێن؟". وەردیش بەهێمنی وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ" بەخوا ئێمە خـەڵکی حیجـازین، بـەڵام تێکـەوتین هاتینە عێراق!!".

هەسـتی بـە ترسـناکی ئـەم قسـەیە نـەکردووە، لەلایـەن ئەفسـەری پەساپۆرت لە سەروبەندی جەنگی عێراق و ئێران، کاتێك ڕەچـەڵەکی کەسێك دەگێڕێتەوە سەر دەوڵەتی دوژمن، کە لەگەڵ عێراق لە شـەڕ دایە! لە کۆتاییدا هیچ بەرپرسێکی حکومەت وەك ئەو کات لە عێراق نـەریت بـوو نەهاتـە پرسـەکەی وەردی. تەنانـەت لـە سـێیەم ڕۆژی پرسەکە مامۆستا مەحفووز ناچاری کردین تا یانزەی شەو چاوەڕوان بین، لە ترسی ئەوەی نـەوەك یـەکێك بـە نوێنەرایـەتی سـەرۆك بێتـە پرسە و کەسێك نەبێت پێشوازی بکات. ئەو کات نەریت بوو یەکێك لە یاوەرەکـانی سـەرۆك لـەبری سـەرۆك لـە پرسـەکان ئامـادە دەبـوو، سەرەخۆشی دەکرد. ئەو شەوە کاتێـك گەڕاینـەوە مـاڵ شـەقامەکان چۆڵ بوو، تەنها چوار کاتژمێر بۆ نوێژی بەیانی مابوو. ئەوەی مایەی گریان یان پێکەنینە، هەریەکـە لـە تـاریق عـەزیزی جێگـری سـەرۆك

وەزیران و حامد یوسف حەمادی وەزیری ڕۆشنبیری لە پرسەکە ئامادە بوون، کەچی هەردووکیان بەر لە خوێندنی سورەتی فاتیحە بۆ ئامادەبووانیان ڕوونکردەوە ئەوان تەنها نوێنەرایەتی خۆیان دەکەن، چونکە لە زانکۆ وەردی مامۆستایان بووە، بۆیە نوێنەرایەتی دەوڵەت و سەرۆکی دەوڵەت ناکەن.

تەنها بۆ ڕوونکردنەوە، مامۆستا مەحفووز لە یەکێك لە دیدارە ڕۆژنامەوانییەکان ئاماژەی بۆ ڕووداوێکی پێکەنیناوی وەردی کردووە، کە ئەویش ڕووداوی پەڕینەوەی وەردی بوو لەسەر پردی ئەئیمە لەنێوان کازمیە و ئەعزەمیەدا! مامۆستا ئەو کاتەی بیر نەماوە. چیرۆکەکە ئەوەیە کە وەردی دروستی کردبوو، مامۆستا سەلام شەماعیش لە ڕۆژنامەیەکی سەردەمی سەدام حوسێن بڵاوی کردبۆوە، پیاوانی هەواڵگریی سەربازی ڕێگری لە وەردی دەکەن لەلای ڕاستی پردەکە بپەڕێتەوە چونکە باڵەخانەی هەواڵگری لێ بووە، بۆیە دەبووایە ناچاربێت بچێتە لای چەپ کە ئەو ئۆتۆمبیلانەی بەخێرایی لەوبەر دەهاتن نەدەبینران. وەردی لە وتارێکدا دەڵێ" نوێژم دەخوێند و سوپاسی خوام دەکرد بۆ ئەو نیعمەتەی بە عێراقی داوە، کەچی دەنگێك بەئاگام دەهێنێتەوە و دەڵێ بپەڕەوە شۆستەی دووەم ناوەڕاستی پردەکە! دوای ئەوەی چیرۆکەکەی وەردی بڵاوکرایەوە و لەنێو خەڵك باسکرا، وەردی لە مەجلیس گوتی: لەسەر پردەکە دەڕۆیشتم بینیم ئۆتۆمبیلێك نزیك دەبێتەوە و خێرایی کەم دەکاتەوە، مارسیدسی ڕەش تەواو جام ڕەش، بەڕێوەبەری هەواڵگریی سەربازی جامەکەی کردەوە و وتی" دکتۆر نوێژ دەکەی؟". وتم" بەڵێ" وتی"

یەك بە خۆت و دە بە نوێژەكەت" ئینجا ڕۆیشت!! داوای لێبوردن دەكەم ناچار بووم ئەو بەسەرهاتە بگێڕمەوە، بۆئەوەی خوێنەر ئاگادار بێت گیانی نوكتەبازی و گاڵتەجاڕی لەلای وەردی بەمشێوەیە بووە. ئەمەش تەنها بۆ ڕوونكردنەوە بوو.

دەڵێم لەوانەیە وەردی لە یاداشتەكەی خۆیدا، دووهێندە بابەتی باسكردبێ، بەڵام ئەوەی من باسم كردووە، ئەوەیە بینیومە و لەگەڵی ژیاوم، بیست ساڵ ژیام وەردی پڕ بە چاو و بینابیم بوو، دوای بیست ساڵ چاوەڕوانیش ئەو بەسەرهاتانەش تەنها بۆ مێژوو و هەقیقەت دەگێڕمەوە.

عەلی وەردی وتی، عێراقییەكان دەبێت خۆیان بگۆڕن و عەقڵیان بگۆڕن، بەر لەوەی ڕیفۆرم لە كۆمەڵگاكەیان ئەنجام بدەن. لە میانەی ئەو وتەیەی وەردییەوە دەمەوێ داوایەك لە هەموو برا و هاوڕێ و هەموو ئەو مامۆستایانە بكەم كە لەبارەی وەردییان نووسیوە، بەتایبەتی لەبارەی تێزە سیاسی و بۆچوونە هزرییەكانییەوە. داوا دەكەم وەردی بە بیروڕای خۆتان دامەپۆشن، جلی خۆتان بەبەر ئەو نەپۆشن، باسی شتێك مەكەن نەیگوتووە. بەخوا من شاهێدی دەدەم هەندێك كەس هەندێك شتیان لەبارەی وەردی نووسیوە، ئەگەر خۆی لە گۆڕەكەی هەڵسێتەوە و بیخوێنێتەوە سەرسام دەبێت. ئەوان ڕەچاوی ئەوەیان نەكردووە كەسانێك هەبووە لەگەڵ وەردی ژیاوە و گوێبیستی وەردی بووە، بەڵكو تەنها ویستوویانە لاپەڕەیەك پڕكەنەوە و هەندێك هەڵوێستی سیاسی خۆیان لێرە و لەوێ ڕاست بكەنەوە. تەنانەت یەكێك لە سووریا بە یەكێك لەو پیاوە ئایینانە گەیشتووە كە

لە دەرەوەی عێراق دەژی، بۆ خۆ نزیککردنەوە ناوی شێخ و باوکی شێخی خستۆتە ناو ئەوکتێبەی کە باسی ژیانی وەردی دەکات، ئەمەش بۆ کوشکێشی بووە یان بۆ هەر هۆکارێك کە ئێمە نایزانین.

برای بەڕێزم، ئەو نووسەرەی کە دەتەوێ لەبارەی وەردی زانای کۆمەڵناسی عێراقی بنووسی، دەبێت خزمەتی کتێبەکەت بکەیت، کۆشش بکەیت و بگەڕێیت بەدیقەت بیت، بۆئەوەی بە ئەنجامێکی خوازراو بگەیەت بۆ خۆت وەك نووسەرێك، تا ڕێزی خوێنەرانت بەدەست بهێنی و کاردانەوەیەکی دروست لەبارەی وەردی بەجێبهێڵی کە مێژوو تۆماری دەکات. بۆئەوەی زیاتر لە بابەتەکە نزیك ببمەوە، داوام لەو مامۆستایە هەیە کە چیرۆکەکانی وەردی کۆدەکاتەوە و وەك کتێب بڵاویان دەکاتەوە، کە تا ئەمڕۆ لە پێنج کتێب زیاترە، هاوڕێیەکم لە وڵاتێکی دەرەوە پەیوەندی پێوەکردم و پرسیاری لە چیرۆکی یەکێك لەم کتێبانە کرد. کە دەڵێ ئافرەتێك لە ئەمریکا داوای لە وەردی کردووە سڵاو لە ژنەکەی دراوسێیان نەکات چونکە شەریف نییە، کاتێك وەردی پرسیاری هۆکارەکەی کردووە، ژنە ئەمریکییەکە وتوویەتی چونکە ئەم دراوسێیە کاتێك هێزەکانی ئەڵمانیا ئەمریکایان بۆردوومان دەکرد چراکەی نەدەکوژاندەوە! ئەو هاوڕێیەم بە سەرسامی پرسیار دەکات کەی فڕۆکەکانی ئەڵمانیا ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایان بۆردوومان کردووە؟ تا کارەبا بپچڕێ و مۆم داگیرسێنن. منیش داوای لێبوردنم کرد و وتم ئەم هاوڕێیەی وەردی مەبەستی بەریتانیایە، کە پایتەختەکەی لەندەنە، بەڵام لەبری ئەمە ئەمریکای نووسیوە! بەڵام پێم وایە بابەتەکە پەلەکردن بێت،

لەگەڵ بەدیقەت نەبوون. لە کۆتاییشدا دەڵێم وەردی شایەنی ئەوەیە تا بەدیقەتەوە لەبارەی بنووسین. ماڵئاوا.



## کۆتایی:

## سەد ساڵ لەگەڵ عەلی وەردی تەواو بوو

گەشتی سەد ساڵەی ژیانی زانای کۆمەڵناسی عەرەبی و عێراقی عەلی وەردی لەم چەند لاپەڕەیەدا تەواو بوو. لە چوار بەشدا کورتکرایەوە، وەك ئەوەی چوار وەرزەی ساڵێك بێت. پاییزەکەی بەشی یەکەم بوو کە تێیدا پۆرترێتێکم لەبارەی وەردی کێشا، هاوینە گەرمەکەی بەشی دووەم بوو، لەوێ وێنەی وەردیم بەو جۆرە گواستەوە کە ناسیومە، ئەمە وێنەیەك بوو یەکەمجارە خەڵك دەیبینێ. بەهارەکەی بەشی سێیەم بوو، کە تێیدا تاوتوێی هزری وەردی و کتێبەکانی کرا، لەگەڵ باسی ئەو زانایانەی وەردی بە خۆیان و میتۆدی توێژینەوەکانیان کاریگەر بووە، لەگەڵ مشتومڕەکانی وەردی لەگەڵ زانایان و کاریگەری وەردی بەسەر زانایانی ئێران. دواجاریش بەشی چوارەم بوو، کە زستانی ساڵەکە دەنوێنێ، لەوێ باسی وەردی و سیاسەتمان کرد بە هەموو وردەکارییەکانی ئەم بابەتەوە، لەوانەیە هەندێك مامۆستا و برادەر لەم بەشە پەست ببن، لەوانەشە بە دڵی کەسانی دیکە بێت، ئەمە کاتێك دەردەکەوێت کە کەسێك تاوتوێی ناوەڕۆکەکەی دەکات، بەڵام وێنەی سیاسەت لەلای وەردی کە لەم کتێبەدا هاتووە، زۆرتر نزیکە لە هەقیقەت.

لەم کتێبەدا لە نزیکەوە دکتۆر عەلی وەردیمان ناسی، پۆرتەریتی ئەومان کێشا، ناو و ڕەچەڵەکمان باسکرد، هەر لە کاتی لەدایکبوونیەوە لەگەڵی بووین تا گەیشتینە قۆناغەکانی منداڵی و گەنجێتی و قوتابخانە و خوێندن و مامۆستایەتی، هەر لە بەیرووتەوە لەگەڵی بووین کە خوێندنی زانکۆی لەوێ بووە، تا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە لەوێ ماستەر و دکتۆرای بەدەستهێناوە. لەم ماوەیەش چەندین بابەتی کۆمەڵایەتی هاتۆتە سەر ڕێی وەك هاوسەرگیرییەکەی، بابەتی سیاسی هەبووە، وەك ئەوەی دونیایەکی نوێ لەبەردەم وەردی والا بووە، کاتێك سواری فڕۆکەی جامبۆ دەبێت. دواتریش باسی گەڕانەوەی وەردیمان کرد بۆ عێراق، لەگەڵ دامەزراندنی بەشی کۆمەڵناسی و خانەنشینی و بەردەوامبوونی لە چالاکی زانستی تا گواستنەوەی چالاکییەکانی بۆ مەجلیسەکان و دامەزراندنی مەجلیسی خاقانی لە بەغدا. ئینجا باسکردنی مردن و ناشتنی. ئەمانە گرنگترین وێستگەکانی ژیانی وەردی بوون. ئەو وێستگانەی دەرفەتی نەبوو بیاننووسێتەوە، یاخود نووسیەوە بەڵام ونبوو. کاتێکیش ئەو بۆ ئێمەی باسکردووە و ئێمەش ڕووداوەکانمان بینیوە، ئەوا ئەرکە لەسەرمان بیانووسینەوە و بۆ نەوەی داهاتووی بگێڕینەوە، چونکە ئێمە نەوەیەکین لە نزیکەوە خواڵێخۆشبوو وەردیمان ناسی، کەچی نەوەکانی دیکە لەم سوود و چێژە بێبەش بوون. ئەم کتێبە چاوپێداخشانێك بوو بە ژیانی وەردی وەك سینەمای بەغدا و وتە مێژووییە بەناوبانگەکەی کە دەیگوت"دەتخەمە

مێژووەوە". کلاوڕۆژنەیەك ڕووناکیمان خستە سەر چەندین لایەنی ژیانی وەردی، کە خۆشی باسی نەدەکرد. ئەمەش وێنەیەکی نەناسراو بوو وەك بابەتی وەردی وەك ئیسلامییەك، وەردی وەك عرووبییەك. ئەم کتێبە چەندین بۆچوونی وەردی لەبارەی کۆمەڵگاوە پوخت کردۆتەوە، کە لەوانەیە هەندێکیان بۆ کۆمەڵگا سەرسامکەر بن، لەوانە داوای دەکرد قەحپەخانەی بەغدا لە سەردەمی مەلەکی دانەخرێت، یاخود چۆن بە چاویلکەیەکی تایبەت سەیری کۆمەڵگای دەکرد و چۆن بەراوردکاریی دەکرد. من لەم کتێبەدا یاوەریی بووم کە چۆن لەگەڵ شەنفەڕای شاعیر بە شەقامی موتەنەبی تێپەڕین، دواتر کاتێك لە شەقامی راس حۆش تێپەڕ دەبوو دەگەیشتە مەرقەدی کازمیە نوێژی دەکرد. جا لە کڵێسای ئەرمەنی ئەرسۆدۆکس دەدرەوشایەوە و بۆ ئەڵقەی زیکری تەکیەی کەسنەزانی دەچوو. ئینجا هونەری سیاسی لە وەزارەتی نەوت بەکاردەهێنا، چۆن دەوڵەتی قەتەر ڕێگری لە کۆڕەکەی دەکات، باسی ئەوەشم بۆ خوێنەران کرد کە چۆن ترس دایگرتم کە کۆڕی لە ئەمانەی بەغدا هەبوو، لەگەڵ ئاگادارکردنەوەی هاوڕێیان کە نابێت لەبەردەم وەردی زێدەڕۆیی سیاسی بکەن. ئینجا باسکردنی سێ پرسەی بەرپرسان، یان نارەزایی وەردی لەبارەی فەتوایەکی ئیمام خومەینی لەسەر موڵکداریی هزری. باسی زاراوە تایبەتەکانی وەردیم کرد، کاتێك لە جەژنی لەدایکبوونی هەشتا ساڵەی وتی سوپاسی ستایشکەران دەکەم، مەبەستی چی بوو، چۆن سەیری تێکەڵە مەزهەب دەکات

کاتێك سەما و ژن و خواردنەوەی شەڕاب حەلاڵ دەکات، دواجایش بۆ یادگاری باسی هەندێك گاڵتە و گەپی وەردیم کردووە.

لەم کتێبەدا هەوڵم داوە تاوتوێی هزری وەردی بکەم، باسی پوختەی کتێبەکانم کردووە هەر لە ساڵی ١٩٥١ ەوە تا ساڵی ١٩٧٩ . دواتر باسی ئەو کەسایەتی و زانایانەم کردووە کە بەر لە وەرگرتنی پسپۆڕی، وەردی پێیان سەرسام بووە، لەوانە: هەبەتودینی شەهرستانی، دکتۆر مستەفا جەواد، موحسین ئەمین عاملی، مەلیك فەیسەڵی یەکەم، سەلامە موسا. ئینجا باسی ئەو زانایانەم کردووە کە لە ڕووی فیکرییەوە پێیان کاریگەر بووە: ئیبن خەلدون، ولیام سیمنەر، ئارنۆلد تۆینبی، دیل کارنگی. لەگەڵ ئەو زانایانەی لە ڕووی توێژینەوەی سیاسی و کۆمەلایەتی پێیان کاریگەر بووە: ستیوارت میل، میکیاڤیللی. لەگەڵ هەموو ئەمانەش باسێکی کورتی میتۆدمان کردووە، لەگەڵ باسکردنی میکانیزم و ڕێبازەکانی توێژینەوە لەلای وەردی، ئینجا باسکردنی ئەو زانایانەی کە وەردی لە میتۆدی لێکۆڵینەوە پێیان سەرسام بوو: تالکۆت بارسۆنز، ئەمیل دۆرکهایم، کارڵ مانهایم. هەر لە میانەی کتێبەکانی باسی ئەوەمان کردووە کە چۆن بەڕاشکاوی لەگەڵ فەلسەفەی ماتریالیزمی مارکسی نەبووە. دواتر باسی کاریگەری وەردیمان کردووە بەسەر کۆمەڵگاکانی دەوروبەر، لەوانە ئێرانمان هەڵبژارد، کە کاریگەری بەسەر شێخ مورتەزای موتەهەری و دکتۆر عەلی شەریعەتی هەبووە. باسی ئەو

مشتومڕانەمان کرد کە لە مەجلیسی خاقانی عەلی وەردی لەگەڵ چەندین زانای ئەنجام داوە، لەوانە لەگەڵ حوسێن عەلی مەحفووز و شێخ عیسای خاقانی و شێخ عەلی تەهرانی، مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنی، عەبدوڵڵا فازڵ کە لە کۆندا وەزیری ئەوقافی عێراقی بوو. ئینجا بۆ ئەوەی بەشی لایەنی زانستی وەردی تەواو بێت لیستێك لەو سەرچاوە بیانیانەمان باسکردووە کە پشتیان بە تیۆرەکانی وەردی بەستووە.

دواجار باسی بۆچوونەکانی وەردیم کردووە لەبارەی سیاسەتەوە، لە کۆندا چۆن سەیری ناکۆکی نێوان عەلی و معاویەی دەکرد و بە ناکۆکی و جیاوازی ڕێبازەکانی دەزانی، لە ئێستادا سیاسەت هونەری ئەگەرەکان بوو، کە دەبێت پشت بە پراگماتیزم ببەستێ تەنانەت ئەگەر کۆمەڵگاشی لەگەڵ نەبێت بەڵام دەبێت لە جێبەجێکردنی ڕێبازەکە ڕاستگۆ بێت. پێی وابوو چارەسەری هەمیشیی بریتییە لە دیموکراسی و هاووڵاتیبوون و دەسەڵاتی یاسا. هەروەها بۆ خوێنەری بەڕێز باسی بۆچوونی وەردیم کردووە لەبارەی دەسەڵاتدارانی عێراق، ئەمە جگە لە بۆچوونی وەردی لەبارەی سەدام حوسێنەوە، کە من و ئەو بەیەکەوە لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەو ژیاوین. وەردی سەرسام بوو بە فەیسەڵی یەکەم، بەڵام پێی وابوو مەلیك غازی لە سیاسەت نازانێ و عەبدولئیلاهیش تەختی بنەماڵەی پاشایەتی لە عێراق خست، بە مەلیك فەیسەڵی دووەمیشەوە. کەچی لە سەردەمی

کۆماری وەردی بە ڕوونی دەیگوت عەبدولکەریم قاسم ڕێبەرێکی میللییە بەڵام بەکەڵکی ئەوە نایەت سەرۆکی عێراق بێت. هەروەها پێی وابوو عەبدولسەلام عارف یەکەم کەس بوو کە عێراقی لە ڕووی تایفییەوە هەڵوەشاندەوە. ماوەی حوکمڕانی عەبدولرەحمان عارفیش دەرفەتێك بوو بۆ ئازادی بەڵام هەلی بۆ نەڕەخسا. وەردی پێی وابوو ئەحمەد حەسەن بەکر دەسەڵاتی هۆزی لە عێراق جێگیر کرد. کەچی سەدام دەسەڵاتی گوندی لە عێراق چەسپاند. دواتر باسی ئەوەم کردووە سەدام حوسێن لە دیمانەی ژنە ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکی لەگەڵ بۆچوونی وەردی نەبووە. دواتریش ئەو زیانانەی بەر وەردی کەوتووە لە دوای دیمانەکەدا، سەدام وتوویەتی وەردیم خۆشناوێ، وەردیش لە کۆڕێکدا کە ئەمینی بەغدا تۆماری کردووە بۆ ئەوەی سەدام گوێی بۆ بگرێت وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ" تۆ ئەگەر لە سیاسەت نازانی وازی لێ بهێنە و بڕۆ... کتێبەکەش بە کۆمەڵێك بڕوانامەی زانکۆیی و بەرگی تێزەکانی کۆتایی دێت، لەگەڵ کۆمەڵێك وێنەی دەگمەنی وەردی کە پێشتر بڵاو نەکراوەتەوە، سەرەڕای ئەمانەش هەندێك بەڵگەی ئەمنی عام کە لەلایەن شێخ سەلیم جبووری لە مانگی حەوتی ساڵی ٢٠١٣ دەستم کەوتووە.

خوێنەرانی ئازیز، لە کۆتایی ئەم کتێبەدا کە هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ دکتۆر وەردی ڕۆیشتووە. هەوڵم داوە گرنگترین وێستگەکانی ژیانی وەردی هەڵبژێرم. بە باسکردنی بەسەرهاتی

ڕاستەقینە، هەندێك هەڵەم ڕاست كردۆتەوە كە لەبارەی وەردی بڵاوكراوەتەوە. دەبێت ئیعتراف بەوە بكەم، من لەگەڵ هەموو بۆچوونەكانی وەردی نیم كە لەم كتێبەدا هاتووە، بەڵام هەقیقەتی مێژوویی دەخوازێ ڕاستگۆیانە قسەكانی وەردی بگوازمەوە. ئەوەی ڕوویداوە بەپێی تێڕوانینی وەردی بووە، نەوەك تێڕوانینی من. بەمەش دەمەوێ ڕێبازێكی زانستی بخەمە بەردەم خوێنەری ئازیز كە لە ڕۆژئاوادا ناسراوە، ئەویش نووسینی بێلایەنیانەیە. بە پێچەوانەی كتێبەكانی ڕۆژهەڵات كە بە لایەنگیرییەوە دەنووسرێن. نووسینی بێلایەنانەش ڕێبازی هزری وەردی بوو. منیش بە منداڵی و بە گەنجێتی لەسەر دەستی زانا و شێخ عیسای خاقانی باوكم و مامۆستا حوسێن عەلی مەحفووز، فێری ئەوە بووم، وەفاداری ئەوەیە شتەكان بە ئەمانەتەوە بگوازمەوە. داواشم لە مامۆستایانی دیكە ئەوەیە بۆ مێژوو بە نووسینەكانیاندا بچنەوە هەرچەندە پێچەوانەی باوەڕی سیاسی و ئایینیشیان بێت. دڵنیاشم ئەوان هێشتا دەنووسن.

دواجاریش سوپاس بۆ خودای گەورە

محەمەد عیسا خاقانی

لەندەن

## پێرست



## بەشی یەکەم

## بەشی دووەم

## بەشی سێیەم



## بەشی چوارەم

